

# داڕمانی ژیاری ئیسلامی و دووباره سازدانەوەی

## ڕەگ و ڕیشە کەلتووریی و پەروەردەییەکان

د. عەبدولحەمید ئەبو سلێمان
و. حەکیم ئەبوبەکر

لە بلاوکراوەکانی
سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی (٦٢)

داڕمانی ژیاری ئیسلامی

د. عەبدولحەمید ئەبو سلێمان

ئەم کتێبە لەخۆوە بەدڵدا نەهاتووە و بێ بیرکردنەوە و تێفکرین نووسرابێت، بەڵکو ئەنجامی بڕێکی زۆر ئەزموون و توێژینەوەیە، لەپاڵ کتێبی (قەیرانی عەقڵی موسوڵمان)دا، هەوڵێکە بۆ تێگەیشتن لەو هۆکارانەی کە تاوەکو ئەمڕۆ ڕێگربوون لە سەرکەوتنی پڕۆژەی چاکسازی و ژیاری ئیسلامی و هێنانە ئارای گۆڕانکاریی پێویست لە ئوممەتەکەماندا.

ئەم توێژینەوەیە ڕوونیدەکاتەوە، کە هێشتا ڕەهەندێکی نا ئامادە لە پڕۆژەی چاکسازیی (ڕیفۆرمی) ئیسلامییدا بوونی هەیە، کە ناکرێت پڕۆژەی ژیاریی –بەبێ ئەو ڕەهەندە– ئەو گۆڕانکارییە خوازراوە بهێنێتەدی. ئەم کتێبە، هەوڵێکە بۆ تێگەیشتن لە غیابی لایەنی دەروونی ویژدانی لە گوتاری پەروەردەیی ئیسلامیی لە منداڵدا، تا ئەم تێگەیشتنە ببێتە بناغەیەک بۆ ڕیشەدارکردنی وزەکانی دەستپێشخەری و داهێنان لە بونیادی دەروونی و ویژدانییدا



نرخ: (٥٠٠٠ دینار)

# دارمانی ژیاری ئیسلامیی و دووباره سازدانەوەی

## ڕەگ و ڕیشە کەلتووریی و پەروەردەییەکان

د. عەبدولحەمید ئەبو سلێمان

و. حەکیم ئەبوبەکر

# دارمانی ژیاری ئیسلامیی و دووباره سازدانەوەی
## ڕەگ و ڕیشە کەلتووریی و پەروەردەییەکان


لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری زەهاوی
بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی ژمارە ( ٦٢ )

- وەرگێڕانی: حەکیم ئەبوبەکر
- بابەت: لێکۆڵینەوە
- دیزاین: ڕەوشت محەمەد
- چاپ: یەکەم. ٢٠١٨. ناوەندی ڕێنوێن

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە ( ٢٩٤ )ی ساڵی ٢٠١٨ی پێدراوە.



سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
www.zahawi.org
ناونیشان: شەقامی سالم
تەلاری جەمالی حاجی عەلی نزیک پردی خەسرەوخاڵ
07702422171

# ناوەرۆك

# پێشەکی

ئەم کتێبە لەخۆوە بەدڵدا نەهاتووە و بێ بیرکردنەوە و تێفکرین نووسرابێت، بەڵکو ئـەنجامی بڕێکـی زۆر ئـەزموون و توێژینەوەیـە، لـەپاڵ کتـێبی (قـەیرانی عـەقڵی موسوڵمان)دا، هەوڵێکە بۆ تێگەیشتن لەو هۆکارانەی کە تاوەکو ئـەمڕۆ ڕێگربـوون لـە سەرکەوتنی پڕۆژەی چاکسازی و ژیاری ئیسلامی و هێنانە ئارای گۆڕانکاریی پێویست لە ئوممەتەکەماندا، سەرەڕای تێپەڕبوونی زیاتر لە نۆ سەدە بەسەر هاوارەکـەی ئـەبو حامیدی غەزالییدا لە (تهافت الفلاسفة) و (إحياء علوم الـدين)دا، وێـڕای گـوزەرکردنی پـتر لـە سـەدەیەك بەسـەر دیـدی (کـەواکبی)دا سـەبارەت بـە بـەرزیی بنـەماکانی (پرنسیپەکانی) ئیسلام و مەبەست و ئامـانج و بـەهاکانی لـە کتێبـە ناودارەکەیـدا (أم القـرى)، هـەروەها هـاواری تۆمـەتبارکردن و تووڕەبـوونی لەسـەر (أصـل الـداء وأُسِّ البلاء)دا، لە بەناوبانگترین کتێبیدا (طبائع الإستبداد) کەچی تاوەکو ئەمڕۆ نە خەونێك هاتووەتەدی و نە ستەمێك ڕەویوەتەوە.

ئەم توێژینەوەیە ڕوونیدەکاتەوە، کـە هێشـتا ڕەهەنـدێکی نـا ئامـادە لـە پـڕۆژەی چاکسازیی (ڕیفۆرمی) ئیسلامییدا بوونی هەیە، کە ناکرێت پڕۆژەی ژیاریی –بەبێ ئەو ڕەهەنـدە– ئـەو گۆڕانکارییـە خـوازراوە بهێنێتـەدی، کـە وزەی ئوممـەتی ئیسـلامیی دەتەقێنێتـەوە و توانـا شـاراوەکانی وزە ویژدانییەکـەی تێـدا دەخاتەگـەڕ، ئـەم ڕەهەنـدەش بریتییـە لـەو منداڵـەی، کـەخۆی لـە تۆوەکـەدا دەنوێنێـت کـە جـۆری درەختەکە و تامی بەرەکەی دیاری دەکات.

ئەم کتێبە، هەوڵێکە بۆ تێگەیشتن لە غیابی لایەنی دەروونی ویـژدانی لـە گوتـاری پــەروەردەیی ئیســلامیی لــە منداڵــدا، تــا ئــەم تێگەیشــتنە ببێتــە بناغەیــەك بــۆ ڕیشەدارکردنی وزەکانی دەستپێشخەری و داهێنان لە بونیادی دەروونی و ویژدانییـدا، لە هەمان کاتدا هەوڵێکە بۆ ئاشنابوون بەو ڕەهەندە ڕوونـاکبیریی و فیکرییانـەی ئـەم شێواندن و غیابەیان دروستکردووە، هەروەها بۆ زانینی ئەو چەمك و سەرچاوانەی کـە توانای نەهێشـتنی ئـەم کەموکووڕییـە دەبەخشـنە موسـوڵمانان. گەڕاندنـەوەی ئـەم فاکتەرە کارێکی پێویستە لە پرۆسەی گۆڕینی کۆمەڵایەتی و ژیارییدا، لەسـەر ڕێگـای گێڕانەوەی یەکێتی لەنێوان لایەنی مـەعریفی و سـایکۆلۆژیی و ویـژدانیی لـە بونیـادی دەروونییانەی منداڵدا، هەروەها بەهێزکردنی توانا و وزەکانی دەستپێشخەری و گیانی زانستییانە و ئافراندن لە بناغەی سروشتی منـداڵێتیی مرۆڤـی موسـوڵمان و پێکهاتـە دەروونی و ویژدانییەکەیدا.

بــۆ هێنانــەدی ئــەم ئامانجــە، کتێبەکــە ئــامرازە میتــۆدیی و ڕووناکبیرییــە پێویسـتییەکانی چاکسـازیی پـەروەردەیی ڕووندەکاتـەوە، گـرنگترین بنـەماکانی ئـەم چاکسازییە و سەرچاوەکانیشی ئاشکرا دەکات و سەرنج بەلای دەزگای خێزان و ڕۆڵـە میحوەرییـە خۆڕسـکییەکەیدا ڕادەکێشـێت لـە هێنانـەدی چاکسـازیی پـەروەردەیی و گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی و ژیارییدا، کە خێزان بکاتە (سـیناء)[١]ی ئـەم سـەردەمە، بـەو مەرجەی بیریـاران و پەروەرشـیاران و دەزگـا پەروەردەییـەکانی دیکـەی کۆمـەڵگا بـە ڕۆڵی خۆیان هەڵبستن، لە هۆشیارکردنەوە و پشتگیریکردنیان بە ئەدەبیاتی پێویست، دەستپێشــخەرییش بــۆ چەســپاندنی بنــەماکانی گۆڕانکــاریی بخەنــە بەردەســتی موسوڵمانان و ڕۆڵەکانی لە پیاوان و ژنان، بە رووکردنە ئەوەی دایك و بـاوك لەسـەری خولقاون، لە پاڵنەرە خۆڕسکەکانی باوکایەتی و دایکایەتی، کە بـۆ هێنانـەدی خێـر و

[١]– ئاماژەیە بۆ ڕۆڵی لایـەنی پـەروەردەیی لـە پـەروەردەکردن و ئامادەکردنـەوەی بـەنی ئیسـرائیل لەسـەر دەستی موسای پێغەمبەر (سلاوی خوای لێ بێت)، لەسەرگەردانیی (سیناء)دا، وەك ئەوەی قورئـانی پـیرۆز باسی کردووە.

چـاکه بـۆ ڕۆڵـەکانی و بەرژەوەنـدیی ڕۆحـی و مـاددیی بونیـادنراون، کـە بناغـەی بونیادنانی ئوممەتێکی بەتوانای سەرفرازی ڕێزدارە.

پێویستە مامەڵەی جددی لەگەڵ سێ قەیرانەکەدا بکرێت؛ قەیرانی عەقڵ و میتۆد، قەیرانی فیکر و فەرهەنگ، قەیرانی ویژدان و پـەروەردە، بـەبێ ئـەوە هـیچ ڕێگایـەکی دیکەش نییە بۆ هێنانەدیی توانای ئوممەت؛ بۆ خستنەگەڕی وزەکانی و نوێکردنەوەی بونیادەکەی و گەیشتن بە ئامانجە بالاکانی، لەسـەر بناغەیـەك لـە هاوسـەنگیی نێـوان سیاسـی و فیکـری و پـەروەردەیی لـە هەوڵـەکانی بزوتنـەوەکانی چاکسـازییدا، بـە ئامانجی دەستخستنی توانا و ئـازادکردنی سـایکۆلۆژیای موسـوڵمان و خسـتنەگەڕی ویژدانی.

بەرپرسانی ئەم کارە بیریاران و پەروەردەکارانن، گرنگترین کلیلێکیش بۆ جووڵەی گۆڕینی ئاشتییانەی ویژدانی؛ بریتییە لە پاڵنەری خۆڕسـك لـە دڵـی دایکـان و باوکـان لەسووربوونی خۆوەکییان کەبگۆڕێت بۆ هێنانەدی ئەوەی بەرژەوەنـدیی ڕۆڵـەکانیانی تێدایـە، ئـەو ڕۆڵانـەی کـە کەرەسـتەی سـبەینێ و پێکهێنـەرێکی کۆمـەڵگا و نـەوەی ئایندەن.

ئومێدەوارم ئەم کتێبـە دەرگـای گفتوگۆیـەکی جـددی بونیادنەرانـە بکاتـەوە، کـە گیانی دڵسۆزی و ئازایەتی لەخۆ گرتبێت، بەبێ هیچ ترسـێك لـە نـەفامی نەزانـەکان و موزایـەدەی خـاوەن مەبەسـتە گـلاو و نەخۆشـەکان، هـەروەها دەبێـت لـە قـووڵایی قـەوارەی فیکـری و فەرهـەنگی و پـەروەردەیی ئوممـەتی ئیسـلامیی بڕوانرێـت، تـا بیریارانی ئوممەت و ئاقڵمەندەکانی ئاشنای نهێنییەکانی نەخۆشییەکەی بـن و چـاوی ڕۆڵـــەکانیان و ســـەرکردەکانیان لـــە بەرامبـــەر حەقیقـــەتی دەردەکـــانی دڵان و شـێواوییەکانی فیکـر و لادانـە پڕاکتیکییـەکان بکەنـەوە، وێنـەی سـیمای میتـۆدێکی دروستی زانستیی فیکریی پەروەردەیی بکێشن؛ کە توانا و دەستپێشـخەریی دەخاتـە دەسـتی ڕۆڵـە و بیریـار و ڕوونـاکبیرانی و بیانخاتـە سـەر ڕێگـەی پشتبەسـتن بـە

پەنهانەکانی وزەی فیترەت و بەخشش و قوربانیدان لە دەروونیاندا؛ وەك بناغەیەك بۆ دەستپێکردنیان.

ئەوە پەیامی ئەم کتێبەیە، ئەوەش ئامانجی باڵایەتی، لە سۆنگەی ئەو کێشە و تێڕامانەوە کە تێیدا خراونەتەڕوو بەهیوای ئەوەی گەر بە برێکی زۆر کەمیش بێت بەشداریی بکات لە بەڕێوبردنی گفتوگۆ و کاملکردنی ئامرازەکانی سەرکەوتنی پڕۆژەی چاکسازیی ژیاری ئیسلامیی، کە چاوەڕوانیکردنی زۆری خایاند. بێگومان لەگەڵ ستەمەکانی عەولەمەی ماددی و لە خۆباییبوونیدا، پێویستی جیهانییانەی مرۆییانەش پێی گەلێك زۆر بووە.

لە خوا دەخوازم موسوڵمانان سەرکەوتوو بکات و بیریاران و چالاکوانانیش راوەستاو بکات پشتیوانیان بێت و ڕێنمایی ئێمە و ئەوانیش بۆ ڕێگە ڕاستەکەی خۆی بکات، پشتمان بەو بەست و بۆ لای ئەویش گەڕاینەوە، چارەنووسیش هەر بۆ لای ئەوە.

سەرەنجامیش بۆ پارێزکارانە و سوپاس بۆ خودای پەروەرگاری جیهانیان.

**یەکەم:کێشەکە و پاڵنەرەکانی ئەم توێژینەوەیە:**

کێشەی (بابەت)ی ئەم کتێبە، بریتییە لە زانینی هۆکارەکانی داڕمانی بارودۆخی موسوڵمانان و کەموکووڕیی لە جێبەجێکردندا، لەوێشەوە ئاشنابوون بەو ڕێگایانەی زەمینە خۆشکەرن بۆ هەستانەوەی هیممەتی و گەڕاندنەوەی تواناکانی و گەڕان –لە ڕوانگەی بەتەوەربوونی منداڵێتییەوە– بە دوای سەرکەوتنی پرۆژەی چاکسازییدا. بەوپێیەی فەرامۆشکردنی ڕۆڵی منداڵێتی و تێنەگەیشتن لێی، لە گرنگترین هۆکارەکانی قەیرانی موسوڵمانن، لەگەڵ کەمتەرخەی لە ئەنجامداندا و دەستەوەستانی لە خستنەگەڕی وزە شاراوەکانی. توێژینەوەکە دیاردەی فەرامۆشکردنی قۆناغی منداڵیی لە پرۆژەی چاکسازییدا بۆ دوو بابەت دەگەڕێنێتەوە:

بابەتی یەکەم: بریتییە لەو کەموکووڕییەی کە تووشی بەرنامەی فیکری ئیسلامیی بووە، ڕەهەندی مەعریفیی گشتگیری شیکاریی پەیوەست بە زانینی (یاسا خوداییەکان: السنن الإلهية)ی[1] لە سروشتە سایکۆلۆژیی و گەردوونییەکان وەلا نراوە، هەروەها لە کارلێکی تەواوی فاکتەرە ئاوێتەکراوە ئاسۆی و ستوونییەکانیشی لەڕووی کات و شوێنەوە.

ئەو سوننەتە خوداییانە (یاسا سروشتییانە)ش ئەوانەن کە ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) ئاماژەیان پێ دەکات: ((فخياركم في الجاهلية خياركم في الإسلام إذا فقهوا))[2]، واتە: ((باشترینتان لە سەردەمی نەزانییدا، باشترینتانە لە ئیسلامدا بەو مەرجەی لە ئیسلام تێبگەن)). بەو مانایەی پەروەردە و پێگەیاندن خاوەنی بنەماگەلێکی دەروونین، کە بریتین لە سوننەت و یاساگەلێکی ئیلاهی، ڕێگاکانی مامەڵەکردنیش لەگەڵیاندا جۆرێتیی بونیادی دەروونیی تاك دیاری

[1]– مەبەست لە (السنن الإلهية) لە سروشت و پێکهاتەی زیندەوەر و بێگیانەکاندا، ئەوەیە کە لە فیکری ماتریالییانەی خۆرئاواییدا بە (یاسا سروشتییەکان) ناوزەند دەکرێت.

[2]– البخاري، محمد بن اسماعيل، صحيح البخاري، تحقيق: مصطفى ديب البغا، بيروت، دار ابن كثير، ١٤٠٧هـ، ١٩٨٧م، ج٣، ص٣١٩٤، فەرموودەی ژمارە ٣١٣٢.

دەكات و كانزا و وزەكانی پێكدەهێنێت، لە وێنەی ئازایەتی و ترسنۆكی و ئەمانەت و خیانەت... و ئەوانە، ئەم وزانەش ڕامكردنیان لە ڕووی كۆمەڵایەتییەوە –بەم یان بەو ئاڕاستەیەیاندا– بەگوێرەی ڕوانینە گەردوونییە كۆمەڵایەتییەكەی هەر ئوممەت و كۆمەڵگایەك بە ئاكام دەگات. بۆ نموونە سەربازی سوپا و چەتە، بۆ هەردووكیان پێویستە دڵسۆزیی و ئازایەتییان تێدا هەبێت؛ تاوەكو لە ڕۆڵی خۆیاندا سەركەوتووبن، بەڵام سەربازەكە لەپێناو بەرگریكردن لە ئوممەت كار دەكات و چەتەكەش بۆ زیانگەیاندن بە خەڵكی.

هەروەها یەكێكی تر لە دەرئەنجامی كەموكووڕیی و كەمتەرخەمیی لە میتۆدی بیركردنەوەدا، لاوازی هۆشیارییە لەبارەی بایەخی لێكۆڵینەوەی زانستی تیۆری و ئەزموونكارانەی پێكهاتنی دەروونییانەی مرۆڤ و ڕۆڵی قۆناغی منداڵیی تێیدا و جۆری گوتاری دەروونییانەی پەروەردەیی گونجاو بۆ هەر یەكێك لە قۆناغەكانی ئەو منداڵێتییە و كاریگەری لە پێكهێنانی بونیادی سایكۆلۆژییانەی تاكی موسوڵمان، ئەمەش پاڵنەرە ویژدانییە دەروونییە پێویستەكانی بۆ دەستەبەر دەكات؛ تا نەوەی تازەپێگەیشتوو ببێتە ئامرازێكی كارا لە چاكسازی و گۆڕانكاری و ڕاستكردنەوەی دیدی گشتییانەی گەردوونیی كۆمەڵایەتی و لابردنی ئەو لادانانەی لێوەی دەكەونەوە و گێڕاندنەوەی توانا بۆ وردەكاریی لە ئەنجامدانیدا و ڕووبەڕووبوونەوەی تەحەددییەكان بەشێوەیەكی كارای ئەرێنی.

بابەتی دووەمیش: بریتییە لە نائامادەگیی دواندنی دەروونیی زانستییانەی دروستی پەروەردەیی؛ كە بۆ بونیادنانی سایكۆلۆژیای منداڵی موسوڵمان پێویستە، ئەمەش وایلێكردووە وەك مرۆڤێك گەشە بكات كە بێبەش بێت لە پاڵنەری ڕەهەندە ویژدانییە كارا و پێویستییەكەی بزواندنی وزە و لە خستنەگەڕی هەوڵ و دەستەبەركردنی ئەدای ئەرێنی كە بەمەرجێكی پێویست بۆ دەستخستنی توانا لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو تەحەددایانەی ڕووبەڕووی ئوممەت دەبنەوە، بە سەركەوتوویی و كارایییەوە هەژمار دەكرێت.

هـــەروەها گوتـــارێکی دروســـتی دەروونـــی و زانســـتی و پـــەروەردەییش بـــۆ ڕاســـتکردنەوەی ئـــەو لادانانـــەی لـــە خـــود و کۆمەڵگاشـــدا هـــەن پێویســـتە، ئەمـــە کەموکوورییەکە لە میتـۆدی فیکرییـدا، بـەم پێیـەش، ئـەم غیابەیـە دەستەوەسـتانی مرۆڤی موسوڵمان و ئوممەتی موسوڵمان –تا ئەمڕۆکە– لەبارەی بەدەمـەوە هـاتنی خواسـتەکانی پـڕۆژەی چاکسـازیی ژیـاریی ئیسـلامی و ڕاسـتکردنەوەی لادانـەکان و دانـەپاڵ یـەکی ڕیزەکـان و وردەکـارییکردن لـە ئەنجامدانـدا ڕاڤـە دەکـات، سـەرەڕای سەلامەتی ئامانجەکان و بەرزی ئەم پڕۆژەیە و دەسـتەبەربوونی هۆشـیاریی مـەعریفی بە ئامانج و خواستەکانیەوە؛ لای پێگەیشتووانی ڕۆڵەکانی ئوممەت.

لەبەر ئەوە گرنگە تێبگـەین، کـە بابـەتی دووەم لـە هۆکارەکـانی دەستەوەسـتانی ئوممەت لە چاککردنی لەوەی کـە تووشـی بـووە، خـۆی لـە (کـەم و کـورتی گوتـاری پەروەردەییـدا) دەبینێتـەوە، ئـەوەش لـە لقـی یەکـەم کەوتۆتـەوە، کـە بریتییـە لـە کـەموکووڕی و شـێواوی میتـۆدی فیکریـی ئیسـلامی. ئـەم کەموکوورییـەش لـە پەراوێزخسـتن، یـان خـۆدوورگرتنی پیـاوانی قوتابخانـەی پەیامەکـە و سـەرکردەکانی فیکری ئوممەت لە بەشداریکردنی ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتیی گشتیی، لێکۆڵینـەوە و پشکنینیان بۆی کەوتۆتەوە. ئەمەش بۆتـە مایـەی پووکانـەوەی ڕۆڵـی سەرچـاوەی دووەمی مەعریفەی ئیسلامی، کە بریتییە لە مەعریفەی مرۆیی، لە درککردنی سوننەت و سروشـتە گـەردوونی و مرۆییـەکان و ڕووداوە شـوێنی و کاتیـەکان و ڕامکردنیـان بەشێوەیەکی کـارای کردەیـی لـە بـەڕێوەبردنی سیاسـەتی ئوممـەت و بەڕێوەبـەردنی کاروبارەکانی، لەپێناو هێنانەدی ئامانجەکانی ڕێنمایی گشـتی خـودایی بـۆ مـرۆڤ، بـە ڕێنمایکراوی و زانین و بەرچاوڕوونی.

نا ئامادەیی سەرچاوەی مەعریفەی مرۆیی لە (سنن) و سروشـتەکاندا، لـە ئاکامـدا بۆتە مایەی بلاوبوونەوەی عەقلییەتی بەدواداچـوونی باوکانـە (پێشـینان)، لەوێشـەوە دەستەوەسـتانبوون لـە درککردنـی سروشـتی گۆڕانکارییـەکان و نـەبوونی توانـای

مامەڵەکردن لەگەڵیدا لە پێکهێنانی دەروونی مرۆیی و گەشەپێدانی و ئامادەکردنی لە قۆناغە جیاوازەکانی منداڵییدا.

لە ماوەی ئەم قۆناغانەشدایە کە جۆری پاڵنەرە دەروونی و ویژدانییەکان دروست دەبن، لەگەڵ ئەو چەمکە مەعریفییە میتۆدییانەشدا کە عەقڵیەتی ئەندامانی کۆمەڵگا و دەروون و ویژدانیان بەگوێرەی مۆرکی خۆیان بونیاد دەنێن و تیایاندا دەبنە مۆرکێکی ڕەسەن و ڕیشەدار، بەجۆرێك کە تێگەیشتن و بەدەمەوەهاتنیان سەبارەت بەو ڕووداوانەی لەدەوریاندا دەگوزەرێت و ئەو پێشهات و تەحەددایانەی کە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە لێیەوە سەرچاوە دەگرێت.

**پاڵنەرەکانی ئەم توێژینەوەیە:**

پاڵنەرەکانی توێژینەوە لەم دۆسیە مەعریفی و پەروەردەییەدا، بریتییە لە هەستکردن بە ئەولەویەتی پێویستبوون بە بونیادنانەوەی دەروونی موسوڵمان و گێڕانەوەی توانا و وزە ئەخلاقی و ژیارییە داهێنکارییەکانی، بە ئامانجی سەرخستنی پرۆژەی ژیاری ئیسلامی و هێنانەدیی ئامانجە باڵاکانی.

ئەم دۆسیە و باسە چەند ڕەهەندێکی فرە لایەنە، لەوانەش؛ ئەوەی کە پەیوەستە بە ئیسلامەوە لە ڕووی ئەوەی کە پەیامێکی باڵای خوداییە، هەروەها ئەوەش کە پەیوەستە بە مرۆڤایەتیی ئازارچەشتووی سەرگەردانی لەململانێدا بوو، ئەوەشی کە پەیوەستە بەو موسوڵمانانەوە کە بە کۆ لاواز و زەلیل و چەوساوە و بەکۆیلەکراون.

زیانەکانی دواکەوتنی ئوممەتی ئیسلامیی و لاوازیی و پەرتەوازەیی و دەستەوەستانی و کەموکوڕییەکانی جێبەجێکردنی، تەنیا لە خودی ئوممەتدا کورت نابنەوە، بەڵکو لە هەمان کاتدا دەبنە ڕێگر لە نووری پەیامی جیهانییانەی ئیسلام و هیدایەتە گشتییە ڕۆحییە ڕەوشتییەکەی، لە ڕووی یەکبوون و جێنشینی و برایەتی و ئاشتی و دادپەروەری و ڕەحمەتەوە، دەبێتە ئاستەنگی پەیامی ئیسلام لەوەی ببێتە

منداڵدانی ژیارێکی ڕاستەقینە و بەختەوەرییەکی گیانی و ماددی و خێر و چاکەیەك لە دنیا و دوارۆژدا.

بوونــە بەربەســتی پــەیامی موحەممەدییانــەی ئیســلامی ژیــاریی گــەردوونی، لــە ســەردەمێکدا کــە پێکهاتــەکانی جیهــانیبوونی دنیــای مــرۆڤ و تواناکــانی تێیــدا پێگەیشتوون، بە مەزنترین تاوان هەژمار دەکرێت کە سزاکەی دەکەوێتە سەر هەموو ئوممەتی ئیسلامیی بە گشتی، لەسەر ڕووناکبیران و سەرکردەکانی فیکر تێیدا بەتایبەت.

ئــەوەی تووشــی مرۆڤایــەتیی بــووە –بــەهۆی باڵادەســتبوونی دیــدی گــەردوونیی ماددیانەی جاهیلییانەی ڕەگەزپەرستانەوە– لە جیهانیبوونی جەنگ و ململانێکان و ستەم و تراژیدیاکانی (کۆڵۆنیزم)، سەختتر و ستەمکارانەتر و دڵڕەقانەتر دەبێت. لەگەڵ گەورەبوونی هۆکارەکانی لایەنی بەهێز و ئامرازەکانی لەجیهانێکدا کەجیاکاری و چاوبرسێتی ماددە و توندیی ڕکابەریی و خۆبەزلزانینی بەهێزەکان بەسەریدا زاڵە، ئــەم ســتەمانەش گــەورەتر دەبــن. ڕزگــارکردنی ئوممــەتی ئیســلامیی، بــە تــەنیا ڕزگــارکردنی پێــنج یــەکێکی گرنگــی قــەوارەی مرۆیــی و مێژووەکــەی نییــە، بــەڵکو ڕزگارکردنی ئایینــدەی مرۆییــە کــە دڕنــدەیی جەنگــەڵ و بۆگــەنیی ڕەگەزپەرســتی و مــەزنبوونی وزەکــانی وێرانکــاریی و کاولکــاریی هەڕەشــەی لــێ دەکــەن. ڕزگــارکردنی ئوممەتی ئیسلامی بــە تــەنیا بابــەتی هەســت و نەســت و حــەز و ئارەزووگــەلێك نییــە، بەڵکو بابەتی کار و هــەوڵێکی زانســتییانەی میتۆدییانــەی ڕێکوپێــك و ڕێکخــراوە، کــە دەبێتە مایەی پاڵفتــەکردنی ئیسلام لــەوەی بەدرێــژایی مێــژووی گــەلانی موسوڵمان تێکەڵ بە تێگەیشتن و کەلتوورەکەیان بووە، لە بۆماوەیی نەریتە ڕزیوەکان و لادان و مومارەسەکانیان و ئەوەی لە خورافاتی باوباپیرانیان و بابەتە پڕوپوچەکانی کاهینانی پێشوویان کە بەدوایاندا هاتووە.

بە مەبەستی پاڵفتەکردنی ئیسلام و کەلتووری ئیسلامی و چەمکە بنەڕەتییــەکانی، پێویستە تێگەیشتن لە قورئانی پیرۆز بهێنرێتەوە کایە، لەگەڵ درککردنــی ڕەوتەکــەی

له مێژووی ئوممەت و زانینی ئەو فاکتەر و نشێوانەی کە کاروانی ئوممەت و فیکر و کەلتووری ئیسلامییان تێدا پێکهیاتووە، بەوەش موسوڵمانان بەهۆیەوە بە هۆکارەکانی پیسبوونی کەلتووریی و لادانی کۆمەڵایەتیی ئاشنا دەبن، لە ڕەوتی ئەم پیسبوون و لادانەش تێدەگەن؛ تاوەکو بتوانن ڕاستی بکەنەوە.

**دووەم: میتۆد (المنهج)**

**گشتگیریی و هەندەکیبوون لە میتۆددا** (الشمولية و الجزئية في المنهج):

ئامانجی ئەم باسە ڕوانینێکی بابەتییانەیە بۆ سوننەتە ئیلاهییەکانی گەردوون و بوونەوەر، بەرنامەیەکی ئیسلامییە لە ئامانجە گشتگیرییە ڕۆحی و ڕەوشتییەکانیدا، میتۆدێکی گشتگیری شیکارییانەی مێژوویی ڕێککراوە، پابەندە بە ئامانجە ئیسلامییە جێنشینکاریی (الاستخلافية) چاکەگەرەوە.

گشتگیریی لە توێژینەوەی کۆمەڵایەتیدا کارێکی پێویستە، چونکە تێگەیشتن لە دیاردەکان و درککردنی هۆکارە شاردراوەکانی بە ئامانج گرتووە، ڕوانینێکی هەندەکییانەش بۆ ئەمجۆرە کایە ئاڵۆزە فرە هۆکارانە، بە زۆریی توێژەر چەواشە دەکات و سەنگی دیاردەکان و پێگە و جێکەوتەکانیان لاسەنگ دەکات و بەشێوەیەکی لاسەنگانە سادەیان دەکاتەوە، بەجۆرێك تێڕوانینگەلێکیان لێوە بەرهەم بێت، کە لە خەیاڵ و وەهمەوە نزیکترین.

ڕەنگە شێوەی پەیوەندی نێوان ڕوانینی هەندەکی و ڕوانینی سەرتاپای گشتگیر لە لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکاندا وەك ئەو کەسە بێت کە پارچە کاغەزێك دەهێنێت و هەندێك مەرەکەبی بەسەردا دەڕێژێت و بە چاوی خەیاڵ لە بەردەمیدا ڕادەمێنێت، وێنە و شێوەگەلی وای دێتە بەرچاو کە لەڕاستیدا بوونیان نییە، ئەمە کێشە نییە مادامەکی درك بەوە دەکات کە تەنیا مەرەکەبێکی ڕژاوە و بەشێوەیەکی هەڕەمەکیی ڕژاوەتەسەر کاغەزێکی لووس.

بەزۆریی میتۆدی هەندەکییانە لە تێڕامان و خەیاڵاتەکانیدا —بۆ ئەو کەسەی بەچاکی بەکاری ناهێنێت و درك بە سنووری کاراییەکەی ناکات— بۆ تێڕوانینی وەهمی و دەرەنجامی زۆرکارانە سەردەکێشێت، کە هیچ پەیوەندییەکی بە واقیع و حەقیقەتەوە نەبێت، لەوانەشە خاوەنەکەی هەڵبچێت و سەرسامانە نارەزایی بەرانبەر گوێگران دەرببڕێت کەگوێ لەوە ناگرن بۆیان باس دەکات و دەڕۆنن، لە بەهەندگرتنی گومانەکانیشی بێزاریی دەربڕێت، ئەو گومانانەی کە بەوپەڕی جددییەتەوە پێیوایە حەقیقەتن.

ئەم جیاوازییانەی نێوان ڕوانینی گشتی و ڕوانینی هەندەکی، وەك بڕیاردانە بەسەر ڕووداوەکاندا ، بەبێ بەهەندگرتنی هەلومەرجە شوێنی و کاتییەکانی، بۆیە لەسەر بناغەیەکی هەندەکییانە، بە چەند کاریگەرییەکی خودییانە کە نە ڕوانینێکی گشتگیر پشتگیری دەکات، نە درککردنێکی دروستی ڕێژەییبوونی دەلالەتەکان لە هەلومەرج و پێکداچوونەکانیاندا کە لەگەڵ فاکتەری دیکەدا بە یەکتر کاریگەر دەبن دەستیان پێوە دەگیرێت. وەك وتەی ئەو کەسەی کە لەخۆیەوە دەڵێت: بڕی یەك ملیۆن کەمە یان زۆرە. گەر بێتو ئەم بڕە مانگانە بۆ تاکەکەس ببڕدرێتەوە؛ ئەوا بڕێکی یەکجار زۆر دەبێت، لەکاتێکدا گەر مەبەست پێی بودجەی دەزگایەك یان دەوڵەتێك بێت، ئەوا سەیر نییە گەر زۆر کەم هەژمار بکرێت.

لەبەر ئەوە، بۆ چارەسەرەکردنی قەیرانی ئوممەت و لاوازیی ئەدای گەلان و ڕۆڵەکانی و دەستەوەستانی پڕۆژە ژیارییەکەی؛ لە هێنانەدی ئامانجە بالاکانی بەدرێژایی چەندین سەدە، ئەوە دەخوازێت کە توێژەر لەوەی پەیوەستە بە دیاردەی پەرتەوازەبوون و بێدەسەلاتیی و دواکەوتن، کە موسوڵمانان پێوەی دەناڵێنن پشت بە زۆرترین بڕی شیکاریی گشتگیری ببەستێت.

لاوازیی بوێریی ئەدەبی و ڕوانینی ڕەخنەگرانەو زاڵبوونی ئاستەنگی ترس و تۆقین بەسەر دەروونی ڕۆڵەکانی ئومەتدا، زۆربەی چارەسەرەکانی بە ڕووکەشگەرایی و هەڵچوون و ساختەکاریی ڕەنگرێژکردووە، لە ڕوانینی پشکنەر و شیکردنەوەی

جدديش بۆی بووەتە ڕێگر، تا خەریکە فیکر و بیریاری هاوچەرخی ئیسلامیی وەك ئاژەڵە دڕندەکانی ئەو نمایشە پاڵەوانبازییانە دەربکەون.

لە ئەنجامی ئەو دەستەمۆکردنەدا، ترس و تۆقین گەیاندونیەتە ئاستێك کە نکوڵی لە سیفەتە سروشتییەکانی خۆیان بکەن، ئیدی عەقڵ و فیکری موسوڵمان —بە حوکمی ئەم ئاستەنگە کەلتوورییانە— وایانلێهاتووە بۆ خۆیان ببنە پاسەوانی زیندانی خۆیان و کاهینی پەرستگەی دواکەوتن و دەستەوەستانی خۆی.

خەریکە ئاستەنگە کەلتووریی و عەقیدەییەکانی هیندۆسییەت و ئەوەی ئەو بیرو باوەڕانە بەدرێژایی چەندین سەدە لە ترس و تۆقینی دەروونیی لە ناخی شوێنکەوتووانیاندا بەرهەمیان هێناوە، ئەمە ئەو دیاردە دەروونییە ڕوون دەکاتەوە، چونکە لە ئاستەنگەکانی فەرهەنگی هیندۆسییەتدا ئەوە دەبینین کە سەدان ملیۆن لە گرووپی پەراوێزخراو و بێزراوی هیندستان بوونەتە پاسەوانی بەدبەختی و نەگبەتیی خۆیان.

دڵی مرۆڤ چەند خەم و ئازار دەچێژێت کاتێ دەبینێت زۆرێك لە بیریارانی ئیسلامی دەستبەرداری دەربڕینی بۆچوونی خۆیان دەبن، تەنیا لە سنووری باودا نەبێت، ئەوەش بەهۆی زاڵبوونی ئاستەنگە کەلتوورییە بۆماوەکان بەسەریاندا، لە ترسی کاردانەوەی دەروونیی نا ئاقڵمەندانە، کە بەدرێژایی زەمانە دووبارەبوونەتەوە و بەسەر عەقڵییەتی جەماوەری موسوڵماندا زاڵ بووە، بونەتە بەربەستی گفتوگۆی بەهێز، ئەو گفتوگۆیەی کە بوار بۆ دیدی نوێگەرانەی ئیجتهاد بکاتەوە، بۆ تێڕوانینگەلێك کە لەسەر چەند بنەما و پایەیەکی ڕەسەنی عەقیدە و مەبەستەکانی ناردنی شەریعەت (مقاصد الشريعة) وەستابن، نەك لەسەر بۆماوەیی سەدەکانی پێشین و ئەوەی لێی پەیدابووە لە لایەنگیری و گرووپگەراییە رابوردووەکان.

پێویستە بیریاری موسوڵمان بوێر بێت لە دەربڕینی بۆچووندا، نوێگەر بێت لە فیکر و ڕوانیندا، تا لەگەڵ کاروانی ئەو گۆڕانکارییانەی لەواقیعی ژیاندا دێتە ئاراوە و

ئەوەی کەڵکە بوونی مەعریفە و ئەزموونەکان لە تواناکان و ئەو تەحەددییانەشی کە دەیخەینەڕوو ئەو گۆڕانکارییانەی دەیسەپێنن هەنگاو بنێت، بۆ ئەوەی دابەزاندنی پرەنسیپ و بەهاکان بەشێوەیەکی کارای کردەیی لەسەر واقیعی ژیانی مرۆڤ و تۆڕی پەیوەندی و مامەڵەکانیان و بونیادنانی دەزگاکانی رەنگ بداتەوە.

**گشتگیری و بونیادنانی ئەولەوییەت (بابەتە لەپێشترەکان):**

سروشتی توێژینەوەی گشتگیری شیکاری وایە —بەبێ بەڵگە— یەك فاکتەری کاریگەر لەهەر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی وەرناگرێت، بەڵکو وایدەبینێت کە شیکاری بنەڕەتی بریتییە لە فرەیی ئەو فاکتەرانە، پشتبەستنی هەندەکییانەش—بە هۆکاری کەلتووری یان سۆزگەرایانە، یاخود دیدێکی هەڵبژاردەگەرانە، یا سەرپشکبوونی هەڕەمەکی— سادەکارییەکی زیانبەخشانەیە یەك فاکتەری دیاریکراو لەپاڵ کۆمەڵێك لە فاکتەر و هۆکاردا دابنێین، لەپاڵ فەرامۆشکردنی هۆکارە بابەتییە بایەخدارەکانی دیکەی پەیوەست بە سەرجەم لایەنەکانی ئەو دیاردەیە. هەروەها پشتبەستن بە دەرەنجامەکانی ڕوانینی جوزئی کە هەردەم دەبنە هۆی جۆشدانی هێما سۆزدارییە بۆماوەکان بەمەبەستی زاڵبوون بەسەر عەقڵ و ویژدانی ئەوانەی دەدوێندرێن، ئاستەنگی مەنهەجی دێنێتە ئارا و دەبێتە ڕێگری لە بوونی ڕوانینی ڕەخنەگرانەی جددی و گفتوگۆی هێمنی سەنگین، لەپێناو درککردنی کرۆکی مەسەلەکان و ڕۆشنکردنی عەقڵەکان و چارەسەری کێشەکان و ڕووبەڕوونەوەی تەحەدداکان.

زانینی فاکتەرە کاریگەرە گرنگەکانی هەر بابەت و بوارێك و زانینی بەیەکداچوونە ستوونیی و ئاسۆییەکانی؛ بابەتێکە بایەخێکی زۆری هەیە بۆ تێگەیشتنی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان و بەدواداچوونی جێکەوتەکانی و دانانی چارەسەرە کاراکان بۆ مامەڵەکردن لەگەڵیدا، بەڵام ئەمە ڕێگر نییە لە ڕێکخستنی ئەولەویاتەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم فاکتەرانە و ڕێکخستنی چارەسەری ئیشکالاتەکانی (کێشەکانی).

بگره ئەوەی لە لێکۆڵینەوەی هەر بابەتێك یان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیدا گرنگە، بەتەنیا ڕوانین نییە بۆ سەرجەم فاکتەرە کاریگەرەکان تێیدا، یان زانینی جۆری مامەڵەکردن لەگەڵیدا، بەڵکو دەبێت جیاکاریی بکرێت لەنێوان هۆکارە ڕیشەییەکان و ئەو زیانانەی لێی دەکەونەوە، لەو ڕوانگەیەوە کە زۆرێك لە بیریاران بەزیانەکان ڕەخنەیان لێ دەگیرێت کە وەك پێویست بایەخ بە بابەتە بنەڕەتییەکان نادەن و دەستاڕی هەوڵەکانیان لە بازنەگەلێکی ناکۆتادا لە چارەسەری ڕووکەشانەی نەزۆکی دووبارەبوونەوەدا دەسوڕێنەوە. ئەوانە وەك ئەو کەسە وان کە وزەی خۆی لە خستنەگەڕی هەوڵە ماندووکەرەکانیدا خەرج دەکات بۆ چارەسەری نەخۆشییەکانی بەلهارزیادا، بێئەوەی گوێ بە ڕیشەی نەخۆشییەکە و سەرچاوەکەی بدات، بە قەڵاچۆکردنی ئەو زبڵ و خاشاکانەی دەخرێتە ناو سەرچاوەکانی ئاوەوە، کە ئاو پیس دەکەن و دەیکەنە سەرچاوەیەکی بەردەوام بۆ گیرۆدەبوون بە نەخۆشی و بڵاوبوونەوە پەتا.

بەرەنگاربوونەوەی زیانەکان، لە بەرەنگاربوونەوەی بابەتە بنەڕەتییەکاندا سوودی نییە، ڕووبەڕووبوونەوەی کۆڵۆنیالیزم و عەولەمە و ئەوەش کە پەیوەستە پێیانەوە لە هەژموونی باڵادەستی ستەمکارانەی جیهانی، بە هیچ شێوەیەك نابێت کەمتەرخەممان بکات لە ڕووبەڕووبونەوەی -بەپلەی یەکەم- بۆ ئەو هۆکارانەی کەوامان لێدەکات شایستەی داگیرکاری بین، هەروەها نابێ کەمتەرخەممان بکات لە ڕووبەڕووبوونەوەی بوێرانەی هۆکارەکانی کەموکووڕی خودی و بێدەسەڵاتی و دواکەوتن لە قەوارەی ئوممەتدا.

بەمشێوەیە، ئەوەی لەم توێژینەوەیەدا گرنگە بۆمان، درککردنی وێنە گشتییەکە و زانینی فاکتەرە بنەڕەتییە کاریگەرەکانە لە قەیرانی دواکەوتنی ئوممەت و پەرتەوازەبوون و دەستەوەستانییەکەیدا، هەڵوێستەکردنە لەسەر جۆری پێکداچوونی نێوان ئەو فاکتەرانە و درککردنی ڕتوخمەکانی ئاڵوگۆڕی کاریگەری و کاریگەربوونە

لەنێوانیانــدا، بەســتوونی و ئاسـۆی، لــە کــات و شــوێن و قەتیســکردنی ماکــەکانی تەشەنەکردنی ناوخۆی و دەرەکی کە لێی دەکەونەوەو سەختییەکەی زیاتر دەکەن.

درککردنــی گشــتگیرانەی دروســتی هەریــەك لــەم فاکتــەرە کاریگەرانــە، دەلالــەتی ڕاســتەقینەی کــەمی کاریگەریــە ڕاگوزەرەکــان بەهەنــد وەردەگرێــت، کــە ئاڕاســتەی بنەڕەتی هێڵی بیـانی بەرزبوونـەوە و دابـەزین ناگۆڕێت، چـونکە ئـەمجۆرە لەرینـەوە ڕاگوزەرانە —لە زۆربەی بارودۆخەکاندا—لە چاودێریکردنی جووڵەی هەمەکییانەی هێڵی بیانی و زانینی ئاڕاستەی جووڵە گشتییەکە تێیدا بەهەند وەرناگیرێت.

کاری ئەم لەرینەوانە و بایەخدان پێیـان، لـە شـوێنی خۆیـدا لـە بـواری پڕاکتیکـی مەیدانی هەنوکەیدا شـوێن خـۆی هەیـە، کـە پەیوەسـت نـین بـەمجۆرە لێکۆڵینـەوە و توێژینەوانــەوە، کــە چــاودێریی ئاڕاســتەکانی بەرزبوونــەوەو نزمبوونــەوەی جووڵــەی ژیارەکان دەکەن.

چونکە ڕۆچوون بە قووڵایی وردەکاییەکانی ئەم لەرینەوانەدا بیـنین لێـڵ دەکـات و تێگەیشتن بەهەڵەدا دەبات و فیکر لە لمی جوولاو و جوڵە خەیاڵیەکاندا نغرۆ دەکـات، دەیخاتە ناو باسێکی نەزۆك کەوەك پێشبڕکێی کەسی گەمژە لەگەڵ سێبەری خـۆی و ڕاونانی پشیلە بۆ کلکی خۆی وایە.

ئێمە لە حەقیقەت لا نادەین گەر بڵێین: کـەلێنی (توانـا)ی ژیـاری و (ئـەداکردن)ی جیــاواز —لەگــەڵ تێپــەڕینی ڕۆژگــاردا— لــەنێوان ئوممــەتی موســوڵمان و نەتــەوە پێشکەوتووەکاندا لەزیادبوونی بەردەوام و فراوانبووندایە، ئەمەش بەهۆی خێرابـوونی تواناکانی زانسـت و تەکنـەلۆجیا نوێیـەکان لای ئـەو نەتەوانـە، کـە وا دەکـات بتـوانن مشتەکۆڵەی کۆنتڕۆڵ و زاڵکردن و دواکـەوتن بەسـەر قـەوارەی ئوممـەت و تواناکانیـدا بەتۆکمــەیی بــدەن، بــەوەش پشــکی ڕۆڵــەکانی ئوممــەت لــە برســێتی و نــەزانینی و نەخۆشی و دواکەوتن زیاتر دەکات.

لە سەردەمی تەحەددای خۆرئـاوایی و داڕمـانی دەوڵـەتی عوسمانییـدا، دواهـەمین مەزنترین دەوڵەتی ئیسلامی، لـە مـاوەی نزیکـەی سـێ سـەدەدا دەبیـنین هەوڵـەکانی

چاكسازیی و هەستانەوە لە جیهانی ئیسلامییدا زۆر و هەچەشن بوو، لە بزوتنەوەی چاكسازی ئاینی لەسەر دەستی ئیمام محەمەدی كوڕی عەبدولوەهاب (١٧٩٢ز دا كۆچی دوایی كردووە) لە دورگەی عەرەبیدا دەستی پێكرد, شاه ولی الله (لە ١٧٣٦ز دا كۆچی دوایی كردووە) لە هیندستاندا و سولّتان سەلیمی سێیەمی عوسمانی (١٨٠٧ز كۆچی دوایی كردووە) و ئەوەش كە بەدوایدا هات لە بزاڤەكانی ڕیفۆرمی ئایینی لە سەردەستی (ئەبو عەبدوللّا محەمەد بن عەلی سەنەوسی) (١٨٥٩ز كۆچی دوایی كردووە) لە لیبیادا، و محەمەد ئەلمەهدی لە سوداندا (١٨٨٥ز دا كۆچی دوایی كردووە) و خدێوی میسر محەمەد عەلی پاشا (١٨٤٩ز) و خەیرەدین پاشای تونسی ی وەزیری عوسمانی (١٨٩٠ز) و سەید ئەحمەدخان لە هیندستاندا (١٨٩٨ز) و جەمالەدینی ئەفغانی (١٨٧٩ز) شێخ محەمەد عەبدە (١٩٠٥ز) و شێخ عەبدولڕەحمانی كەواكبی (١٩٠٢ز) و محەمەد ڕەشید ڕەزا (١٩٣٥ز) و حەسەن بەننا (١٩٤٩ز) و ئیبن بادیس (١٩٤٣ز) و (ئیبن عاشور ١٩٧٣ز).

هەروەها ئەوەی كەلەگەلّ بزوتنەوە سەربەخۆیخوازەكاندا لەزۆر ولاّتی ئیسلامیدا؛ لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەوە تا ئەمڕۆ هات، لە هەولّەكانی ئاوەدانكارییە مەدەنییەكان و بزوتنەوە نەتەوەییە عەلمانییەكان و ئەوەی بەهۆی ئەو ئایدیا و بزاڤ و هەولاّنە لە گۆڕانكاری فیكری و ڕووناكبیری و ئاوەدانی هاتە ئارا، بەلاّم وەك سەرەنجام نەیانتوانی —ئەوەی كە لەبەردەستدایە— لە دیاریكردنی نەخۆشییە ڕاستەقینەكانی ئوممەت و دانانی چارەسەری پێویست بۆ دەرهێنانیان لە چالّی دواكەوتوویی و هاوكاریكردنیان لە ڕووبەڕووبوونەوەی تەحەددا ترسناكە گەشەكردووەكانی سەردەمدا سەركەوتن بەدەست بهێنن.

بۆ هێنانەدی ئەوە؛ پێویستە لەسەرمان، درك بە سۆنگەكانی ئەم فیكرە لە كاتی ئێستاماندا بكەین، كە سەرچاوە گەلێكن لە بنەڕەتە فیكرییە ڕاستەوخۆكەیاندا دەگەڕێنەوە بۆ ڕوانگەكانی شێخ عەبدولڕەحمانی كەواكبی و فیكرەكەی لە هەردوو كتێبەكەیدا (أم القرى) و (طبائع الإستبداد). لە(أم القرى)دا كۆمەلّێك لە بنەما

گەورەکانی ئیسلام دەخاتەڕوو لەگەڵ بەها بنەڕەتییە باڵاکانیدا، لەپێش هەموویانەوە یەکتاپەرستی و بەهاکانی دادپەروەری و هاریکاری و ڕاوێژ. لە (طبائع الاستبداد) یشدا ئەو دواکەوتوویی و دارمان تووشی ئوممەت هاتووە دەخاتە ئەستۆی حکومەتەکان، بەهۆی ئەو ستەمکاری و بە زایەدان و گەندەڵییەی لەسەرکردایەتیەکەیدا هەیە.

گرنگە لە ڕووی میتۆدەوە سەرنجی ئەوە بدەین، کە سەرەڕای تێپەڕبوونی پتر لە سەد ساڵ بەسەر تێزەکانی ئەم دوو کتێبە و تێپەڕبوونی زیاتر لە سێ چارەکە سەدە بەسەر هاتنە ئارای بزووتنەوە جەماوەرییە چاکسازییە سیاسییە ئیسلامییەکاندا، کە پشت بەم گوتانە دەبەستن و سەرەڕای بەدوایەکدا هاتنی هەوڵی حکومەتە مەدەنییەکان و بزاڤە عەلمانییەکان، نابینین کە ئوممەت ئێستا زیاتر لە پێش دەستپێکردنی هەوڵەکانی لە ئامانجی خۆی نزیك بووبێتەوە.

پرسیارە میتۆدییەکەش ئەوەیە: بۆچی ئەوانە بەدرێژایی ئەم هەموو ماوەیە، لە هێنانەدی زۆربەی ئەو ئامانجانەی کە لێیان دەخوازرا سەرکەوتوو نەبوون؟ بۆ ئەم هەوڵانە سەریان نەگرت؟

توێژینەوەی زانستیی ڕێك (systematic) مایەی ئومێدە بە ئیزنی خوا ببێتە مایەی کاملبوونی چارەسەرەکان و پشتگیریکردنی ئەو هەوڵانەی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی قەیرانەکە و بڕینی ئاستەنگەکان نراون، بەمەبەستی هێنانەدی خواستەکە و چاککردنی کەموکوڕییەکان. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە هەرچی هەتا ئەمڕۆکە بەدەستهاتبێت هەر دەبێت هەڵە بێت، بەڵام بەوپەڕی دڵنیاییەوە بەس نەبووە بۆ ئەنجامدانی گۆڕانکاری و چاکسازیی پێویست.

هەوڵەکانی توێژینەوە و ڕوانین و پشکنین و پشکنینی فیکری مەنهەجی پێویستە لە گەیاندنی ڕۆڵی خۆیان، بە قوڵاییەکی زیاتر و هەوڵێکی مەزنتر و بوێرییەکی پترەوە، بەبێ کەموکوڕیی لە بناغە میتۆدییە عەقڵییە زانستییە ئیسلامییە ڕەخنەگرەکەدا بەردەوام بن، تا توێژەر بتوانێت درك بە شوێنی بابەتە جێگیرەکان و

شـــوێنی گۆڕدراوەکـــانیش بکـــات، دوور لـــە بانگەشـــەی وەهمگەرایانـــە، یـــان بەرژەوەندخوازانە یان مەبەستدارانەی نەرێنیی.

ئەمەش لەڕووی میتۆدەوە لە بەرامبـەر ئـەو کێشـەیەدا کـە ئێمـە باسـی دەکـەین، ئـەوە دەگەیـەنێت کـە فاکتـەرێك یـان چـەند فاکتـەرێك هـەن هێشـتا نـەزانراون کـە بەگەڕخستنی هەوڵەکانی دیکە و فاکتەرەکانی تری لەسـەر وەسـتاوە، ئەمـەش ئـەوە دەگەیەنێت کە هێشتا پێویستمان بەوەیە ئازادی پێویست بەهەوڵـەکانی توێژینـەوەی فکریی بدەین و ئەم بابەتە بەشێکی باشی لەئەولەویەتی هەوڵ و کۆششـی بیرمەنـدان وزانایان لەم قۆناغە هەستیارەی ژیانی ئوممەتدا پێبدرێت.

## گرنگیی درککردنی تایبەتمەندییەکانی ڕشتەبەندی (مەنزومەی) بیروباوەڕیی و فیکرییانەی خود:

یەکـەمین شـتێ کـە توێـژەر لـە زۆرێـك لـە ڕوانگـەکانی ڕێنیسـانس و پـڕۆژە دواکەوتووەکانی ڕیفۆرم لای موسوڵمانان سەرنجی دەدات –بە چاوپۆشی لە هۆکار و پاڵنەرەکان–هەر لەسەرەتاوە بە شوێنکەوتن و لاساییکردنەوەوە دەستی پێکـردووە، یان بە ئاڕاستەی مێژوو بووە, لەگەڵ گوتارێکی بارگاویی بە بـەرەمزە سـۆزدارییەکان (الرموز العاطفية)، یان بە ئاڕاستەی لاسایکردنەوەی بیانیی باڵادەست. ئاشـکرایە کـە فیکـری تەقلیـد و لاسـاییککردنەوەو ڕازێنـراوە وزەکـان بەگـەڕناخات و پاڵنـەرەکان نابزوێنێـت, ئـەوەی لـەتوانادا نابێـت. هـەتا ئوممـەت و ئاڕاسـتەکانی پـڕۆژەی ڕێنیسانسەکەی لە تەقلید و لاسایکردنەوەوە سەرچاوە بگرێت، ئەداکردنی موسوڵمان ناتەواو دەمێنێتـەوە و قـەوارەی موسـوڵمانیش لاواز و دەستەوەسـتان و مـافخوراو و زۆرلێکـراو دەمێنێتـەوە، چـونکە نابنـەهۆی گێڕانـەوەی لاپـەڕەکانی مێـژوو و وزە شاراوەکانیش ناخەنەگەڕ.

### هەڵەکانی متوربەکردنی فیکریی نێوان دوێنێ و ئەمڕۆ:

موسوڵمانان لە سەرەتای دروستبوونیاندا نەیانتوانی هەوڵی تـەواوی پێویسـت بـۆ تەواوکردنی توانەوەی کەلتووری و پەروەردەیی ئەو گەلانەی هاتنە ناو قەوارەکەیەوە دەستەبەر بکەن، ئەمەش بەهۆی زۆریان و خێرایی لە ڕادەر و بەشوینیەکداهاتنی ئەو ڕووداوانەی بوونە هۆی فراوانبوونی ڕووبەرەکەی.

لە زۆرێك لەحاڵەتەکاندا فیکری موسـوڵمانان کەوتۆتـە هەڵـەوە، یـان نـەیتوانیوە بابەتە لەپێشینەکان (الأولويات) بخەملێنێت و ئەوەی کـە بـۆ ئـەو قۆناغـە سـەرەتایە پێویست بێت لەکاتی مامەڵەکردن لەگەڵ میراتی گەلەکانی لە خێڵ و نەتەوەکان و لـە ئەفسـانە و فەلسـەفەکانی ئیلاهییـات دابـین بکـات، لەبـەر ئـەوە دەبـوو لەکۆتاییـدا خـراپترین چارەنووسـی هـەبێت کـە وزەی ئوممـەت بەهـەدەر بـدات و تێڕوانییەکـەی بشـێوێنێت و سەفسـەتە و یـەکێتی بـوون و پەرتـەوازەیی و فیتنـە و لادانـی دامەزراوەکانی لێ بکەوێتەوە، لەکۆتاییشدا وزە عەقیدەیی و فیکرییەکەی لاواز بکـات و ئـەو بەڵگـە عەقیـدەیی و چوارچـێوە مەنهەجییـە فیکرییـە لەدەسـتبدات کـە تایبەتمەندبوون و تاقانەیی و توانای نوێبوونەوەو ڕاستکردنەوەی ئاراسـتەی جووڵـەی کۆمەڵگا و پەرەپێدانی دامەزراوەکانی پێبەخشیبوو.

بۆ ڕوونکردنەوەی تایبەتمەندییەکانی نەتەوەکان و ڕەهەندە ژیارییەکانیان، گرنگە درك بـەوە بکـەین کـە هـەموو شـتێك لەبوونـدا بریتییـە لـە سیسـتم (system)، لـە خانەیەکەوە تا گەلە ئەستێرەیەك. هەموو ڕشتەبەندێکیش (مەنزومەیەکیش) خاوەنی تایبەتمەنـدی خـۆی و ڕێسـاکانی کـارکردن و سـنووری وزەی خۆیـەتی، گـەر ئـەو تایبەتمەندیی و ڕێسا و سنوورانە لەبەرچاو نەگیران، ئـەوا مەنزومەکـە تێکدەشـکێت و دادەڕمێت.

نزیکترین نموونەی بەرجەستەکراو جەستەی مرۆڤـە، کـە بریتییـە لـە مەنزومەیـەك خاوەنی تایبەتمەندی و ڕێسا و سنووری وزە و ئیعتباراتی خۆیـەتی، بـۆ نموونـە گـەر مرۆڤ بڕێك لە ئۆکسجین لە لووتەوە هەڵبمژێت، دەبێتە مایـەی ژیـان بـۆی، لەکاتێکـدا

ئەگەر سرنجێکی لەوە—تەنانەت گەر یەك سانتیمەتریش بێت— لە ڕێگەی دەمارەوە پێی بدرێت، ئەوا ڕاستەوخۆ دەیکوژێت. لەبەر ئەوە پەند وەرگرتنەکە تەنیا لەوەدا نییە کە مەنزومەکە (سیستمەکە) وەریدەگرێت، یان وازی لێ دەهێنێت، بەڵکو لەو چۆنێتییەشدایە کە کاروبارەکانی پێ وەردەگیرێت و مەنزومەکە لەخۆیدا بەرجەستەی دەکات. بابەتەکە لەنێوان کەلتوور و ژیارەکانیشدا بەهەمان شێوەیە، لەو ڕوانگەیەوە لەوەی وەردەگیرێت و ڕەتدەکرێتەوە، لە چی ڕوویەکیشەوە وەردەگیرێت یان ڕەتدەکرێتەوە پێویستە سەرنجی تایبەتمەندیی و بەها و مەبەستەکان بدرێت، لەم بابەتانەشدا بیریارانی موسوڵمانان بە شێوازێکی پشکنەرانەی زانستییانەی ورد بەقووڵاییەکەیدا ڕۆنەچوون، بایەخ و ڕوونکردنەوەی پێویستیان پێنەداوە.

ئوممەتیش ئەمڕۆ، لە بەیەکگەیشتنی فیکرە دامرکاوەکەی و سیستمە شاگەشکە بووەکەی بەفیکری بێگانە نەیارەکەی و، بەدامەزراوە پێشکەوتووە نوێبووەکانی—کەچی هێشتا تاڕادەیەکی زۆر بەشێوەیەکی زانستیی بابەتییانە درکی بە سروشتی سیستمە فیکرییەکەی و تایبەتمەندییەکانی قەوارەکەی نەکردووە[١]—, سەرسام بووە بە توانای نەیارەکانی و ئەوانەی باڵادەستن بەسەریدا، ئەمەش بۆتە ئاستەنگی درککردنی بە سروشتی سیستمە فیکرییەکەیان و تایبەتمەندییەکانی بوونیان.

گونجان و هاوئاوازی لەنێوان ویژدانی ئوممەتی ئیسلامی و ناخی لەلایەکەوەو، سروشتی فیکر و ئامانجی جموجووڵەکەی و ڕێبەری سیستمەکەی لەلایەکی دیکەوە، کارێکی پێویستە بۆ تەقاندنەوەی تواناکانی و جۆشدانی پەرۆشی لە دڵی ڕۆڵەکانیدا. لەمەشدا سەردەمی هاتنی وەحی و سەرەتای سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدین، نموونەیەکی پڕشنگدار و ڕێنمایکارن لە مێژووی ئوممەتدا.

بەڵام فیکری ئیسلامی هاوچەرخ، بێ ڕێبەری ڕێنوێنییە، لە قوڕولیتەی کارلێکی هەڕەمەکییدا، بە بێ بناغەیەکی میتۆدی کارلێکی لەگەڵ شارستانییەتی ڕۆژئاوادا

---

[١]. ابو سليمان، عبدالحميد. (الأمة بين شريعتين)، مجلة إسلامية المعرفة، هرندن: المعهد العالمي للفكر الإسلامي، العدد ٢٨، ٢٠٠٢، ص١٢٣–١٤٨.

گێژبووە، هاوشێوەی ئەو کارلێکە هەڕەمەکییە نامەنهەجییەی لە سەردەمی ئەمەوی و عەباسییدا لەنێوان مەنزومەی فیکر و ژیاری ئیسلامی و مەنزومەی فیکر و ژیاری گریکیدا ڕوویدا، کە شکستی هێنابوو و ڕۆڵی لەدەستدابوو. گەرچی ئەو کارلێکە سوودیشی بە ژیاری ئیسلامیی گەیاند؛ لە فێربوونی میراتی پیشەسازییەکانی پێشووی و دەستکەوتی زانستە فیزیکییەکانیانی، بەڵام لە لایەنە ڕۆحی و بیروباوەڕی یەکتاپەرستی جێنشینکارانەی و میتۆدی هۆکارەکانەوە زیانی بە گیانی ژیاری ئیسلامیی گەیاند و جووڵەی خاوکردەوە و گەیاندییە لێڵی دیدی گەردوونییانەی ئیسلامی و سەفسەتەی ئیلاهییات و لۆژیکی وێناندنگەرانە (المنطق الصوري) و ونبوونی میتۆدی ئیسلامی زانستییانە و ئەزموونگەرانە. بەمشێوەیە میراتی ئیسرائیلیات و فیکری خورافە و ئەفسانە و پڕوپووچ بەسەر موسوڵماندا زاڵ بوون و بەرەو مەرگ و خامۆشبوون ملی نا، هەمان ئەو دۆخەی کە لەمڕۆدا بەشێوەیەکی دیکە لەنێوان مەنزومەی فیکر و ژیاری ئیسلامی و مەنزومەی فیکر و ژیاری ماددی خۆرئاواییدا دووبارە دەبێتەوە، بێ ئەوەی ئاگاداری هەڵە مەنهەجییە گەورە و گرانانەکان بین کە پێشتر کردوومانە، بێ ئەوەی ئامۆژگاریی و پەندی پێویستیش لەو وانەیە وەربگرین.

### فیکری پەروەردەیی و گۆڕانی کۆمەڵایەتی:

مەبەست لەم توێژینەوەیە، ئەوەیە کە بابەتی منداڵێتی و ڕۆڵی فیکری پەروەردەیی لە بارەیەوە —بەوپێیەی ڕوانگەیەکی بنەڕەتییە لە هێنانەدی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتیدا— بخرێتە سەر خوانی لێکۆڵینەوە و فیکر و ڕوانین و ئەوەی بەدوایدا دێت لە بابەتەکانی پاڵفتەکردنی فەرهەنگی ئیسلامی و پاڵفتەکردنی تێکەوتە پەروەردەییەکانی (المدخلات التربوية) و کاملکردنی ئامڕازە مەنهەجییەکانی فیکری ئیسلامیی لە لێکۆڵینەوەی ڕێباز و سروشتەکان و واقیع لە کات و شوێندا، هەروەها لە تێگەشتنی دەق و مێژوو درککردنی ئەوەی لە ئاڕاستەکردن و وانە و پەند، بەشێوەیەکی گونجاو لەگەڵ کات و شوێندا پێشکەشی دەکەن.

بەمجۆرە ئەم لێکۆڵینەوانە بەشێوەیەکی کارای ئەرێنی بەشداری دەکەن لە پێکهێنانی عەقڵییەتی منداڵی موسوڵمان و بونیادنانی پێکهاتە دەروونی و ویژدانییەکەی، بەمەش لە شێوان و لادان و چاوبەست پاکژ دەبێت کە دیدی گەردوونییانەی تاکی موسوڵمان تێکدەدەن و گیانی زانستی و وزەکانی داهێنانی لاواز دەکەن و ماناکانی سەربەرزی و ڕێز و برایی و سەرخستن لە پێکهێنانی سایکۆلۆژیا و عەقڵییەتەکەیدا لەناو دەبەن. منداڵیی، بەدرککردنی واتا زانستییە دەروونییەکانی لە ڕوودانی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتییدا، بریتیە لە ڕەهەندی نا ئامادەی بنەڕەتی لە هێنانەکایەی گۆڕانی دەروونی دەستەجەمعی پێویست بۆ گەڕاندنەوەی دید و بزواندنی وزەی ویژدانیی و بەرەنگاربوونەوەی پێشهاتەکان (التحديات).

ئەرکی ئەم توێژینەوەیە بریتییە لە تیشك خستنەسەر ئەم ڕەهەندە نائامادەیە و ڕوونکردنەوەی رەهەندەکانی و کارلێکەکانی لەگەڵ فاکتەرەکانی دیکە و، زانینی ڕێگا کردەییە زانستییەکانی نەهێشتنی ئەو کەموکوڕییە و پڕکردنەوەی ئەو کەلێنە، بە ئامانجی تەواوکاری لەگەڵ ئەو هەوڵانەی کە بۆ بونیادنانی پرۆژەی چاکسازیی ئومەت و هەستانەوەی و, تەواوکردنی ئامرازەکانی، بۆ خزمەتی ئوممەت و مرۆڤایەتی و درەوشاندنەوەی ڕێنمایی پەیامی ئیسلام لە سیستەمی گوندی هاوچەرخی جیهانییدا.

لەراستیدا ئەو فاکتەرانەی کەموکوڕیی کە بەسەر ناخماندا زاڵ بووە و ئێمەی خستۆتە دواوەی کاروانەکەوە، لەبەر ئەوە ئومێدەوارم خوێنەر بە باشی لە ئامانجی ڕەخنەکە تێبگات، چونکە ئەم توێژینەوەیە تەنیا ئامانجی نەهێشتنی کەموکوڕیی و تەواوکردنی هەوڵەکانە، ڕێز و بە گەورەگرتنیشمان بۆ ئەوانەی پێشین، یان ویستمان لە تۆکمەکردنی هیممەتمان و خستنەڕووی باشی کالاکانمان، پێویستە نەبێتە بەربەستی زانینی لایەنەکانی کەموکوڕی کە بەسەرماندا تێپەڕبووە، تا نسکۆکەمان نەهێڵرێت و کەلێنەکە پڕبکرێتەوە و هیواکانمان بێتەدی (إن شاء الله تعالى).

هەڵەیە ئەگەر بەگوێرەی واقیع و رەوشی ئێستا؛ ڕابردوو دادگایی بکەین، بەڵکو پێویستە بەپێی واقیعی زەمەنی ڕووداوەکانی دادگایی بکرێت، هەتا خەملاندەکردنەکە

راستەقینەو هاوسەنگ بێت، هەروەها بۆمان هەیە بەوپەڕی ڕێز و بەرزگرتنەوە بەشدارییەکانی ژیاری ئیسلامی و بەخششەکانی لە ڕەوتی مێژووی مرۆڤایەتیدا بنرخێنین، بەوەی لە سایەی واقیع و هەلومەرجی خۆیدا دادگایی بکەین، تەنانەت گەر بەراورد بەوەی لەمڕۆدا لێمان دەوێت، یان لەوەی دەبوو بەمرۆڤایەتی ببەخشیایە کەموکووڕیشی هەبووبێت.

بەهەموو پێوەرەکان ژیاری ئیسلامی ماوەیەکی پرشنگدار و، بازدانێکی مەزنیشی بووە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا ، شوێنەواری ئەو ژیارەو ئەوەی لە ژیانی گەلانی ئیسلام لە گۆڕانکاریی و ئەوەش کە بەشداریی پێکردووە لە کەلتووری ژیاری هاوچەرخی مرۆیدا لە بنەما و میتۆد و سەرچاوە هێنایە کایەوە، بۆ ئەوە شایەتیی دەدەن. بگرە سەرەتاکانی لاوازی و بێهێزی لە بونیادی ژیاریی ئیسلامییدا، بەهۆی لادانی ئەم ژیارە لە سەرچاوەکانی ئیسلام لە کاروبارەکانی ڕۆح و ئەخلاق و ژیانی کۆمەڵایەتیدا ڕوویدا، ئەوەشە کە ئەمڕۆ هەوڵی فریاکەوتن و گەڕاندنەوەی دەدەین.

## سێیەم: ڕەگ و ڕیشەکانی قەیرانەکە

موسوڵمانان لە قەیراندان، لەمپەڕی ئۆقیانوسەوە تا ئەوپەڕی ئۆقیانوس، لە سەرچاوەی ماددی و مرۆییدا لەهیچی کەم نییە، ژمارەی دەگاتە بلیۆنێك و دووسەد ملیۆن کەس، یان هاوتای پێنجیەکی تەواوی دانیشتوانی سەر زەوی، نە لە بەها و بنەمای کەمە، نە لەو مەبەست و ئامانجە بالآیانەی ئیسلام لێوان لێوە لێیان.

کەواتە، موسوڵمانان تووشی چی بوون؟ چۆن لە ڕەوتی خۆیان لایانداوە؟ چۆن کردەی هاندانی گیانی ئیسلام تێیدا پەکخراوە تا گەیشتە بەو دەستەوەستانی و دواکەوتوویی و لاوازییەی پێی گەیشتووە؟ بۆچی هەوڵەکانی چاکسازیی و پڕۆژەکانی گۆڕانکاریی بەدرێژایی چەندین سەدە سەرکەوتوو نەبوون لە هوشیاربونەوەی موسوڵمانان و راستکردنەوەی ئاراستەیان؟

وەڵامەکە ئەوەیە کە ناکرێت بەهۆی نەبوونی ئارەزووی چاککردن و چاکسازیی ئەوە بەدیهاتبێت، چونکە هەوڵی زۆر بە خەرج دراوە و هێشتاش هەر بەخەرج دەدرێت، بەڵام ئاشکرایە کە فاکتەرەکانی ئاستەنگ و بەربەست دروستکردن و لادان زۆر بوون و ڕیشەکانیشیان قوڵبوون، ڕەوتی ڕووداوەکانیش زۆر خێرابوو، شوێنەوارەکەشی گەورەتر بوو لە توانای بەردەست بۆ بەدواداچوونی، نەیتوانی تێیپەڕێنێت، یان بەشدار بێت لە دیاریکردنی ئارستەکەیدا، ئیتر وایلێهات هەنگاوەکان زیاتر لەو کاردانەوانە نزیکتر بێت کە ڕێگە بە کۆنترۆڵکردنی ڕەوشەکان نادات، هەروەها ڕێگە نادات بەرامانی ورد لە کێشەکان و تێگەیشتن لە سروشت و پێویستیەکانی ربەرەنگاربوونەوەی. هیدایەتی ئیسلام بۆ نەتەوەیەکی دیاریکراو و سەردەمێکی دیاریکراو نییە، بەڵکو هیدایەتە بۆ مرۆڤایەتی بە گشتیی تا کۆتاییهاتنی بوونی مرۆڤ لەم سەرزەوییەدا، کەواتە دەبێتە مافی هەموو تاك و نەتەوە و نەوەیەك کە بەگوێرەی توانا و ئامادەیی خۆی لێی هەڵێنجێنێت ئەوەندەی کەلەتوانایدایە لێی بەهرەمەند بێت.

لەراستیدا سەردەمی هاتنی پەیامەکە سەردەمی بەرجەستەکردن و جێبەجێکردنی بنەما و بەهاکانی بوو لە واقیعی ژیانی مرۆڤدا، بەڵگەو حوجەش بوو لەسەر تێکڕای خەڵکی کە پیادەکردن و جێبەجێکردنی بنەما و بەهاکانی لە برایەتی و حەق و دادپەروەریی و بەرپرسیارێتیی لە ژیانی تەواوی مرۆڤایەتیدا لەتوانادایە. تەنیا ئایدیا و فەلسەفە و خەون و دید و خەیاڵات نییە، وەك ئەوەی فەیلەسوف و حەکیمە ئایدیاڵییەکان دەیهێننە ئاراوە، بەڵکو پەیامێکی حەقە و هیدایەتە بۆ مرۆڤایەتی، بابەتە گشتییەکانی بۆ ڕوون دەکاتەوە و بەو بەها و پرنسیپانەش پشتگیریی دەکات کە ڕێنموونیی هەوڵەکانی دەکەن و ڕێگای بۆ ڕۆشن دەکەنەوە، کارەکانی ڕێك دەکەن و بوونی بە مەبەستی چاکە ڕەنگڕێژ دەکەن، لەوەشدا هەموو مرۆڤایەتی و نەوەکان یەکسانن.

**وزەی پاڵنەری ئیمانیی ژیاریی و کەڵەکەبوونی ماددیی ئاوەدانکاری:**

کاتێك لە کاروانی پاڵنەری یەکەمی ئیسلامی دەڕوانین، لەوەش کە دیدی ئیسلامی و نەوەی سەردەمی پەیامەکە لە قەوارەی ئوممەتی ئیسلامیی و ژیاری ئیسلامییدا لەمێژوودا هێناویانەتە ئاراوە، کە چۆن کاروانی پەیامەکە پاش ئەوە لە واقیعی ئوممەتدا پەکی خراوەو ئاستەنگی بۆ درووست بووە، هێشتا هەر بابەتەکە وا دەبینین کە بەهاکانی پەیامەکە و تێڕوانین و گیانی برایەتی و دادپەروەری و بەخشینو باشێتی ئاستی لە جێنشینێتیدا ، لە واقیعی ئەمڕۆی ئوممەتی ئیسلامییدا پەکیخراوە، یان خەریکە پەکیدەکەوێت. لێرەدا پێویستە لە تێگەیشتنی مێژووماندا، هێزی پاڵنانی جۆری لەلایەك و کەڵەکەبووەکانی بونیادنان و ئاوەدانکاری و کارە ماددییەکان لەلایەکی ترەوە تێکەڵ نەکەین. گەرچی هێزی پاڵنان دەشێت لە کەمبوونەوەدابێت؛ ئەوا کەڵەکەبوونەکانی ئاوەدانی و پیشەکان –بۆ ماوەیەك درێژە بکێشێت– پێویستە ببینین کەبەزۆریی لەزیادبووندایە، بەهۆی فاکتەری کات و هەوڵ و ئەوەی پێشتر هەبووە.

ئەم وێنە شێواوەی تێگەیشتن لە مێژوو بەردەوام دەبێت تا لاوازیی و ستەم و لادان و گەندەڵی لە قەوارەی ئوممەتدا دەگەنە ڕادەیەك کە بنی سەرچاوەکان وشك دەکەن و سەرچاوەکانی گیانی دەستپێشخەری و داهێنان و نوێکردنەوە لەناو دەبەن، ئیتر بونیاتنانەکە وێران دەبێت و پەیوەندییەکان درزی تێدەکەوێت و دامەزراوەکانیش دادەڕمێن و شوێنەوارە دیارەکانی ون دەبێت، تەنها لەوێدا –بەبێ ماندوو بوون– پەیوەندی نێوان لاواز بوونی گیانی پاڵنەر و گەشەو نوێکردنەوە لە لایەکەوە و لادانی کاروانەکە و گەندەڵیی مومارەسەکان و داڕمانی ژیار لەلایەکی دیکەوە، بۆ بینەر دەردەکەوێت. ئەگەر لادانی ڕەوتی ئوممەتی ئیسلامیی لەسەر هێڵی جێبەجێکرانی هەرەباش کە پەیامی ئیسلامیی لەجێبەجێکردندا نەخشاندبووی، دوای غیابی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) و کۆتاییهاتنی سەردەمی وەحی و زووی دەستی پێکرددنی دەوڵەتی نەوەی هاوەڵان ؛ هۆکاری ئەمەش ئەوەیە لە دوای نەوەی سەردەمی پێغەمبەرایەتی و هاتنی پەیام، خەڵکی نوێنەرایەتی پەیامدا بۆ کۆششی

خۆیـان جێهێڵـران، هــەموو نەوەیــەکیش بەسـتراوەتەوە بــەو توانــای تاکەکانییــەوە، بەگوێرەی دەرهاویشتەکانی کات و شوێن و تواناکانیان و, گۆڕاوەکانی بارودۆخیـان و تەحەدیەکانی سەردەمەکەیان.

ئەم کارە لە کاروانی مێـژووی پـەیامی ئیسـلامییدا روون بـوو، پێکـەوەگونجانێکی پێچەوانەیی هەبووە: لەنێوان هێزی پاڵنانی پەیامەکە و جۆرێتی ئەداکردن لەلایەکەوە و، کەڵەکەبوونی سیماکانی ئاوەدانی ئوممەت و کەلەپوورەکەی و دیـاردە ژیارییـەکان تێیدا لەلایەکی دیکەوە. مەبەست لە پێکەوەگونجانی پێچەوانەیی (التناسب العكسي)، ئەوەیە کە بەهێزی هەر یـەکێك لـە لایەنـەکان و گەشـەکردنەکەی، مانـای لاوازبـوونو دابەزینی لایەنی بەرامبەری دەگەیەنێت، بەو مانایەی ئەو کاتەی گیانی ئیسـلام تێیـدا لاواز دەبوو، دەسەڵات فـراوان دەبـوو و پیشەسـازییەکان و ئاوەدانییـەکان گەشـەیان دەسەند. پەیامی ئیسلام لەکاتێکدا بۆ عـەرەب هاتـە خـوارەوە کـە لـە دۆخـی بیابـان نشینی و نەفامیدا بوون، نە دەوڵەتیان هەبوو، نە سیستم، نە ئاوەدانی، نـە زانسـت، نە پیشەسازی، پێچەوانەی ئەوەی کە دراوسـێکانی دوورگـەی عـەرەبی هـەیانبوو، لـە نموونەی ژیارەکـانی فـارس و ڕۆم وهینـدو ژیـارە پێشـووەکانی میزۆپۆتامیـا و وڵاتـی میسر و شام.

لە هەمان کاتدا دەوڵەتەکانی فارس و ڕۆم و هیند و ژیارەکەیان مایـەپوچ بـوون و، نوقمی گەنـدەڵیی و سـتەم و توانــەوە و دارمـان بـوون، ئـەوەبوو پـەیامی ئیسـلام بـە جیهانبینییە گەردوونییـە یەکتاپەرسـتییە پوختـە باڵاکـەی و بـە بـەها و پرەنسـیپ و چەمکە ژیارییەکانییەوە بۆ جیهانیان هات، ئیتر چەندین ئاسۆ فـراوان و، میتۆدگـەلی زانسـتییانەی رەسـەنی ڕەگـداکوتاو کـە بـە بەهەموویانـەوە بناغەگـەلێکی بـەهێز بـۆ پاڵنانی کۆبوونەوەی مرۆیی و کردنـەوەی دەروازەی نـوێ و داهێنەرانـە لـە کایـەکانی زانست و مەعریفە مرۆیـی و گەردوونییەکانـدا پێکـدێنن، بەمـەش نەتـەوەی عـەرەب و لەگەڵیشیدا مرۆڤایەتی، لە نەفامیو ژیـانی سـەرەتایی، لـە گەنـدەڵیی و سـتەمکاری، دەرهێنا بەرەو قوناغێکی نوێ لە ژیار لە مێژووی مرۆڤایەتیدا گواستەوە، ژیارێك کە—

بەیەکتر تەواوکردن و پێکەوە گوونجانەوە— گیان و مادده، عەقڵ و ویژدان و زانست، غەیب و بەرچاو تێیدا بەیەك دەگەن.

کارێکی سروشتیش بوو کە تەوژمی ڕۆحی پەیامی ئیسلامی لە سەردەمی پەیامەکە و نەوەی هاوەڵاندا بەشێوەیەکی بەهێز و بەتوانا دەستی پێکرد، ئەمەش وایکرد دەوڵەتەکەی لەماوەی کەمتر لە سێ دەیەدا جیهانی بە شارستانیبوو ڕابماڵێت. دۆخی ئەو گەلانەشی کە فەرمانڕەوایەتی دەکردن بەشێوەیەکی قووڵ گۆڕی، بەشێوەیەك کە پێشتر لەرووی کاریگەریو گەشەسەندنەوە نموونەی لەو جۆرە نەبووە، هەروەها لە باکوری دورگەی عەرەبی و باکوری ئەفریقیا و خۆرهەڵاتەکەیدا زمانەکانیشیانی گۆڕیی، تا زمانی عەرەبیی قورەیشیی ببێتە زمانی دایکیان.

گەر پاڵنەر و گۆڕانکاریی ڕۆح و عەقڵ و ویژدان لە لایەن ئیسلامەوە مەزن بووبێت؛ ئەوا کارێکی سروشتییە لە جیهانی سەرەتای دورگەی عەرەبیدا کە شوێنەواری ئاوەدانیی لە سەرەتادا سنوورداربوو بێت و بەتێپەڕینی زەمەن و چوونە ناوەوەی گەلان لە ڕۆڵەکانی ئیمپڕاتۆریەت و ژیارییەکانی دەوری ئیسلام هاتنە ناوەوەیان بۆ ئیسلام بەرەو زیادبوون چووبێت و ڕووبەری دەسەڵات فراوان بووبێت و پیشەسازیی و ئاوەدانکردنەوەش گەشە بکەن. بەتێپەڕبوونی کات و بەهۆی ئەو شوێنەواری کەلتوور و نەریت و فەلسەفە و ئایینانەی پێشوو ئەو گەلانە کە چوونەتە ناو ئیسلامەوە هەیانبوو، کارێکی سروشتیی بوو گیانی ئیسلامیی لاواز بکات و پوختی بیروباوەڕەکانی و دیدە گەردوونییەکەی و فەرهەنگ و میتۆدە فیکرییەکانی و سیستەمەکانی دەسەڵات و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیشی گیرۆدەی تەمومژ و پۆخڵیی فیکری بکات و، زۆرێك لە مومارەسەی ستەم و خورافەیشی پێوە پەیوەست بکرێت، بەمەش فیکری گەلانی موسوڵمان و سیستەم و مومارەسەکانیان ببنە تێکەڵەیەك لە بنچینەکانی ئیسلام و لەگەڵ ئەو فەرهەنگ و کەلتوورەی پێشتر هەیانبوو، ئەوانیش هەڵسوکەوتەکانی رابردوویان و کەلتوور و نەریت و دوژمنایەتیی و ڕەگەزپەرستییانە.

**لاوازبوونی وزەی ئیمانیی ئەخلاقیی چۆن دەستی پێکرد؟**

مێـژوو بەشـێوەیەکی دڵنیاکـەر بۆمـان بـاس دەکـات، کـە سـەرەتاکانی لادان لـە سەردەمی پاش هاتنی وەحـی دەرکـەوت، بـەجۆرێك کـە ئـەو هاوەڵانـەی پـاكو سـاغ بووبوونەوەو خاوەن ئامانجـەکانی بـاڵا و مەبەسـتەکانی بێگـەرد بـوون، چـیتر ئەوانـە زۆرینەی سـوپای دەوڵـەتی خیلافـەت و پاسـەوانانی سیسـتمەکەی و چـەقی بنەڕەتـە سیاسییەکەیان پێك نەدەهێنا.

ئـەو گۆڕانکارییـە جەوهەرییـەی عەرەبـە دەوارنشـینەکان تێیـدابوون بـە سـوپای خیلافەت و بنکە سیاسـییەکەی، هـەر ئـەو بـوو خیلافـەتی دوای سـەدەی سـەردەمی ڕاشیدینی بۆ "پادشانشینی زۆردار–ملك عضوض– گۆڕی"، کە زۆرێك لە لایەنـەکانی لەسەر ڕێساکانی زەوتکردن و ملکەچکردنی ڕەگەزپەرسـتیانەی خێڵـەکی دامـەزرابوو. ئـەوەش کـەدواتر بەتێپـەڕبوونی ڕۆژگـار لـە (شـعوبییەت) و فەلسـەفە و ئەفسـانەکان توشی ئومەتو ڕۆشنبیریەکەی بوو، قورەکەی خەستترکردەوە. لەبـەر ئـەوە شـتێکی ئاسایی بووە کە نەوەکانی پاش سەردەمی وەحی بەدرێژایی چەندین سەدە سەبارەت لە ڕادەی وەرگرتنی پەیامەکە و ئەو وزەیەی هەیانبوو بۆ هەڵگرتنی پەیامەکە و سوود وەرگـرتن لێـی بـەگوێرەی ئـەو بـارودۆخ و هەلومەرجـەی پێیـدا تێپـەڕیوە، هـەروەها بەگوێرەی توانای گۆڕانکـاری و گونجانـدن و ئیجتیهـاد و نوێکردنـەوە، بـەجۆرێك کـە بەدەم خواستەکانی هیدایەتی پەیامی ئیسلام و بنەما و بەها باڵاکانییەوە بێن و لەژێر تیشـــکی ئـــەوەی ڕووبـــەڕووی ئومـــەت دەبێتـــەوە لـــە قۆناغـــە جیاوازەکـــانی بەرەنگاربوونەوە جیاواز بن.

لە گرنگترین هۆکارەکانی لادانی خێرا لە جیهانبینیی گەردوونیانەی ئیسلام و بەها و بنـەما باڵاکـانی و ئـەوەی بەهۆیـەوە هاتـە ئـارا لـە ڕووخـانی سیسـتمی خیلافـەتی ڕاشیدین، کەموکورتی هەوڵەکان بوو لـە دووبـارە پەروەردەکردنـەوەی ڕۆڵـەکانی ئـەو هۆزە دەوارنشینانەی سوپای فەتحی ئیسلامییان پێکهێنا لەکاتێکدا نەوەی پەیامەکـە و هاوەڵان کەمبوونەوە و باڵادەستییان لە سوپای دەوڵەتـدا لاواز بـوو، هـەروەها ئـەو

ڕووداو و گۆڕانکارییە گەورانەی کە بەهۆی هاتنە ناوەوەی گەل و هۆز و نەتـەوەی زۆر بۆ ناو ئیسلام لەگەڵ خۆیدا هێنای، کـە بـەهوروژم و خێراییـەکی یـەکجار زۆر کـە لـە سەرووی توانای دەوڵەت و نەوەی هاوەڵاندا بـوو لـەوەی بتـوانن چارەسـەری بکـەن و ڕووبەڕووی خواستەکانی ببنەوە، لە "پەروەردە" و گۆڕانکاریی.

سەربازانی هۆزەکان و دەوارنشینەکان، خاوەنی هێز و توانـا و ئازایـەتی بـوون لـە جیهـــاد و بـــەرگریکردن لەســـنوورەکانی موســـوڵمانان، بـــەڵام دەرفـــەتی پەروەردەکردنـەوەیان نەڕەخسـا، لەبـەر ئـەوە سروشـتی سـوپا و سروشـتی گـەل و سروشتی بنەمایی سیاسیی گۆڕا، تا ڕۆژگار بە ڕووداوگەلێکی کۆدەتای خێرادا گوزەر بکات، ئیدی سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدیی دەبوو نەمێنێت و شێوازی فەرمانڕەوایی و ڕێکخستنەکەی کۆتایی بێت، و تا لە کۆتاییدا بگاتە دەستی فـەرمانڕەوایانی نـوێ – کەلەچوارچێوەی پەیکەری بونیاتی کۆمەڵگای ئیسـلامو دامەزراوەکانیـدا– زۆرێـك لـە بۆماوەکانی ئەو چەمك و نەریت و تاریکیی و ڕەگەزپەرستیی و دەمـارگیری هۆزایـەتی و شعوبگەراییانە جێبـەجێ بکـەن، کـە تێیانـدا پێگەیشـتبوون و لەسـەری پـەروەردە بووبوون.

بەمشـێوەیە بـەهۆی گـۆڕانی ڕێسـای سیاسـی و سـەربازییەوە کاروبارەکـان بـۆ پادشـایانی بـەنی ئومەییـە یـەکلا بوویـەوە، ئـەوەی بێبنـەمای ئـەو لادان و هەڵانـەی دەدرێنە پاڵ خەلیفە عوسمانی کوڕی عەفان، یـان خەلیفـە عـەلی کـوڕی ئـەبو تاڵیـب (ڕەزای خوایان لێبێـت) دەردەخـات ئەوەیـە کـە ڕشـێوازی فـەرمانڕەوایی موعاویـە و سیستەمی ئەو دەسەڵاتەکەی کە چەند هێندەی ئەوەی کە دراوەتە پـاڵ خەلیفـەکانی ڕاشیدین هەڵەی ئـەنجام داوە. لەگـەڵ ئەوەشـدا کارەکـە بـۆ معاویـە یـەکلا بوویـەوە، ئەمەش ئەوە دەردەخات کەجگە لە گۆڕانی بنکەی سیاسـی و سـەربازیی کـە سـوپای فتوحاتەکان لـە عەرەبـە دەشـتەکییەکان و کۆمەڵـەکانی تیرەکـان پێکهێنرابـوو هـیچ لێکدانەوەیەکی تر دەڵناگرێت.

لەراستیدا ئەو ڕووداوە مێژووییەی کەخۆی لە داڕمانی سیستمی خیلافەتی ڕاشیدینیدا بینییەوە –لە میانی دەرهاویشتەی ڕووداوەکانی ئەو سەردەمەدا– یەکەمین کەلێنی لە دەوڵەتی ئیسلام و سیستمەکەیدا دروستکرد، بەهەموو ئەو شوێنەوارە عەقیدەیی و سیاسی و کۆمەلآیەتی و ئابوورییەی کەلەگەڵ خۆیدا هێنای‌و تووشی گیان و دیدی ئیسلام کرد، بێگەردیی بەها و پرنسیپەکانی خەوشدار کرد، لەکاتێکدا کە دەسەلآتی دەوڵەتی موسوڵمانان بە فەتحکردن مەزنتر دەبوو، فتوحاتەکانی فراوانتر دەبوون، ژمارەی خەڵکەکەی لە خاوەن پیشە و هونەری ژیار و ئەو ئیمپڕاتۆریەتانەی کە لە باکووری دوورگەی عەرەبی و وڵآتی فارس و هیند و ڕۆمدا هەبوون زیادیان دەکرد.

**سیاسەت و ڕەوشت و ئایین: دابەشبوونی سەرکردایەتی و دروستبوونی قوتابخانەی تیۆری:**

کاتێك بەدواداچوون بۆ ڕەوتی ئاڕاستەی فیکری و بیروباوەڕی ئوممەت دەکەین، لەگەڵ پەرەسەندنی ئەو ڕووداوانەدا؛ ئەوا دەبینین کە نەوەی یەکەم پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) خۆی پەروەردە وپاکخووی کردوون، وەحی خوداییش ئاڕاستەکردن و ڕێنماییکردنیانی لەخۆ گرتبوو، لەبەر ئەوە خاوەن دید و گیان و توانایەکی بالآی ژیاریی بوون کە ئاوێتەی ئەو هێز و بوێری و شکۆ و ڕێزە بوو کە تیرەکانی عەرەبی لەسەری ئافرێنرابوون، بەمەش نەوەیەکی کارای شارستانیی هێنایەئاراوە، مەزنیی دەستکەوتەکانیشی بەقەدەر سەلامەتی پێکهێنانە پەروەردەییەکەی و بالآی چەمکە عەقیدەیی و سیاسییە ئەخلاقییەکەی بوو.

بە کەوتنی خیلافەتی ڕاشیدین و زاڵبوونی سەرکردەکانی هێزە خێڵەکییەکان، ڕۆڵی سەرکردایەتی پیاوانی قوتابخانەی سەردەمی وەحی کەوتە کەمبوونەوە، پێگەیان وێرا دەکرا و لەناو دەبران، وردەوردە و دوای سەد ساڵ لە ململانێی خوێناوی، کار گەیشتە پەراوێزخستنی ڕۆڵی سیاسییان، پاشان دوای ئەوە پلەبەپلە گۆڕان بۆ گروپێکی تیۆری قوتابخانەیەکی گۆشەگیر لە مزگەوت و گۆشە و

قوتابخانـەکان، پـاك و دونیانەویسـت، لەکاتێکـدا ئاکـار و نەریتـە خێڵـەکی و نەتـەوە پەرستانەییەکان لە زیادبووندا بوون، ڕق و کینە ڕەگەزپەرستانەکان گەشەیان دەکرد، لـەرێی ئەمەشـەوە گیـانی خۆسـەپاندن و سـتەمکاریی بـەهێز دەبـوو، بوارەکـانی بەفیرۆدان و گەندەڵیش فراوانتر دەبوون.

لـەپاڵ زیـادەڕەوی زانایـان لـە گۆشـەگیرییەکەیاندا، لەکاتێکـدا کـە میراتگـری قوتابخانەی سەردەمی وەحی بوون، کارێکی سروشـتی بـوو پەیوەنـدییان بـە واقیعـی کۆمـەڵگا و گۆڕانـەکانیو توانـای بـوونی کاریگـەری دروسـتکردن لەسـەر ڕەوتـی سیاسـەتەکانی و مومارەسـەکانی و نوێکردنـەوەی دامـەزراوەکانی لاواز ببێـت، بـەڵکو کاریگەریەکەی لەسەر فیکر و میتۆدەکانی فەرهەنگیشـیان دەردەکـەوێت، تـا توانـای نوێکردنەوە و ئیجتهادیان لاواز دەکات و قوتابخانەکانی شارەزایی و کار دەگۆڕێت بـۆ قوتابخانـەکانی ڕاوبۆچـوون، پاشـان قوتابخانـەکانی ڕاوبۆچـوونیش دەگـۆڕێن بـۆ قوتابخانـەکانی دەق، قوتابخانـەکانی دەقـیش بـە قوتابخانـەی دۆگمـابوون و تەقلیـد کۆتاییان دێت.

بەهۆی نەیاربوونی زانایـان و ڕووناکبیران و پەراوێزخسـتنیان لەلایـەن دەسـەڵاتی سیاسـییەوە، چـەند گرووپێـك لـەو نوخبـە زانسـتییە قوتابخانەییـە (فەیلەسـوفەکان) بەدیلێکی فەلسەفییان تەبەنی کـرد کـە لـە کـەلتوورە هاتووەکانـەوە هەڵیـدەگۆزێت، بەبێ بوونی میتۆدێکی گشتگیری تەندروست کە درك بە تایبەتمەندییەکانی ئوممەت و پێکهاتـەکانی دیـد و عەقڵییـەت و سـایکۆلۆژییەتی عەقیـدەییو ژیارییەکـەی بکـات، بەمـەش خۆیـان و لەگەڵیانـدا بەشـێکی گرنگـی فیکـر و جـەماوەری ئیسـلامی لـەرێی فەلسـەفە و زانسـتی کـەلام و گروپـەکان و تەسـەوفی بیانییـەوە تێکـەڵ بەسەرلێشێوانەکانی ئیلاهیاتی میتافیزیکی گریك و گومڕایی و لادان و پرسیار و وڕێنە و لۆژیکە وێناییەکەی ببێت.

لەهـەمان کاتـدا زانایـان و سەرڕاسـتانی کـەلتووری سـەردەمی وەحـی بـەرەو دۆگمابوونی دەقگەرایی زانست و زانیارییـە فیقهییـە شـەرعییەکان چـوون، سـێیەمین

گۆشە خۆی لەتەشەنەکردنی گەندەڵیی دەستەی فەرمانڕەوا و نەزانیو ستەمکاریدا بینیەوە، بەوەش دەستەبژێریی سیاسی –بە گۆشەگیرکردن و دابڕانی پیاوانی زانست و شەریعەت– پشتیوانی و بنکەی خۆی لەدەستدا، چیتر بنچینەیەکی فیکریی فەرهەنگی نەما کە پشگیری بکات و بەرچاوی ڕوون بکاتەوە، بەمەش ئوممەت لە دارمان و چەقبەستن و ستەمگەریدا نوقم بوو، زۆرینەشی خۆی ڕادەستی سۆفیگەرێتییەکی فەلسەفییانەی حلولییانە (یەکێتی بوون) یانەی بێبنەما کرد، زۆربەی ئەو وزە ژیارییەی کە تێیدا مابوو خامۆش کردو ڕادەستی بێئاگایی و ملکەچی و نەرێنیبوونی کرد.

هەموو ئەوەش بەهۆی ستەمگەریی فەرمانڕەوایانی ئوممەت و دەستەبژێرە سیاسییە فەرمانڕەواکەیەوە بووە مایەی قووڵکردنەوەی تیرۆری ماددی، کە دەستەوەستانیی ئوممەتی لە ڕووبەڕووبوونەوەی گۆڕانکارییەکان و بێدەسەلاتیی لە بەرهەڵستی تەحەدداکان چەسپاند، ئیدی لەپێناوی پارێزگاریکردن لە دەسەلات و بەدیهێنانی سەقامگیری و مانەوەی خۆی تۆقاندنو ستەم و تیاچوون و لەناوبردنی هەموو بەرهەڵستکار و ئۆپۆزسیۆنێك بوو بە تاکە ڕێگای دەستەبژێری فەرمانڕەوا.

بەلام دەستەبژێری ڕووناکبیری شەرعی –بەهۆی پاشەکشەی توانا زانستییەکانیەوە و لاواز بوونییان لەبواریپڕاکتیکە کرداریدا و خۆ دوورگرتنیان لەئاشنابوونی ڕێباز و سروشتی شتەکان و ڕووداوەکان– وایلێهات کە پتر لە قوتابخانەی پیشەکاریی پەراوێزخراو دەچوو، چونکە بەگشتی جگە لە ئاڕاستەکردنی کاروبارەکانی ژیانی تاکەکەسی و سەرقاڵبوون بەئەرکەکانی فەتوا و قەزاوەت و پێشنوێژیی مزگەوتەکان هیچ ڕۆڵێکیان لە کۆمەڵگادا نەمابوو، بۆیە دەبووایە بۆ ئەنجامدانی ڕۆڵەکەیان پەنا بۆ ترسان و تۆقاندنی ڕۆحیی بەرن، پیرۆزیش بدەن بە گوتەکانیان و بارگاویکردنیان بکەن بەهێما ودەقی دەگمەن، تا وایلێهات نەدەکرا هیچ پێیەك هەڵبنێیت و هیچ هەنگاوێك بنێیت بەبێ بوونی بەڵگەیەك کەدەقی لەسەر بێت و پێشتر فەتوا و مۆڵەتی درابێت.

**شوێنەوارەکانی پەرتەوازەبوون و دارمانی دامەزراوەکان و ونکردنی ڕەهەندی دەستەجەمعی:**

بەمشێوەیە کارەکە ئوممەتی گەیاندە دارمانی دامەزراوەکان و باڵادەستی دەستەبژێرێك، و وایلێهات موسوڵمان بووە تاکێك -لەڕووی دەروونی و ماودییەوە، لە هەموو لایەکەوە- بەرەوڕووی تۆقاندنی سەرکوتکاری سیاسیو گوتاری ترسێنەری ئایینی دەبوویەوە، بۆ ئەوەی تاکو لەگەڵیشیدا هەموو ئوممەت بەرەو خۆویستی و نەرێنییبوون ببات، هەرچی هەیبووە لە پاڵنەرەکانی کاری باش و ئاوەدانی و شارستانییەت لە دڵ و خەیاڵی تاکو ئوممەتدا نەهێڵێت.

قوڕەکە خەستتر بوویەوە کاتێك نوخبەی فیکر بەشێوەیەکی زانستییانەی کارا ئاگای لەوە نەبوو کە ڕێگای سەرکەوتووی چاکسازی و گۆڕانکاری سەرەتا لەناو ئوممەت و کۆمەڵگاوە سەرچاوە دەگرێت، بە کرۆکی خود و کانگای فیکر و ویژدان دەست پێ دەکات، کە ئەویش سەرلەنوێ پەروەردەکردنە، بەوەش ڕێگاکەیان ونکرد، کاتێك وا گومانیان برد کە ڕێگای ڕیفۆرم بریتییە لەڕێگای جەنگ و ململانێ و توندوتیژی، ئەوەش سەقامگیری ئوممەتی خستە هەژاند و ڕایەڵە کۆمەڵایەتییەکەشی پچڕاند و توانای هۆکارەکانی ستەم و سەرکوتکاریی و بێدادیی و پەرتەوازەیی زیاتر کرد[1].

ئا ئەوەیە وێنە گەورەکەی ڕەوتی مێژووی ئوممەت و پەیوەندییە پێچەوانەییەکانی؛ کە بەو سیستی و خاوی و نەرێنی و پەرتەوازەیی و لاوازییەی گەیاند کە تێیدا دەژی. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت ئاگامان لەوە بێت، کە حاڵی ئوممەت لە زۆرێك لە ساتەوەختەکانی مێژووەکەیدا -دۆخی زۆرێك لە وڵاتەکانیشی- لەخراپێتیدا وەك یەك نەبوون، بۆ نموونە گەر لە وڵاتێك لە وڵاتەکاندا لە دارماندا بێت؛ ئەوا لە وڵاتێکی دیکەدا حاڵی باشترە.

---

[1]. أبو سليمان، عبدالحميد. العنف و إدارة الصراع السياسي في الفكر السياسي الاسلامي بين المبدأ و الخيار: رؤية إسلامية. دمشق و هرندن: دار الفكر و المعهد العالمي للفكر الاسلامي، ٢٠٠٢م.

ئــەوەتا لەکاتێکـدا کـە مەشـخەڵی گیـانی عــەرەب خــامۆش بـوو، شــوێنەواری موسوڵمانان لە وڵاتی ئەندەلوسدا سڕدرایەوە، وزەی ئیسلام لە نوێوە لەسەر دەسـتی هۆزێکی تورکەکان گیانی دێتەوەبەر، کە بە خۆڕاگری و ئازایەتییانــەوە هاتبوونـە نـاو ئیسلامەوە، کە بە گیانی ئازادی و پشتیوانی پشتگیری کرابوو؛ تـا ئیسـلام لـە وڵاتـی ئەنادۆڵدا ڕەگ دابکوتێت و تێیدا خونچەکانی دەوڵەتی عوسمانی بڕوێن.

گەر وزەی فیکر و داهێنان لای ئوممەت بەهۆی پاشەکشەی شارستانێتی تێیدا بـۆ دواوە گەڕابێتەوە؛ ئەوا ئەمە نەبووە ڕێگر –تەنانەت لە چاخەکانی زیادبوونی ململانێ و پەرتەوازەیی و داڕمانیشدا، بەڵکو لەوانەیە بەهۆی ئەوەوەو ئەو بەرەنگاربوونـەوەی لەخۆی گرتووە– لە دەرکەوتنی بلیمەتانێکی فیکری زانستی و چاکسازیخواز جیـاواز، لەوانــەش غــەزالی و ئــیبن حــەزمو ئــیبن ڕوشـد و ئــیبن تەیمیــەو ئــیبن خەلـدوون لــە بوارەکانی زانستەکانی ئایین و شەریعەت و کۆمەڵناسی، زۆرێکی دیکەیش لە کایەکانی زانســتە فەلســەفی و فیزیــایی و پیشــەکان و هــی تــریش، ئەمــەش شــوێنەواری ئــەو بنەڕەتەی هێـزی پاڵنـەرە کـەماوە، لـە لایەنـەکانی بەدەمـەوە هـاتنی تەحـەدداکان و بەرەنگاربوونــەوەی ئافـاتو نەخۆشـییەکان، هــەروەها ئــەو پاڵنــەرەی چاکســازیی و ئاوەدانکــاری کــە دڵــەکان لەســەری دروســتکراون، ئەوانــە دیاردەگــەلێکن هێشــتا شوێنەواریان تـا ئـەمڕۆ لـەگیانی ئوممـەت و خولیاکـانی و تەقینـەوەکانی تـووڕەیی و هەوڵەکانی چاکسازیدا دەبینین.

بەڵام ئەمە لە سروشتی وێنە گەورەکەی مێـژووی ئوممـەت و کاروانـە ژیارییەکـەی ناگۆڕێت، کە لە بەرەی جیاوازەوە پاڵی بە مێژووەوە دەنا، بەجۆرێك کە ببێتە مایەی سستبوونی پاڵنەری گیانی ئیسـلام و خامۆشـکردنی وزەکـەی و لێڵکردنـی بێگـەردیی تێڕوانینە گەردوونییە ژیاری و گشتگیرییەکەی، بەشـێوەیەك کـە ڕیـزی موسـوڵمانان تێکبدەدات و گەندەڵی و ستەمکاریی لە بوونییدا بەهێز بکات و سستی و نـەرێنیبوون گـیرۆدەی گەلــەکانی بکـات و تێکـڕای ڕۆڵـەکانی بـۆ بکـات بـە مێگـەل، کـەگیانی

دەستپێشـخەرییان تێـدا نـەمێنێت و تـەنها خواسـتیان پارووەنانێـك و سـەلامەتیی جەستەیان بێت.

پێویستبوو کەئوممەت لە بێ هۆشییەکەی بێداربێتەوە، نەنگییەکانی و ڕادەی ئەو وێرانکارییەشی کە تووشی گیانی بووە بۆ ئاشـکرا ببێـت، سـەرەڕای بـەرگریی رۆحـی ئیسلام تێیدا بەدرێژایی چەندین سەدە؛ کاتێك دوژمنگەلێکی نەیار و نەتەوەگەلێك کە خاوەنی توانای ژیـاری و کارامـەی مـاددی و تـەکنیکین هاتنـە مەیدانـەوە لـەدژی کـە میتۆدی زانستی و وزەی دەروونی داهێنەرانە وتەقەنیانە پشتگیرییان دەکات، ئیـدی داگیرکەران و کۆلۆنیالیستەکان و هەروەها فەرمانڕەوایانی ئوممەتیش دەستیان بـەوە کرد گەلانی ئوممەت بە چەشنی لەناوبردن و ستەم و سوکایەتیی ئازار بدەن.

ئەگەر ئێمە لەم چەند لاپەڕەیەی ڕابردوودا باسی وێنە گەورەکەی ڕەوتی پاشەکشێی پاڵنەری ڕۆحی شارستانییەتی ئوممەتمان کردبێت، لەوەی کە ئەو ڕۆحییەتە لە سەردەمەکانی پێشتردا لەئاستی بەرز و بەرەوپێشچوونی ئاوەدانیی بەدەستی هێنا بوو. ئەوەی ئەمڕۆ داواکراوە؛ ئەوەیە کە بزانین بەدیاریکراوی ئەو گۆڕان و لادانانە چین کە لە هزری ئوممەتو دەروون و ویژدانیدا روویانداوە، کاریگەریی ئەوەش لەسەر مرۆڤی موسوڵمان وەك تاك و کۆمەڵ، تێگەیشتن لەڕووەکانی کەمتەرخەمی کە بەشداربوون لە پێبەستکردنی هەوڵەکانی چاکسازی، تا پاش ئەوە توێژینەوەکە ببێتە هەوڵێکی بەشداریکردن لە چارەسەرکردن و تەواوکردنی کەرەستەکانی؛ تاوەکو ئوممەت ڕێزو پێزانینی مرۆڤایەتی بەدەست بهێنێت و کەسانێك بدۆزێتەوە گوێ لەو بەها بەرزو بەربەستە رۆحیو ئەخلاقیانە بگرێت کەدەیانخاتە روو.

**یەکەم: شێواندن و لادانەکان لە هزر و ڕۆشنبیریی ئوممەتدا:**

پرسیاری گرنگی ئێستا ئەوەیە، گرنگترین ئەو شێواندن و لادانە فیکریو رۆشنبیریانە کامانەن؟ بۆ وڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، دەتوانین شەش جۆر لەو لادانانە لە چەند پەڕەیەکدا ڕوون بکەینەوە:

**شێواندنی یەکەم: شێواندن تێڕوانینی هەمەکیی (تشوه الرؤية الكلية):**

یەکەم شێواندن و مەترسیدارترینیان، بریتییە لە شێواندنی ڕوانینی گەردوونیانەی ئیسلام، کە چوارچێوەی هزر و ڕۆشنبیریی ئوممەت پێکدەهێنێت، بەشێوەیەك کە وەك تێڕوانینێکی گەردوونی یەکتاپەرستی ئەرێنیی گشتگیری نەمایەوە کە بتوانێت بەڵگە و ڕێنیشاندەرێکی هەمەکی هزری موسڵمان و ویژدان و پەیوەندی و ڕێکخستنەکانی بێت.

ڕوانینی گەردوونییانەی ئیسلام بۆ مرۆڤ، لە سێ بابەتی سەرەکیی گشتییدا پوخت دەبێتەوە، ئەوانیش:

- غەیب: باوەڕبوون بە خالقییەتی خوای تاك و بێ هاوەڵ.
- ژیان: هەستکردن بە بەرپرسیارێتی، ویستنی خێر و دادپەروەریی، هەوڵی چاکسازی و ئاوەدانکاری.
- لەڕۆژی دوایی‌و سەرەنجام: ڕووبەڕووبوونەوەی چارەنووس، سەرئەنجامی کردەوەکان –بە بەخشندەیی خوا– بەشێوازی پاداشتی دادپەروەرانە دەبێت، "ئەگەر کردەوەکان چاك بن، چاکە دێتە دەست، ئەگەر خراپ بێت ئەوا خراپ دەبێت".

بۆیە دەبینین ئیمان و کردەوەی چاکە –لە ڕوانینی گەردوونیی قورئانیدا– لێك جیانابنەوە، مەبەست لە ئیمان کردەوەی چاکەیە، کردەوەی چاکەش بریتییە لە بەگەڕخستنی هەموو ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ، جیاوازی نییە لەنێوان کارێك و کارێکی تردا، تەنانەت یە تۆزقاڵیش، ئەوەی بڕیاری لەسەر دەدات، جۆر و ڕەهەندە ڕۆحییەکەیەتی لەسەر بنەمای مەبەستی چاکە لێی و هەوڵدان ڕێکو تەواو ئەنجامدانی. بۆیە بەڵێنی خوای گەورە بەسەرکەوتن بۆ بەندە ئیماندارەکانی؛ وابەستەیە بە ئیمانەوە، ئەو ئیمانەی کردەوەو چاکەی لەگەڵ بێت، ئەو کردەوە چاکانەش ڕۆحی ئیحسان و پاکوتەواوی و تێکۆشانی لەگەڵ بێت.

تەنها نیاز (نییەت) بەس نییە تاوەکو شایەنی جێنشینییەتی و بالادەستی زەوی بن، نییەت پاداشتی دوارۆژی بۆ هەیە، بەڵام بالادەستی و جێنشینایەتی لەسەر زەوی و سەرکەوتن لە کاروباری دونیادا مەرجدارە بە کردەوەی چاك و جوان و تێکۆشانەوە، ئەمە ئەوە ئەو میتۆدەیە کە ڕێنیشاندەرە بۆ ڕووی ڕاست و ڕاستەقینە لە جێبەجێکردنی کردەوەکاندا، بۆ سازاندن و سەرکەوتن لە کاروبارەکاندا، دەفەرموێت: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ﴾ [سورة النور: ٥٥]. واتە: خودا

بەڵێنی دڵنیابەخش و تەواوی داوە بەوانەی باوەڕیان هێناوە لە ئێوە و کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە بە ڕاستی لە ئایندەیەکی نزیکدا جێنشین و پایەداریان دەکات لە وڵاتدا هەروەك چۆن ئیماندارانی پێش ئەمانی جێنشین کردووەو ئەو دین و ئاینەیان بۆ دەچەسپێنێت خوا خۆی پێی ڕازیە...

ئەم ڕوانینە گەردوونییە گشتگیرە ڕوونە لەسەر دەستی زۆرێك لە بیرمەندانی قوتابخانە پەراوێزگیرە خۆ دوور گرە یەکلابووەکان بۆ لێکۆڵینەوە و رامانو توێژینەوە تیۆرییەکان، کە تەرکیزیان لەسەر چەند حاڵەتێکی کەسانێکی کەمی کۆمەڵگاو پێداویستەکانیەتی، توشی شێواندنێکی مەترسیدار بوون، –بە هەموو ئەو نییەتە باشانەی کە بەو ماوە دورو درێژە هەیانبووە– بەشداری کردووە لەپووکانەوەی ڕۆحی ئیسلام و هێزی پاڵنەری ڕوانینی ئوممەت، بووە هۆی ئەوەی بکەوێتە دەست خۆرەی دواکەوتن تا ئەوەی ویستی هەبوو پێی کرد، بەشێوەیەك کە وزەی نوێبوونەوەی خامۆش کرد، ئوممەتی دایە دەست دۆخێکی نەرێنی و نەمانی کێش کەتێیدا هەموو ویستێکی گەڕان و بژارکردنو نوێبوونەوەو هاندان بکوژێتو، دەرون و ناخی خۆی بداتە دەست نشێوەکانی شوێنکەوتنو لاساییکردنەوە، کە مانای دەستەجەمعیی ئوممەت و دەستار بۆ یەکگرتنی وێران بکاتو، دامەزراوەکانی بڕوخێتو یەکپارچەییەکەی پارچەپارچە ببێت.

ئەمە بەروونی لەو ڕوانینانەدا دەبینین کە زانستی فیقهـ و کەلام پێشکەشیان دەکات، هەر بەوانە بناغەی پێکهاتەی پەروەردەی دەروونی تاکی موسوڵمانی بونیادنراوە، ئەوەش –لەکرۆکیدا– ڕوانینێکی تاکە کەسییە نەك ڕوانینێکی دەستەجەمعیی، ڕوانینێك لەسروشتی پەیوەندی نێوان زانایان و خەڵکیی گشتییدا سەرچاوەی گرتووە، پەیوەستە بە کاروباری تاکەکەسییەوە نەك کاروباری گشتی، یان بەو رسیستەمو بنەمایانەی کەبەرێوەی دەبەنو سروشتی پێکهاتەیانو پەیوەندییەکانیان، لەمجۆرە تێڕوانینانەو ئەم هزرەدا پەروەردەو بەشداری سیاسی و

پەیوەندییــە کۆمەڵایەتییــەکان کاروبــاری حــوکمڕانی و پێوەرەکــانی برایــەتی و دادپەروەری و ڕاوێژکار هیچ رۆڵێکیان لە بەڕێوەبردنی ژیانی گشتیی ئوممەتدا نابێت.

بەهۆی ئەمەشەوە، لەکۆتایی ڕێگاکەدا ڕوانینێکی نەرێنی دەبێت کەهیچ کارلێکی لەگەڵ هەموو و ڕەهەندەکانی ژیان نابێت و پێی کاریگەر نابێت و چاودێریی رەوت و گۆڕانکارییەکانی ناکات و نابێتە پاڵنەری ئاراستەی ئەرکە شارستانییەکەی.

خـەمی ئێسـتا و کـاری سـەرقاڵکەری ئـەو کەسـەی خـۆی لـە مزگەوتـدا گۆشـەگیر کـردووە سـەرقاڵبوونە بەگوزارشـت زاراوەی تێـڕوانینی قورئـانی سـەبارەت بـە: ویـرد "الذکر"، سروتەکان"الشعائر" هاتووە، و لە لـۆجیکی ئـەو کەسـە دابڕاوانـەدا ویـرد و وانـەی مزگەوتـەکان تـەنها لـە پەرستشـەکاندا قـەتیس بـووە، وەك ئـەوەی زاراوەی زانسـتی فیقـه گوزارشـتی لێکـردووە، جـا خۆیـان بـە ورد و درشـتی هـەموو جووڵـە و وەستانێکیەوە خەریك کردووە, لەو ڕووەوە بۆ چـەندین قوتابخانـە و مەزهـەب دابـەش بوون و بوونەتە چـەندین گـرووپ و دەسـتە، خۆیـان یەکلاکردووەتـەوە بـۆ کاروبـاری ژیـانی تـاك, نـەك کاروبـاری ژیـانی گشـتی یـان سیاسـی و، زاراوەی مامەڵـەکان "المعاملات"یان لەمە ناوە، وەك زانستی فیقه گوزارشتی لێکردووە.

مەبەسـت لـە مامەڵـەکان (موعامـەلات) کـۆی چارەسـەرەکان و پێودانگـە فیقهیـە یاسـاییەکانە بـۆ کاروبـاری مامەڵـەی ژیـانی تـاکی موسـوڵمان، لەگـەڵ ئـەو ڕێسـا و گرێبەستانەشی کە پەیوەستن پێیانەوە.

ئەمــەش خەریکـە تـەواو دادەبـڕێ لـە ڕەهەنـدی ڕۆحـی، چـونکە بەجێگەیانـدنی هەرمامەڵەیەك یان نەکردنی کارێکی دونیاییە و ئەنجامدانی بە پاداشـتەوە پەیوەسـت نەکراوە، بۆیە بە وازلێهێنانی و جێبەجێ نەکردنی هیچ گوناه و سزایەکی پێناگات.

ئەم ڕوانینە فیقهییـە و ئـەوەی جێـی گرنگـی پێـدانێتی، بەتـەواوەتی جیـاوازە لـە ڕوانینــە قورئانییەکـە کەبـەڕوانینێکی هەمـەکی لـەمرۆڤ دەڕوانێـت، جیـاوازی ناکـات لەنێوان بەرپرسیارێتی تاك لـە پاراسـتنی گیـان و بەرپرسـیارێتییە کۆمەڵییـەکانی لـە پاراستنی کۆمەڵگا و ئوممەت، ڕەهەندە ڕۆحییەکەشی هەموو کارو کردەوەکانی مرۆڤ

دەگرێتەوە، هەموو کردەوەکانیشی بەبێ جیاوازی بەگوێرەی مەبەست و ئامانجەکەی پەرستشە، تەنانەت ئەگەر ئەو کردەوانـەش هاوسـەرگیریو چـێژی دەروونـیش بێـت. چونکە ژیانی مرۆڤی موسـوڵمان لـە بـەگوێرەی تێـڕوانینی قورئـان هـەمووی ویـرد و جیهادە، تێکڕای پەرستش و عیبادەتە.

ژیانی موسوڵمان لە نوێـژ و پاڕانـەوە و ڕۆژوو زەکـات و قورئانخوێندنـەوە و بـەرز ڕاگرتنی سرووتەکان و جێبەجێکردنی مەناسیکەکان ویژدانی موسوڵمان دەژێنێتـەوە، هانی دەدات ئەرکـەکانی بـە ئەمەکدارییـەوە جێبـەجێ بکـات پابەنـد بێـت پێیانـەوە: ﴿إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدْنِي وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي﴾ [سورة طه: ١٤]، ﴿فَاذْكُرُوا اللَّهَ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ وَاذْكُرُوهُ كَمَا هَدَاكُمْ وَإِنْ كُنْتُمْ مِنْ قَبْلِهِ لَمِنَ الضَّالِّينَ﴾ [سـورة البقرة: ١٩٨]، ﴿وَاذْكُرُوا اللَّهَ فِي أَيَّامٍ مَعْدُودَاتٍ فَمَنْ تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَنْ تَأَخَّرَ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ لِمَنِ اتَّقَى وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ [سـورة البقـرة: ٢٠٣]، ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَنْ تَزَكَّى (١٤) وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّى﴾ [سـورة الأعلـي:١٤-١٥]، ﴿فَإِذَا أَمِنْتُمْ فَاذْكُرُوا اللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُمْ﴾، [سورة البقـرة:٢٣٩]، ﴿إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ﴾ [سورة العنكبوت:٤٥]، ﴿وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَنْ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا اللَّهُ﴾، [سـورة آل عمران: ١٣٥].

ژیانی موسـوڵمان بریتییـە لـە کـارکردن و هەوڵـدانی لەهـەموو کاروبـارێکی ژیـانی تایبەتی و گشتی بەگوێرەی ڕوانینی قورئانی، هەمووشی جیهاد و تێکۆشینە لەهەموو کارێکدا کەئـەنجامی دەدات، گـەڕان بـەدوای زانسـتدا جیهـادە، پەیـداکردنی بـژێوی، پـاکخویی دەروونــی، هەســتان بــە ئەرکــەکانی دادپــەروەری و پارێزگــاریکردن لــە بێدەسەلآتان، هەوڵدان بۆ پێویستییەکانی ئوممەت، بەرگری لە وڵـاتی موسـوڵمانان، گەیاندنی بانگەوازی حەق و ئایین هەموویان جیهادن.

ئەم جیهاد و تێکۆشانە لە کاروباری ژیانی ئیسلامیدا لە گرنگترین ئامانجەکانی زیکر کردنە لە ژیانی موسوڵماندا، چونکە ژیانی موسوڵمان یەکەیەکی تەواوە و لە ئەنجامدانی خێر و ئاراستەکردنی هەوڵ بەگوێرەی ڕێنوێنی خوای گەورە و ملکەچبوون بۆی بەشبەش ناکرێت: ﴿قُلْ إِنَّنِي هَدَانِي رَبِّي إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ (١٦١) قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٦٢) لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ﴾ [الأنعام: ١٦١ –١٦٣]، واتە: (ئەی محەمەد (درودی خوای لێبێت) بڵێ: بەڕاستی من پەروەردگار هیدایەت و ڕێنموونی کردووم بۆ ڕێگە و ڕێبازی ڕاست و دروست، ئایینێك کە ڕاگری ژیانی خەڵکە، ئەویش ئاینی ئیبراهیمە کە دوورە لە هەموو لادان و ناڕێکییەکەوە و ئەو هەرگیز لە ڕیزی موشریك و هاوەڵگەراندا نەبووە. (ئەی پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت)، ئەی ئیماندار) بڵێ: بەڕاستی نوێژ و حەج و دروشمەکانی و (سەرجەم چاکە و بەندایەتیم)، هەروەها ژیان و مردنم تایبەتە بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییانەوە. ئەو زاتە هیچ هاوەڵ و هاوبەش و شەریکێکی نییە و من بەوە فەرمانم پێدراوە و من یەکەم کەسی موسوڵمانانم).

ئەوەندەی تێڕوانینی گەردوونی ئیسلامی پاك و کارا و گشتگیر و ئەرێنی بوو، ئەوەندەش تێڕوانینی سەردەمی گۆشەگیری و دابڕان و قوتابخانەیی –لەڕووی فیکرییەوە– تێڕوانینێکی شکستخواردوو بووە لەخۆیدا لەتەواوی جێبەجێکرانەکانیدا، ناتەواو، بەشەکی، نەرێنی بووە، لەڕووی کرداریشەوە لە ژیانی خەڵکیدا جێبەجێکرانێکی هۆزگەری تاکڕەوی خۆپەرستانە بووە، کە دواتر شوێنەواری ئەو شێواندنە ترسناکانە لە چەمکە ڕۆشنبیرییەکانی ئوممەتدا دەبینین، هەروەها لە بونیادی دەروونی و ڕۆڵی شارستانییەتیدا، بەجۆرێك کە گەیاندوویەتییە ئەم حاڵەی دەستەوسانی و دواکەوتویی و لاوازیی.

**شێواندنی دووەم: شێواندنی میتۆدی (مەنهەجی):**

شێواندنی دووەم کە بەهۆی دابڕان و گۆشەگیریی زانا و بیرمەندانەوە دروست بوو، دابڕانەکەشیان –لە باشترین حاڵەتەکاندا– بریتییە لە شێواندنێکی مەعریفی مەنهەجی، بیری ئیسلامیی گۆڕی بۆ بیرێکی تیۆری، ڕۆچوو لە بیرکردنەوەی تیۆریی قوتابخانەییدا، کە بەگەڕان و بەدواداچوون و تاقیکردنەوە ڕێگای بەرەو ژیانی کۆمەڵایەتی نادۆزێتەوە، ئەم شێواندنەش بووە هۆی نەزۆکیەکی مەنهەجی مەترسیدار، مەعریفەی کردە پرۆسەی خۆدەرخستن و لاساییکردنەوەو دووبارەکردنەوە، کەهیچ شوێنەوارێکی کاریگەری ڕەگەزی کات و شوێن و زانینی سروشتی نەریتەکانی بوونەوەرانو دروستکراوانی تێدا نییە.

لەپاڵ ئەو گۆشەگیری و دابڕانەدا، ئەوەی یارمەتیدەر بوو بۆ ئەو شێواندنە مەنهەجییە، سروشتی تیۆری میتافیزیکی وێنەیی فەلسەفە و لۆژیکی گریکی بوو، کە سەرسامبوون پێیان و کاریگەرییان لەسەر ژینگەی فیکریی ئوممەت بووە هۆی لاوازکردنی بیری کرداریی ئەزموونی و خولیای زانستی کە چەمکە ئیسلامییەکان بانگەشەی بۆ دەکرد: لە سەرنجدان و گەڕان بەزەویدا و بیرکردنەوە و ڕامان و پێوانە و بەراوردکردن، بۆیە هەموو ئەوانە بوونە هۆکاری دەستەوەستانی فیکری و فراوانبوونی گەڕان بەدوای دەقەکاندا و بەخشینی سەرکوتی پیرۆزی پێیان، وەك خۆ گونجاندن لەگەڵ ئەو دەستەوەستانییە فیکرییەدا، هەروەها کەرەستەکانی ئیجتیهاد و هۆکارە پێویستەکان بۆ لەدایکبوونی مەعریفە مرۆییەکانیش کە لەگەڵ مەعریفەکانی وەحی و ڕێنیشاندانەکانیدا کامڵ دەبێت و مەعریفەی پێویستیان بۆ گەش و نماکردنی ئوممەت و لەخۆگرتنی گۆڕانکارییەکان لێ دروست دەبێت، تاوەکو یارمەتیدەری بێت لەوەی فکرێکی خاوەن توانای بەرەنگاربوونەوەی ئاستەنگەکانو سوودمەندبوون لەتواناکان پێویستیەتی.

بەهۆی ئەم شێواندنە مەعریفیە مەنهەجییەوە، ڕوانگەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکانی فیکری ئیسلامی لەسەر شێوەی ناونیشان و بنەمای ڕووت و

پـەتیو سەرچـاوەی لاوەکـی لـەگۆڕەپانی  زانسـتەکانی فیقـه و بنەماکانیـدا مانـەوە، مەوداو مانابەخشینی تیۆریان تەنها ژیانی تاکی دەگرتەوە.

تا ئەوکاتەی دەرفەت بۆ گەورە زانایـەکی مەزهـەبی مـالیکی ڕەخسـا، کـە بـەهۆی کـارکردن و سـەرقاڵبوونی فراوانییـەوە بـە سیاسـەت و ژیـانی گشـتییەوە، دەرگـای مەعریفەی مرۆیـی کۆمەڵایـەتیی لەبـەردەم فیکـری ئیسـلامییدا بکاتـەوە، داهێنەرانـە زۆرێك لە گەنجینە بەنرخە پەنهانەکانی و داخرانیدەرگاکانی دۆزییەوە و لە سروشت و هۆکارەکانی کارلێککردن و گۆڕانکارییەکانی تێگەیشت، ئاشنای رووەکانی کاریگەریی تێیاندا ئاشنا بوو، هەموو ئەوانەی لەکتێبەکەیدا (المقدمة) خستە روو[١]، بەڵام –بەهۆی عەقڵییەتی گۆشەگیرییەوە–ئەم بیرە داهێنەرە پەراوێز خرا، هەروەك چۆن بیری زۆرێك لە داهێنەرەکانی تریش پشتگوێخران.

ئەم کتێبەی ئیبن خەلـدوون لەخوێندنـەوەی زانایـان نـەبوو، بابەتەکانیشـی جێـی گرنگـی پێـدانیان نـەبوو،  پـرۆژەی گـەڕان بـەدوای بەڵگـەکانی زانسـت و مەعریفـەی گەردوونیی زیندوو بە پرۆژەیەکی لەکارخراو مایەوە– لەگەڵ وشکبوونی ژیانی کرداری قوتابخانەی تێوری دەقەکان– هەستانەوەی بۆ نەبوو، تاوەکو ئوممەت بەو گەنجینـە مەعریفیە کۆمەڵایەتییانەی کە ڕۆژئاوا بەخۆیەوە بینی بێدار بوویەوە– لەسەر بناغەی بنـــەماکانی ئـــیبن خەلـــدونو مەنهەجـــە سروشـــتیەکەی لـــە بوارەکـــانی زانســـتە کۆمەڵایەتییەکان لە مێژوو و فەلسـەفەی مێـژوو کۆمەڵناسـی و ئـابووری و پـەروەردە بونیادیان نابوو– کـەدەروازە و ئاسـۆگەلێکی فراوانـی لەبـەردەم ڕۆژئـاوادا کـردەوە و نـەتوەکانیانی توانیـان بەهۆیـەوە گیـانی دەستپێشـخەری و توانـای داهێنکارانـە نەوەکانیان بەهرەمەند بکەن و ڕێکخستنە کۆمەڵایەتییەکان دروست بکەن و لەئاسـتی گۆڕانکارییەکان و ڕووبەڕووی پێشهاتەکاندا بن.

کێشەیەك نییە کە لێرەدا نموونەیـەك بخەینـە روو کـە شـوێنەواری ئـەو شـێواندنە میتۆدییە لە ڕوانینی زانستخوازان و گرنگیدانەکانیان و شـێوازیان لـە چارەسـەرکردنی

---

[١] - ئەویش: (أبو زيد عبدالرحمن بن خلدون)ە، (٧٣٢– ٨٠٨ك/ ١٣٣٢– ١٤٠٦ز) خاوەن کتێبی (المقدمة).

کێشە کۆمەڵایەتییەکاندا روون بکاتەوە، ئەو شـێوازەی کـە حەقیقـەتی گۆشـەگیری و دابڕانیان لەگۆشەکانی لەبەرکردن و پێداچوونەوەدا دەردەخات.

موفتییـەکی بـەڕێزی یـەکێك لـە وڵاتـە ئیسـلامییەکان لـە وتـاری ڕۆژی هەینیـدا بەشێوازێکی جوان و ورد باسی پاکوخـاوێنی (الطهـارة)ی کـرد، بەشـێوازێکی جـوان و ورد و سەرنجڕاکێش بۆ بیسەرەکانی باسی پاك و خاوێنی (الطهارة) و ئەوەی پێی پاك دەکرێتەوەو ئەوە پاك ناکاتەوەو ئەحکامەکانی کرد، بەپێی ئەوەی لەکتێبەکانی فیقه و ئەحکامەکانیدا هاتووە.

دوای نوێـژ، ئـەو بـەڕێزە وەك نـەریت و رەوشـت جـوانیی خـۆی لـە کتێبخانـەی مزگەوتەکەدا دادەنیشێت و پێشوازیی لەو کەسانە دەکات کە سەردانی دەکەن، منیش ڕۆیشتم و سەلامم لێکرد و لای دانیشتم، بە شێوەیەکی جوان و شیرینەوە کە گونجـاو بـێ لەگـەڵ ئاسـتی زانسـت و پێگـە و ڕێـزی، خۆشـحاڵیی خـۆمم بەرانبـەر شـێوازی ڕەوانبێژانەی وتارەکەی و جوانی و گشتگیری باسکردنی ئەحکامـە فیقهییـەکانی ئـەو بابەتە دەربڕی، ئەوەم بۆ باسکرد کە بە بۆچوونی من وتارەکە یەك شـتی زۆر گرنگـی پێویست بوو، دەبوو باسی بابەتی پاکوخاوێنیو بەدیهاتنی خۆپارێزی تەندروستیشت بەشێوەیەکی تێروتەسەل و تەواو بکرابایە، ئماژەم بەوەدا کـە روونکردنـەوەی ئـەم لایەنەو فەرامۆشکردنی لەوانەیە ببێتەهۆی بەکەمزانینی پاکوخاوێنیی لەلایەن خەڵکیی گشـتییەوە و بەئاگانـەبوون لەگرنگییەکـەی و سـەیرکردنی وەك بابـەتێکی نـاگرنگ و کەسیی کەئەرکی سەرشان قورس دەکاتو پێویست نییە، بـەڵکو رەنگـە هەنـدێ لـەو بابەتانەی بۆ خستنە رووی بابەتەکە باسکران وا دەربخات کەهەندێ پیسی بەئاسـایی وەربگیردرێت چونکە لـەرووی شـەرعیەوە گرفتـی نییـە، وەك بەڵغـەم کـە هەنـدێکجار نەخۆشـیی گـوازەرەوەی لەگەڵدایـە، یـان هەنـدێ لـەو پیسـییانەی کەدەکەونـە سـەر پۆشاکو لەڕووی فیقهییەوە—نەك تەندروستییەوە— بۆ پاکوخاوێنی بە کێشە دانانرێن، ئا بەوجۆرە ئێمە —لەکاتێکدا خـەڵکی فێـری پاکوخـاوێنی دەکـەین— فێـری ئـەوەمان

کردوون گویٚ بەهەندیٚ پیسیی نەدەن و پاکوخاوێنی و پێویستییەکانی پاراستنی تەندروستیی گشتیی بەکەم بزانن.

گفتوگۆکەی نێوانمان زانستی و دۆستانە بوو، بەڕێزیشیان بە سنگفراوانییەوە قبوڵیان کرد، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ئێمە پێویستمان بە ڕاگۆڕینەوە و فراوانکردنی بازنەی مەعریفە و تێگەیشتنی کێشەکانی ژیان و ڕۆشنبیرییمان هەیە، پێویستمان بەوە هەیە میتۆدی مەعریفەمان چاکبکەین و دەستبەرداری گۆشەگیری و مەعریفەی تاك لایەنە بین.

گرنگە لێرەدا ئاماژە بەوە بدەین، کاتێك هەندێکیان باسی بابەتی پاکوخاوێنی دەکەن، لەمجۆرە هەڵوێستانەدا بابەتەکە لە خۆڕازاندنەوەی کەسەکە لەکاتی هاتنی بۆ نوێژی هەینیو بەکۆمەڵی مزگەوت کورت دەکاتەوە.

لەراستیدا هوشیارکردنەوەی خەڵك لە بابەتی پاکوخاوێنی و خۆپارێزی تەندروستییدا، بەشێکی گرنگی ئامانجی ئەو پاکوخاوێنییەیە کە پێغەمبەری پێشەوا (درودی خوای لێبێت)، بە کۆمەڵگای دەورووبەری خۆی فەرمانی پیٚ داوە، تەنانەت کە حەوشەی ماڵێك لەماڵەکانی موسوڵمانانی بینیووە شپرزبووە، فەرمانی پیٚ کردوون پاك بکەنەوە و گرنگیی پێبدرێت، هۆشداری داونەتیٚ کە نابێت بابەتی پاکوخاوێنیی بەکەم بگرن، دەبێت داوای لێکردوون گرنگی بەپاکوخاوێنی کۆڵان و گەڕەکیان بدەن و لەپشتگوێخستنی پاکوخاوێنییدا لە جولەکە نەچن.

وادیارە کە بەشێکی گەورەی ئوممەت لەمڕۆدا گرفتاری ئەو نەخۆشییە دەروونی و کۆمەڵایەتییە بوون، کە جولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەری خوادا (درودی خوای لێبێت) لەنێویاندا بڵاو بووە[1].

[1] - لەفەرموودەدا هاتووە:(موحەممەدی کوڕی بەشار بۆی باسکردین، ئەبو عامری ئەلقەعدی بۆی باسکردین، خالیدی کوڕی ئیاس بۆی باسکردین، ئەویش لە ساڵحی کوڕی ئەبی حەسسانەوە وتی: گوێم لە سەعیدی کوڕی موسەیب بوو دەیگوت: خوای گەورە پاك و جوانە و پاك و جوانی خۆشدەوێت، بەڕێزەو بەڕێزی خۆشدەوێت، بەخشندەیە و بەخشندەی خۆشدەوێت، بۆیە ئێوەش پاکوخاوێن بن– وەها دەبینم

بۆیە بەهۆی شێواندنی میتۆدیەوە، مەعریفە بووە دەقێکی حەرفیی بەشەکی کە لەسەر تەقلید و شوێنکەوتەیی و لاسایی و دووبارکردنەوە و وتنەوەو ڕۆچوون دامەزرابوو، لە ئاڵۆزکردن و پەراوێز و کورتکردنەوەدا نغرۆ بووبوو. مەعریفە پارچە پارچە کرا، بیروباوەڕ و مومارەسەی ژیان لە یەکتر دوورخراونەتەوە، یەکخواناسی تێیدا تایبەت کرا بە بیروباوەڕە پەتییەکان، یان ئەوەی بە (زانستی کەلام) ناسراوە، کە زۆربەی لایەنەکانی تایبەتمەندە بەمشتومڕکردن و سەفسەتی لاهوتی، زانستی فیقهیش لە زانستی عەقائید جیابوویەوە، یەکلابوویەوە بۆ کاروبارەکانی ژیانی تاك بەتێروتەسەلی، لە توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکانیشیدا پشتی بەمیتۆدێك بەستووە، کەپشتی بەپێوانەی بەشەکی ڕووداوەکانی ڕابرووەدو حاڵەتگەلێکی پچڕپچڕی بەستبووبەبێ ئەوەی وێنە هەمەکییەکە لەبەرچاو بگرێت، هەموو ئەوەی کە زانایانی دوایین پشتیان پێ دەست چەمکە زمانەوانییەکانی دەق بوو، ئەوپەڕی هەوڵیان بۆ بەدەستهێنانی بەخەرج دەدا، با بەچاوپۆشی لە لاوازیی یان نامۆیی هەندێك لەگێڕاوەکانیش بێت.

بەمجۆرە، مەعریفەی دەق لە سەردەمانی دەستەوسانی و چەقبەستن و لاساییکردنەوەدا؛ بووە ئامانج و مەبەست تاوەکو بەهێزی پیرۆزی دەستەوەستانی مەعریفە داپۆشرێت، لەهەمان کاتەدا وەك بابەتێك بەکارهێنراوە و مێشکی زانستخوازانی پێ پڕکراوەتەوە، بێ ئەوەی شارەزایی و گرنگییەکیان بە شوێنەوارەکانی ئەو مەعریفانە دابێت و زانیبێتیان ئەو بابەتە چەندە شیاوی خوێندنە

---

وتی: حەوشە و دەورووبەری ماڵتان پاك ڕابگرن و خۆتان بە جولەکە مەچوێنن، دەڵێت: ئەمەم بۆ موهاجیری کوڕی مسما باسکرد، ئەویش وتی: عامری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص بۆی باسکردم ئەویش لەباوکییەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لێبێت)، بەڵام پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: "نظفوا أفنيتكم"، واتە: حەوشە و دەورووبەری ماڵەکانتان پاك ڕابگرن.. بڕوانە:

– الترمذي، محمد بن عيسى. الجامع الصحيح (سنن الترمذي)، تحقيق: أحمد محمد شاكر، بيروت: دار إحياء التراث العربي، (د.ت)، ج٥، ص١١١، حديث رقم: ٢٧٩٩.

و لەپێکهێنانی عەقڵیی و دەروونـی ئـەو زانسـتخوازەدا چـی ڕۆڵێکـی هەیـە[1]. تەنانـەت ئێمە سەرسام دەبین چۆن هەندێ زانسـتخواز خۆیـان بـە باسـی گومانـاوی و دوور لـە زانستیی پێشەوایان هەڵدەکێشن، بـەوەی کەهەنـدێکیان بـاری هەنـدێك لەمنداڵـەکانی خۆی قورس کردووە بەوەی بەلەبەرکردنی هـەزاران دەقـی درۆ، تـا بەگێڕانـەوەی درۆ بناسرێت، لەوە بەئاگا نەبوون کە گێڕانەوەی درۆ و شتی بێ مانا شوێنەواری عـەقڵیی خراپ لەسەر قوتابی بەجێدێڵێت، لەپێشتر ئەوەیە کەقوتابیان هەوڵەکانیان بۆ ناسینی ئەوەی دروستە لـەڕووی گێڕانـەوە بـدەن و لەبـەری بکـەن، هـەر گێڕانەوەیـەکیش لـە دەرەوەی صەحیحدا بێت ئەوە صەحیح نییە، بەڵام بێمانا و بەدرۆ کۆتـایی بـۆ نییـە، زیادبوونیشـی رادەی نییـە، ئەوەنـدە بەسـە لـەو دراوازەیـەدا درك بـە مەبەسـت و پێویستیو دروازەکانی و ئامڕازەکانی بکرێت، لەگەڵ خستنە رووی چـەند نموونەیـەك لێی و ڕووبەڕووبوونەوەی ئەوەی لێی بڵاودەکرێتەوەو وەڵام دانەوەی.

بەهەمانشـێوە لەچوارچـێوەی خـۆگێلکردن لـە شـوێنەوارە دەروونییـەکانی ئـەو مەعریفانە لە بیری ئوممەت و ڕۆچوون لەگرنگیدان بـە چـەندێتیی ئـەو مەعریفانەدایـە ئەوەی کە تا ئەمڕۆلە بواری فێرکردنی ئایینییدا تیایدا دەژیـن، مێشـکی منـداڵان بـەو زانیارییانە پڕ دەکرێن کە لەگەڵ عەقڵی منداڵ و بونیادی دەروونییاندا گونجـاو نییـە.

---

[1] - سوننەتی پێغەمبەری خوا (درودی خـوای لێبێـت)، سەرچـاوەیەکی گـرنگ و دەوڵەمەنـدە، نموونەیـەکی جێبەجێکراوی زیندووی واقیعی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی سەردەمی پێغەمبەری خوایە (درودی خوای لێبێت) و لەتوانادایە کەلەواقیعی ژیانی مرۆییدا هەموو کاتێك جێبەجێ بکرێت، بەڵام پێویستە لێی تێبگەینو لەکات و شوێنی جێبەجێکردنیشیان تێبگەین، تاوەکو درك بە حەقیقەتی ماناکانی بکەین، پێویسـتە کەتـەنها پشـت بەصەحیحەکانیان ببەستین و بەهەموو شێوازە زانستییەکان لەڕووی ڕەخنەگرتن لەسەنەد و رەخنە لەمـەتن بکۆڵینەوە، لـە هـەمووی گـرنگتر گونجـانی واتـای دەقـەکان لەگـەڵ بنـەماکانی قورئـانی پـیرۆز و چـەمك و تێگەیشتن و مەبەستەکانیدا، هەرچی ئەو دەقانەیە کە واتاکانیان دروستن و ڕشتەی گێڕانـەوەیان متمانـەدار نین، ئەوە لە بەشی ئەسـەرە و لـە واتـا گشـتییەکانی سـوود دەبینرێت، بـێ ئـەوەی پـەردەی پیرۆزییـان بەسەردا بدرێت، چونکە قبوڵکردنی ئەوکات پشـت دەبەسـتێتە ئـەو واتایانـەی کـە تیایاندایـە و ئەوەنـدەش بەسە.

زیانی ئەو كارە هەر لەوەدا ناوەستێتەوە كە مێشكی ئەو منداڵە بە شتی ناپێویست پڕكراوەتەوە، بەڵكو ئەو پڕكردنە –بەو شێوەیە– بێبەشی دەكات لەو شێوازانەی فێركردن و ئاشناكردن كە لەبونیادنانی دەروونیی ئەو منداڵەدا لە قۆناغەكانی پێگەیشتندایەو لەبارە بۆ وەرگرتن، بۆیە بە لەدەستچوونی ئەو دەرفەتە پەروەردەییە ویژدانییە –كە لەو تەمەن سەرەتاییەی منداڵییدایە– دەرفەتی بونیادنانی دەروونییانەی ساغی بۆ هەتاهەتایە لەدەست دەدرێت، كە گەڕانەوەی نییە.

نموونەیەكی تری پڕكردنەوەی مێشكی منداڵ –كە سوودێكی كەمی هەیە– ئەو توانایەیە كە منداڵ لە قۆناغی سەرەتاییدا دەریدەخات، لە زانینی ئەندازەی زەكاتی وشتر و مانگا و مەڕ و بزن و دانەوێڵە. زۆربەی ئەو منداڵانە هێشتا وشتریان هەر نەبینیووە، ڕەنگە ڕۆژێك لەڕۆژان هەر نەبنە خاوەن مانگا و كشتوكاڵ و مەڕو ماڵات، ئیدی بۆ بە ورد و درشتی ئەو بابەتە فیقهییە وشكانە مێشكیان پڕبكرێتەوە؟ بە كاروبارێك كەپەیوەندییان بەواقیعی ژیانی ئەوانەوە نییە. تەنانەت گەر ناچاربكرێن زەكاتی سەروەتی بازرگانییە باوەكان لەپشك و خانوبەرە و پیشەسازییەكان بزانن، ئاخۆ چەند كەسیان دەبنە فەرمانبەری كۆكردنەوەی زەكات؟ ئایا ئەمە لەگەورەبووندا یارمەتییان دەدات كاتێك خۆیان دەبنە خاوەن پشكو خانووبەرە كەئەو بڕو ڕادەیەیتن بێتەوە بیر؟ یان قسەی لێنیاكەرەوە لەوەدا لای خەڵكانی پسپۆڕ و تایبەتمەندە؟

زیانەكە هەر لەوەدا ناوەستێتەوە مێشكی ئەو منداڵە بە بابەتی كەم سوودەوە پڕدەكرێتەوە، بەڵكو خراپتر لەوە، ئەوەیە قۆناغی منداڵیی ئەو قۆناغەیە كە بونیادی دەروونی و ویژدانیی منداڵەكەی تیادا بونیاد دەنرێت و دەروونەكان سروشتی پێوەوەردەگرن، هەست و سۆزەكانی لەگەڵدا پێدەگات و چەمك و تێگەیشتنەكانی پێ پێكدەهێنرێت، ویژدانی لەسەر بونیاد دەنرێت.

بۆیە لەپێشترین شتێك لە قۆناغەكانی پێگەیاندنی منداڵدا، ئەوەیە فێربكرێن، بۆ نموونە لەبواری زەكاتدا، فێری واتاكانی دەستباربۆیەكگرتن و سۆز و بەزەیی و قوربانیدان و لەخۆبردن و هاوبەشیكردنی لاوازان و بێتوانا و نەداران بكرێت.

نابێت فێرکردنەکە وەك تەڵقین بێت، پێویستە ئامڕازەکانی خوێندرانەوە و بیستن و بینین فەراهەم بکرێت، بەشێوازە پەروەردەییە کردارییە کاراکان ئەنجام بدرێت، لەوانە بۆ نموونە تێکەڵیی کەسانی بێبەش و بێتوانا و کەمئەندامان بکرێن، خزمەتیان بکەن و هاوکارییان پێشکەش بکەن و لەمانای پێویستیەکانیان و نەهامەتیەکانیان تێبگەن. لەراستیدا بەفیڕۆدانی دەرفەتی پێکهێنانی دەروونیی و پڕکردنەوەی بەو شتە مەعریفییە ناپێویستییانە کە لە خۆیدا دەبێتە ئامانج، بەبێ ئاگاداربوون لەو زانیارییانەی پێشکەشی دەکرێت و تێبینی نەکردنی شوێنەوارە نەرێنییەکەی لە پێکهێنانی عەقڵیی منداڵ و پەروەردەی تازەپێگەیشتوواندا، بێئاگابوونە لە سروشتی منداڵێتی و ڕۆڵی مەعریفە بە دەروونی ویژدانی لە بونیادنانی کەسێتی مرۆڤ و گەشەپێدانییدا. ئەمەش یەکێکە لەبۆماوەکانی ئەو شێواندنە مەنهەجییەی کە لە سەردەمانی دواتریدا تووشی فیکری ئیسلامی و شارستانییەتی ئیسلامیی بوو.

**شێواندنی سێیەم: شێواندنی چەمکەکان:**

سێیەمین شێواندنی ترسناك کە بەهۆی گۆشەگیریی زانایانەوە تووشی فیکری ئیسلامی و عەقڵی موسڵمان بووەوە، ئەو دەستەوەستانی فیکری و وەستان و بەکارخستنی وتاری تۆقاندن بۆ دامرکاندنەوەی لێپرسینەوە و چەقبەستن‌و برەودان بەگوتاری تۆقاندنەی لێی کەوتەوە، بەمەبەستی خامۆشکردنی گیانی دادگاییکردن و ڕەخنەگرتن و ناچارکردنی خەڵکیی بەگشتی –بەهۆی دەستەوسانی فیکرییەوە– بۆ ملکەچبوون و قبوڵکردن، ئەمەش شێواندنی چەمکەکانە، چونکە بەبێ شێواندنی زۆربەی چەمکە بنەڕەتییە ئیسلامییەکان، نەدەتونرا گیانی دادگاییکردن و داوای قەناعەتپێکردن خامۆش بکرێت و تەواوی ئوممەت ملکەچ بکرێت بۆ ئەوانەی بۆیان دەخوێنرێتەوە، بەبێ ئەو شێواندنەی کەزۆرێك لەچەمکە ئیسلامییە بنەڕەتیەکان شێوێنران، ئەمەش ئەرکەکەی ئاسان دەکات، عەقڵ و دەروونەکان بۆ ملکەچبوون و شوێنکەوتن و خۆبەدەستەوەدان دەڕەخسێن.

**شێواندنی چەمكی بەندایەتی (عبودییەت):**

چەمكی "عبودییەت" بە یەكێك لە چـەمكە ئیسـلامییە بنەڕەتییـەكان دادەنرێـت، شێواندنی ئەم چەمكەش بووە هۆكاری شێواندنی زۆربەی چەمكە ئیسلامییەكانی تـر، چەمكە شێوێنراوەكانیش هاریكار دەبـنو دەتـوان دەروون سـەركوت بكـەن و عـەقڵی ڕەخنەگر نەهێڵن و بیركردنەوە و گەڕان و پشكنین رابگرن، تەنها بانگەشەو جوڵاندنی خەون داواكردنی ئەنجام و پشكنینی ئەنجامەكان بەسە.

چونكە موسوڵمان –وەك ئەوەی ئیسلام دەوێـت– سـەرفراز بێـت، لەبـەر ئـەوەی جێنشینێكی ڕێزلێگیراوە، بەندایەتیكردنیشی بۆ خوای گەورە نیشانەی شـكۆو ڕێـزە، چـونكە دەربڕینـی ویسـتێكی ئـازادە لـە ناسـینەوەی حـەق و شـوێنكەوتنی ڕێگـە ڕاستەكەی ئیسلام.

موسـوڵمانە باوەڕدارەكـان بەنـدە دڵسـۆزەكانی خـوای گـەورەن، ئـەوەش لەخۆڕانییە، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا بەبێژەی عیباد (عِباد) و هەنـدێكجاریش بە بێژەی عوباد (عُباد) مرۆڤی دوواندووە، بێژەكە لە (التعبید)ەوە وەرگیراوە، نەوەك (الاستعباد – بەكۆیلەكردن) و پێچەوانەی بێژەی (عبید)ە.

ئەمە زۆر لێكچووی وشەی (الذل– سەركز) ییە كـە لـە قورئـانی پـیرۆزدا هـاتووە، بۆیە سەركزكردنی مرۆڤ بۆ دایك و بـاوكی –بـە سروشـتی پەیوەندییەكـەی پێیانـەوە لـەمیانی قورئـانی پـیرۆزدا– لەسـەركزی و ئاسـانكارییەوە داڕێـژراوە، مەبەسـت سەرشۆڕی و ڕیسوایی نییە، پەروەردگار دەفەرموێت: وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الـذُّلِّ مِـنَ الرَّحْمَةِ وَقُلْ رَبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا [الإسـراء: ٢٤]، واتـە: بـاڵی میهرەبـانی خۆتیان بۆ ڕابخە و ملكەچ بە بۆیان، نزا بكە و بڵێ: پەروەردگارا ڕەحمیان پـێ بكـە و میهرەبـان بـە بۆیـان، هـەروەكو چـۆن ئـەوان ڕەحمیـان بـە مـن كـرد و منیـان پەروەردەكردووە بە بچووكی و منداڵی.

بەلاَم دوواندنی خوای گەورە بۆ بێباوەڕ لەگەڵ دوواندنی بۆ مرۆڤی باوەڕدار تێکەڵ بکرێت و چەمکی بەندایەتیی وەهای لێکبدرێتەوە بەکۆیلەکردن بێت، ئەوە تێگەیشتنێك دروست دەکات کە مایەی شەرمەزاریی و هەڕەشەو تۆڵەو سەرکوتکردنی ویژدان و، کەرەستەی رقلێبوون و شکاندنی شکۆ و جڵەوکردنی عەقڵ و بەربەست دروستکردن لەنێوان خوای خالیق و مرۆڤی مەخلوقدا بێت، تێکەڵکردنێکی بێ بنەما و پاساوە، چونکە مرۆڤ دروستکراوێکی سنووردارە، خوداش دروستکاری ڕەهایە، بۆیە هیچ بوارێك بوونی نییە بۆ بەراوردکردن لەنێوان خالق و مەخلوقدا، ورووژاندنی ئەم بابەتە و ئەو بەراوردکردنە لە جێگەو شوێنی خۆیدا نییە، دەرخستنیشی لەڕووی عەقڵی موسوڵمانی باوەڕداری سادە و نا سەرسەختدا هیچ واتایەکی نییە.

بەشێواندنی چەمکی بەندایەتی و برەودان بەو بەراوردکاریانە، وایکردووە لە پێگەی عەقڵ کەم بکرێتەوە، پرسیارکردن و پشکنینەکانیشی بووەتە جێی تۆمەتی ئینکاریکردن و یاخیبوون، بێگومان ئەم شێواندنە یارمەتیدەر بوو لە سەرکوتکردنی ویژدانی موسوڵمان و دەست بەسەراگرتنی مافی بیرکردنەوە و ڕەخنەگرتن لێی.

ئەم هەڵوێستە خۆبەرزگرتنە لەلایەن قوتابیانی زانستە ئایینییەکان، کە لە زانستە مرۆییەکان و مەعریفەی رێگاکانی دابەزاندنی مەعریفەکانی وەحی بۆ سەر ژیانی خەڵك لاوازن، ئەمەش وایکرد زۆرێك لەبیریاران پەنا ببەنەبەر فەلسەفە هاتووەکان، کەلە شارستانییەت و ڕۆشنبیری ئەو ئوممەتانەی تر ماونەتەوە کەهاتنە نێو ئیسلامەوە، بەبێ بوونی هیچ مەنهەجیەتێك کەلەچوونە نێویدا رێنمایی ئەو بیرمەندانە بکات، لەکاتێکدا کە باشترینی ئەو فەلسەفە و پاشماوانە بۆ وەنەوزدانی میتافیزیکیی دوور لە هیدایەتی خوایی دەگەڕێتەوە، ئەمەش ململانێیەکی گومانـاویی لەفیکری ئیسلامییدا لەنێوان "عەقڵ و نەقڵ"دا دروستکرد و پێداگریی ئوممەتی لاوازکرد و بیری لاواز و توانای پەرتەوازە کرد، کۆتاییەکەشی بەوە گەیشت چەمکە ئیسلامییەکان بشێوێنێت تاوەکو دەستەوەستانیی فیکری و دەستەمۆکردنی عەقڵی بیریاری ڕەخنەگری پێ داپۆشێت و لە پلەوپای کەمبکاتەوە.

بێگومان گرنگە دەرکی پەیوەندیی نێوان چەمکە ئیسلامییە بنەڕەتییەکان بکەین، کە خۆیان لە چەمکی تەوحید، چەمکی ئیرادە، چەمکی بەندایەتی، چەمکی جێنشینایەتی، چەمکی تەزکییە، چەمکی ئاوەدانکاریدا دەبینێتەوە.

چەمکی تەوحید باسێکی کەهنوتیی نییە تەنها وەسفگەلێکی پەتیی بن بۆ زاتی خوا و تەنیا کۆمەڵە مرۆڤێك لەجیاتیی خوا قسەی لەبارەوە بکەن، بەڵکو بنەمایەکی ئایینی و چەمکێکی ئیسلامییە، لە ژیانی مرۆڤدا بەڵگە و واتای خۆی هەیە، هەروەها لە تێگەیشتنی واتای ئەم ژیانە و ئامانج لێی واتای خۆی هەیە.

## چەقبوونی چەمکی تەوحید "یەکخواناسی" و واتا ژیانییەکانی:

گرنگی بنەمای تەوحید لەئیسلامدا، لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە چوارچێوەیەك بۆ تێگەیشتنی ژیان و گەردوون پێکدەهێنێت، بنەماکانی پەیوەندییە مرۆییەکان و ئەو بناغانەی کەلەسەری دەوەستێت دادەمەزرێنێت، هەر کێشە و ناتەواوییەك لەم بنەما و تێگەیشتنەدا شوێنەواری ترسناکی لە واتای ژیانی ئیسلامی و جۆر و ئامانجەکەیدا دەبێت. چونکە بنەمای یەکخواناسین واتا یەکتایی خوای دروستکار (خالیق)، ئەم حەقیقەتەش واتای یەکبوونی دروستکردنی گەردوون دەگەیەنێت، یەکبوونی ژیان و مرۆڤ و، ئامانجی دروستکردن و گەردوونو تەواوبوونییەتی، دژ نییە لەگەڵی، واتای مەبەستی خێر و لەمەخلوقاتدا دەدات، بۆیە هیچ بوار بۆ خۆ بەگەورەدانان یان ستەم یا سەرکوتکاریی لەنێوان مرۆڤەکاندا نییە، بەمەش بنەمای یەکتاپەرستی، پابەندبوون بە بنەماکانی دادگەری و ڕاوێژ و یەکسانی لە مافەکان و شکۆی مرۆیی و ئازادیی ویست و بەرپرسیارێتیی مرۆیی پێویست دەکات.

کرۆکی چەمکی بەندایەتی، بریتییە لە ئامانجی خێر و خۆشی و ئازادی ویست و بەرپرسیارێتی مرۆیی، کە لە بنەمای یەکتاپەرستی و ئەو جێنشینێتییەدا خۆی دەبینێتەوە کە چەمکی تەزکییە و چەمکی ئاوەدانکردنەوەی لەسەر بونیاد دەنرێت، پێویستە مرۆڤ لەسەر ئاستی تاك و کۆ هەوڵ بدەن بۆ هێنانەدیی ئامانجە چاکەکانی

دروستبوون، ئەوەش بەپێی ئـەو سروشـتەی خـوای گـەورە لـە گـەردوون و دەروونـی خۆیـان و دەورووبەریانـدا دانـاوە، لەسـەر بنـەمای هیدایـەتی وەحـی و ئـەو سـونەتە خۆڕسکانەی کەخوای گەورە لەبوونەوەراندا داناوە.

بـەم تێگەیشـتنە گونجـاوەی نێـوان سیسـتمی بنـەما و چـەمك و ڕوانینـە گشـتییە ئیسـلامییەکان، چـەمکی بەندایـەتیی –وەك ئـەوەی قورئـانی پـیرۆز گوزارشـتی لێکردووە– دەبێتە سەرچاوەی شانازی و هێز و متمانە لە ویژدانی مرۆڤی موسوڵمان و بونیادی دەروونیی و ویژدانیدا، نـەك ئـەوەی ببێتـە کۆیلـەکردنی دەروونـی مرۆیـیو سەرچـاوەیەك بـۆ هەسـتکردن بـە سەرشـۆڕی و ڕیسـوایی و نـەرێنیبوون. شـتێکی بەسوودە لێرەدا پەنا بۆ هەندێ دەقی قورئانی پیرۆز ببەین، کـە خوێنـەری بـەڕێز بـە سەرچاوەی بنەڕەتیی بنەماکانی ئیسلامو چەمکەکانی لەیەکتاپەرستی و بەندایـەتی و تەزکییە و جێنشینی و چاکەخوازی و ئاوەدانکاری دەگەیەنێت:

**یەکتاپەرستی و بەندایەتی و تەزکییە:**

قورئانی پیرۆز بنەمای یەکتاپەرستی "تەوحید" دەکاتە بنەمایەکی بنەڕەتییانـەی دروستبوونی گەردوون و بناغەی چاکبوون و پارێزگـاریکردنی، (الله) خـوای تاقانەیـە، خۆی خالیقـە (دروسـتکارە)، ئـەگینا چارەنووسـی گـەردوون خـراپ دەبـوو، کـەوابوو خوای گەورە سەرچاوەی ناسینی حاڵی گەردوونە و خۆیشی مـەخلوقات و مرۆڤـی بـە ڕێگـا و شـێوازەکانی گـەردوون ڕێنیشـاندەری کـردووە، هـەر بەتـەنیا خۆیشـی مـافی ئـەوەی هەیـە مـرۆڤ و بوونـەوەران ئاڕاسـتە بکـات و لەبابـەت فـەرمانی گەردوونـدا گوێڕایەڵیی بکرێت، هەروەها لـە ئامـانجو چـاکبوونی کاروبارەکانیـدا، لەسـەر ڕێگـەی بـاوەڕبوون بـەخالیق و هەسـتکردن لـە بەجێگەیانـدنی ئەرکـدا, چـاکبوون دێتـەدی، بەوەش لە هەردوو دونیادا شکۆ و سەربەرزیی دێتەدی.

پەروەردگار لەبارەی سەلماندنی بنەمای یەکتاپەرستییەوە فەرموویەتی:﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا فَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ [الأنبياء: ٢٢]، واتە:

ئەگەر لەگەڵ هەردووکیاندا (لە ئاسمان و زەویدا) چەند خوایەکی تر هەبووایە غـەیری (الله)، ئەوە کاول و وێران دەبوون و تێکدەچوون بەسـەریەکدا، پـاکی و بێگـەردی بـۆ خوا کە پەروەردگاری عەرشـە، لـەو بـاس و خواسـانەدا (کـە خوانەناسـان) دەیڵـێن و (هاوەڵ بۆ ئەو زاتە بڕیار دەدەن).

خوای گەورە چاکەکاری و بەبەندەکردنی دەروونی گێڕاوە بەهۆکاری چاکەکاریی و چاکسازیی و ئەفەرموویێت: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ يُوحَى إِلَـيَّ أَنَّمَـا إِلَهُكُـمْ إِلَـهٌ وَاحِـدٌ فَمَنْ كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَـا يُشْـرِكْ بِعِبَـادَةِ رَبِّـهِ أَحَـدًا﴾ [الكهـف: ١١٠]، واتــە: (جــا ئــەوەی دەیــەوێت بــە دیــداری پــەروەردگاری شــاد ببێــت، بەخۆشنوودییەوە با کار و کردەوەی چاك و دروست ئەنجام بدات و بـەهیچ شـێوەیەك لە پەرستندا هیچ کەسێك نەکاتە هاوەڵ و شەریك بۆی).

چاکەخوازییش ڕێگەی شکۆمەندییە لەهەردوو دونیادا، پـەروەردگار دەفـەرموویێت: ﴿أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُـوا وَعَمِلُـوا الصَّـالِحَاتِ كَالْمُفْسِـدِينَ فِـي الْـأَرْضِ أَمْ نَجْعَـلُ الْمُـتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ﴾، [ص: ٢٨]، واتە: نەخێر، ئـەو باوەڕەیـان هەڵەیـە، ئایـا ڕەوایـە پاداشـتی ئەوانـەی ئیمـان و باوەڕیـان هێنـاوە و کـاروکردەوە چـاکەکانیان ئـەنجام داوە، وەك ئەوانە لێ بکەین کە تۆوی خراپەیان چاندووە لەزەویدا، یاخود ئایا ئەوانـەی پارێزکـار و لەخواترسن وەك خراپەکاران سەیریان بکەین؟!

### جێنشینێتی و چاکسازی و ئاوەدانکاری:

شتێکی بەسوودە هەندێ لەو ئایەتانەی کە ڕێگـەی ڕێنیشـاندەری و چـاکەخوازیی تێـدا بـە تێروتەسـەلیی باسـکراوەو سـەرئەنجامی هـەوڵ و کۆششـی ئـەو بـاوەڕدارە جێنشینەش کە هەوڵی چاکسازی دەدات بخەینە ڕوو، وەك ئەوەی لەقورئانی پـیرۆزدا تێیدا بەتێروتەسەلی ڕێگەی گومڕایی و نکۆڵیکردن و مەبەستی نکۆڵیکـاری گومڕاشـی ڕوونکردووەتەوە، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَعَـدَ اللَّـهُ الَّـذِينَ آمَنُـوا مِـنْكُمْ وَعَمِلُـوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ﴾ [النـور: ٥٥]، واتـە:

خـوا بـﻪڵێنی دڵنیابـﻪخش و تـﻪواوی داوە بەوانـﻪی باوەڕیـان هێنـاوە لـﻪ ئێـوە و کاروکردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، بـﻪ ڕاسـتی لـﻪ ئایندەیـﻪکی نزیکـدا جێنشـین و پایەداریان دەکات لە وڵاتدا هەروەك چۆن ئیماندارانی پێش ئەمانی جێنشین کردووە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاكُمْ خَلَائِفَ فِي الْأَرْضِ مِنْ بَعْدِهِمْ لِنَنْظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴾ [يونس: ١٤]، واتە: پاشان ئێمە ئێوەمان کردە جێنشین لەزەویدا لەدوای لەناوبردنی ئەوان، تا ببینین ئێوە چی دەکەن و چۆن دەکەن!

﴿يَاقَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ هُوَ أَنْشَأَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَاسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُجِيبٌ﴾ [هـود: ٦١]، واتـە: ئـەی خزمـەکانم گوێڕایەڵی خوای گەورە بکەن جگە لەو زاتە هیچ خوایەکی ترتـان نییـە، ئـەو بـەرپای کردوون لە زەویدا و داوای لێکـردوون کـە ئـاوەدانی بکەنـەوە، جـا کـەوابوو داوای لـێ خۆشبوونی لێ بکەن، پاشان بگەڕێنەوە بـۆ لای و فەرمانـەکانی بـەجێبهێنن، چـونکە بەڕاستی پەروەردگاری من زۆر نزیکە و نزاوەرگرە (لەو کەسـانەی لێـی دەپاڕێنـەوە و داوای لێخۆشبوونی لێدەکەن).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿يَاقَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ قَدْ جَاءَتْكُمْ بَيِّنَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ فَأَوْفُوا الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾، [الأعراف: ٨٥]، واتە: ئەی قەوم و هۆز و گەلم تەنها خوا بپەرستن، چونکە جگە لەو زاتە خوایەکی ترتان نییە، ئەوەتا بەڕاستی بەڵگە و نیشانەی ڕوونتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە، کەوابوو لە کێشانە و پێوانەدا (فێڵ و تەڵەکە مەکەن) و مافی خۆی بدەنێ، شتی خـەڵکی سـووك مەکـەن و بێنرخ تەماشای مەکەن، تۆوی فەساد و تاوانباری و گوناه لـە زەویـدا مەچـێنن، دوای چاکسازبوونی، ئەوانە چاکترە بۆتان ئەگەر ئێوە باوەڕدارن.

دەفەرموێت: ﴿وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ وَلَا تَنْسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا وَأَحْسِنْ كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ وَلَا تَبْغِ الْفَسَادَ فِي الْأَرْضِ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ﴾، [القصص: ٧٧]، واتە: هەوڵبدە بـەو مـاڵ و سـامانەی خـوا پێـی بەخشـیوویت مـاڵی

قیامەت و بەهەشتی بەرین بکرە و بەشی خۆشت لەدنیادا بە حەلاڵی فەرامۆش مەکە، چاکە لەگەڵ بەندەکانی خوادا بکـە، هـەروەك خـوا چـاکەی هێناوەتـە رێـت، نەکـەیت هەوڵی فەساد و گوناه و تاوان بدەیت لە زەویدا، چونکە بەڕاستی خوا ئـەو کەسـانەی خۆشناوێت تۆی خراپە دەچێنن.

هەروەها دەفەرموویت: ﴿وَإِذَا تَوَلَّى سَعَى فِي الْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الْفَسَادَ﴾،[البقرة: ٢٠٥]، واتە: هەرکاتێك ئەو جۆرە کەسە پشتی هەڵکرد و دەسەلاتی پەیداکرد، هەوڵ و کۆشش دەدات لەزەویدا تا ئاشوب بەرپا بکات و خراپـە بڕوێنێـت و کشـتوکاڵ لـەناو ببـات و پاکتـاوکردنی ڕەگـەزیی ئـەنجام بـدات، بێگومان خوا فەساد و خراپە و تاوانی ناوێت.

هەروەها دەفەرموویت:﴿وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي الْقُرَى إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَالِمُونَ﴾ [القصص: ٥٩]، واتە: وە نەبێت ئێمە شار و ولاتانمان کاول کردبێـت بـەبێ هـۆ، مەگـەر کاتێـك نەبێت کە دانیشتووانی ستەمکاربوون.

هەروەها فەرموویەتی:﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ الْقُرَى بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ﴾ [هـود: ١١٧]، واتە: پەروەردگارت بە ستەم خەڵکی شار و دێهاتەکان لەناو نابات، لەکاتێکدا خەڵکەکەی چاکەخواز و چاکساز بن.

لەقورئاندا نموونەی زۆر هەیە بۆ ئەم باسە، هەروەك لە فـەرموودەی سەحیحیشـدا گەنجینەیـەکی دەوڵەمەنـدی هیدایـەت و ئاڕاسـتەکردن هەیـە و زۆربـەی ئـەو دەقانـە چـاوەڕێی هــەوڵی زانسـتین، تـاوەکو لـە پـەروەردە و پێگەیانـدنی نـەوە و وەچـە و چاککردنی میتۆدی بیرکردنـەوە و پاڵفتـەکردنی ڕۆشـنبیریی و جـوان ئاڕاسـتەکردنیدا سوودیان لێ ببینرێت.

**شێواندنی چوارەم: شێواندنی گوتار (الخطاب):**

چـوارەمین شـێواندنی مەترسـیدار کـە زیـانی بـە عـەقڵ و ویـژدان و دەروونـی موسوڵمان گەیانـدووە، شـێواندنی گوتـاری ئیسـلامییە لـە سـەردەمی دابڕانـی نێـوان هەڵبـژاردەی فیکـری ئیسـلامی و هەڵبـژاردەی سیاسـیی و ئـەوەی لـەو دابـڕان و گۆشـەگیرییە لـە دەستەوەسـتانی فیکریـی لـەبارەی بـیری موماره‌سـە و ئیجتیهـاد و نوێکردنــەوە و داهێنــان سەرچــاوەی گرتــووە، کــە خســتوویەتییە ســەر فیکــری قوتابخانەیی دەقی داخراو، کە -لەسەردەمانی دواییدا- ئیجتیهاد بوونی نەما، تەقلید هاتە ئاراوە، بەجۆرێك کە گەشـتە ئـەوەی دەقـی لاواز، کـە لای هەنـدێکیان صـەحیح نەبوو، لە بۆچوون لەپێشتربوو.

شێواندنی گوتار لەو رەوشەدا، وەك ئەنجامی حەتمی فیکری گۆشەگیریو دابڕانـی نێـوان سـەرکردایەتیی فیکـری و سـەرکردایەتیی سیاسـی بـوو، ئەمـەش -بەگشـتی- پەیوەندیی بە نییـەت و نیازەکانـەوە نییـە، ئـەوەبوو گوتـار لـە گوتـارێکی فیکـری و ڕوانین و بیرکردنـەوە و قەناعـەتپێکردن و توانـای ئیجتیهـاد و نوێکردنـەوە و زاڵبـوون بەسەر گۆڕانکارییەکانی کـات و شـوێنەوە گـۆڕدرا بـۆ گوتـاری تۆقانـدن و زۆرەملـێو سەرکوتکردن، زۆرجـار پشـتی بـەو گێڕانەوانـە دەبەسـت کەگێڕانـەوەی تاکـە کەسـی (احاد)بوو لەلایەن کەسی بێئاگـا و فێڵبـاز و مەبەسـت خـراپ بـوو، کەلەسـەر خـراپ لێکدانەوەی ئەو دەقانەی گوتارێك بـوو کـە مەبەسـت لێیـان نکۆڵیکـاران و بێبـاوەڕ و خۆبەگەورەزان و شەڕخوازەکان بوو، بەمەش گوتاری ترساندنی ئایینی -بەو وێنەیە- بارەکەی قورسترکرد لە سەرکوتکردن و کپکردنی گیانی گشتی.

ئەو گوتەیەی ئەبوزەڕی قوتابی قوتابخانەی سـەردەمی وەحـی (ڕەزای خـوای لـێ بێت) کە بەدامەزرێنەری دەوڵەتی پادشاشینی زۆردار (الملك العضوض)ی وت لـەخۆڕا نەبووە، کاتێـك موعاویـەی کـوڕی ئەبوسـوفیان لەسـەر مینبـەر ڕاوەسـتا و باسـی لـە داهاتـەکانی ئوممـەت و بـەیتومالی موسـوڵمانان دەکـرد، پێیـدەوت "مـاڵی خـوا" و پیرۆزی دەخستەسەر، ئەبوزەڕ نارەزاییانە بەڕوویدا وەسـتا و بـۆی ڕاسـتکردەوە کـە

مـافی ئوممەتـە سەرپەرشـتی داهـاتی خـۆی بکـات و لێپرسـینەوە لەوانـە بکـات کـە سەرپەرشتیی دەکەن، ئایا جوان مامەڵەی پێوە دەکەن و مافی خاوەنەکەی بەجوانی دەدەن و پێیوت: "بەڵکو ئەوە ماڵی موسوڵمانانە".

بۆیە شتێکی سەیر نییە کە ئوممەت بەم دابەشـبوون و پەرتـەوازەیی و دواکەوتنـە گەیشتووە، لەکاتێکدا ڕوانینی مرۆڤـی موسـوڵمان بـۆ کۆمـەڵگا بـە پـەردەی لاوازیـی هەسـتی تـاك و هەسـت نەکردنـە بـە ئاساییشـی دەسـتبار بۆیـەکگرتنی کۆمـەڵ، ڕوانینینەکەشی بۆ کار و هەوڵدان لـە ژیـان، ڕوانینێکـی نـەرێنی خاڵییـە لـە ڕەهەنـدە ژیاری و ئاوەدانی و واتا ڕۆحییەکەی.

بۆیە کاتێك چەمکەکانی موسوڵمان دەشێوێنرێن، ئەم چەمکانە دەبنە کەرەستەی کەمکردنەوەی بەهای عەقڵیو هۆکارێك بۆ وێرانکردنی متمانەی مرۆڤ بەخۆی.

سەیر نییە کەئوممەت بگاتە ئەم نەرێنی و دواکەوتنەی پێی گەیشتووە، لەکاتێکدا لەژێر تۆقاندنی هەڵبژاردەی دەسەڵاتداردا دەناڵێنێت، کـە شـێوازێك بـۆ مامەڵـەکردن لەگـەڵ بەرهەڵسـتکارانی سیاسـەتەکانی و خـاوەن بۆچـوونانی پێچـەوانەی بۆچـوونی خۆیو بەرژەوەندییەکانی ئاشنا نییە، جگە لەسیاسەتی سـەرکوتکاری و داپڵۆسـین و قامچیو لێدانو کردنەوەی دەرگای بەندیخانەکان بۆ بەرهەڵستکاران، هەموو ئەمە لـە دەستەوسانییەوە بۆ لەخۆگرتنی گۆڕانکارییەکان و نەبوونی ئەو ڕێسا فیکرییـەی کـە یارمەتیدەری دەبێت بۆ پەرەسەندن و لەخۆگرتن و جوان بەجێگەیاندن و نەهێشـتنی گەندەڵی و خراپەکاری سەرچاوەی گرتووە.

گەر تۆقانـدنی گوتـاری ئـایینیی– کـە خـۆی لـە دۆزەخ و ئـازار و مەینەتییـەکانی دۆزەخ و گۆڕ و ڕۆژی حەشردا دەبینێتەوە: کە چاوەڕێی باوەڕداران دەکات وەك سـزا لەسـەر تـاوانی بچـووك و گـەورەیان، ئـەو سـزایانەی کـە چـاوی لەهـەموو جوڵـەو وەتانێکیانە لە بەرگ و خواردن و خواردنـەوەیان – چـووە پـاڵ تۆقانـدنی سیاسـی و کەلەپچـە و بەندیخانـەکانی، ئـەوکات هۆکارەکـانی خامۆشـبوونی ڕۆحـی ئوممـەت و

بێتوانایی و نەرێنیو دەستەوسانیەکانیو هۆکارەکانی تەقینــەوەی ڕووداوەکـانی درك پێدەکەین.

یـەکێك لـەو نموونـە ڕاسـتەوخۆیانەی کـە نزیکـە لـە بـیری خوێنــەر، هەنـدێ لـەو شێواندنەی تووشی گوتاری ئیسلامی هاتووە، ئەوەبوو کە لەکۆنگرەیـەکی ئیسـلامیی جیهانییدا بینیم و بابەتەکەی لەبارەی یەکبوونی ئیسلامییەوە بـوو، بابەتەکـە گشـتی بوو و هۆڵەکەش لە خەڵك و کەسانی بەشداربوو جمەی دەهات. لەبەر ئەوەی بابەتەکە –وادیارە– لە توانا و مەعریفەی قسەکەرەکەدا نەبوو، خەڵکەکە لەگوێگرتن لەوتارەکە وەڕسبوون، قسەکەرەکە بابەتەکەی گۆڕی – بەهەڵچوون و کتوپڕ و بێ هیچ بۆنەیەکی روون– چووەسەر بابەتی مردن و پاشـەڕۆژی مـرۆڤ کـە چ سـزایەك چـاوەڕێی کەسـی خراپـەکار دەکـات. وێنەیـەکی زینـدووی سـەیری گوزارشـتکار لـەخراپ بـەکارهێنانی گوتاری یـاد هێنانــەوەم هاتـە پـێش چـاو، کـە چـۆن گـۆڕدرا بـۆ گوتـاری تۆقانـدن و هەڕەشــە کــە قســەکەر دەیویســت لەڕێیــەوە بەســەر هۆڵەکــە ژاوە ژاوی هۆڵەکــەو جـەماوەری گـوێگردا زاڵ ببێـت و توانـای تێڕوانینــی ڕەخنەگرانـە و لێپرسـینەوەی وشیارانەی ئەو گوتانەی پێشەکەشیان دەکات نەهێڵێت.

نموونەیەکی دیکەی شێوازی بەکارهێنانی تۆقاندنی فیکـری و خـراپ بـەکارهێنانی هێما پیرۆزەکان، ئەوە بـوو کـە وتاربێـژێك لـە ڕۆژی هەینییـدا لـە بابـەت ڕوواڵـەتێکی مرۆڤەوە باسی کرد، ئەویش بابەتی ڕیش هێشتنەوە بوو، وتاربێژ توانای ئەوەی نەبوو حیکمەتی ڕیش هێشتنەوە بـۆ خەڵکەکـە ڕوونبکاتـەوە، بۆیـە بەباشـی زانـی شـێوازی ترساندن بەکاربهێنێت، ئەمەش لەڕێی گۆڕینی ئەم بابەتـە لەبابـەتێکی ڕوواڵەتییـەوە کەیەکێکە لەباغبەتـەکانی هەیئـەت، وەك قـژی سـەرو پۆشـاك، بـۆ بابـەتی عەقیـدەو ئیمان، بێباوەڕی و یاخیبوون، گریمانەی ئەوەی کرد، ئەوانەی ڕیش دەتاشـن ڕێبـازی پێغەمبەریان ڕەتکردووەتەوە، ڕەتکردنـەوەی فـەرمانی پێغەمبـەریش (درودی خـوای لێبێت) ڕەتکردنەوەی ئایینە، ئەو کەسەش ئایین ڕەتبکاتەوە بێباوەڕە.

کێشەکە لێرەدا ئەو بیرکردنەوە و مەنهەجەیە کە تاوەکو ئـەمڕۆ ڕێگـە بـەم شـێوە گوتارەو لـەم شـێوە فێرکردنـە دەدات، کەبەبـەکارهێنانی دەقـەکان بـەکارهێنانیان و بەکارهێنانی پیرۆزیەکەیان بەشێوەیەکی هەڕەمەکییانە، بێ لێکۆڵینەوەیەکی زانسـتی و میتـۆدێکی گشـتگیرانە کەسەرچـاوەکانی مەعریفـە تێیـدا تـەواو بـن، بـەبێ بـوونی پـەروەردە و فێرکردنێـك کـە عەقڵگـەلێکی وشـیار و دەروونگـەلێکی پێگەیشـتووانە پێبگەینرێت کە دەرکی لایەنەکانی ئەو باسانە بکات، کە لە واقیعی ژیان و کۆمـەڵگادا دەخرێنەڕوو.

لەبەر ئـەوەی بـەمجۆرە گوتـارە، مومارەسـەی پـەروەردە و فێربـوونی عەقیـدە و ئایین و ڕۆشنبیریی کراوە، کاریگەری فێرکردنی ئایینی–زۆربەی کات– لاواز و نەرێنیی بووە، دەکرێت ئەمە لە سستی و لاوازیی بەدەمەوەچوونی ئوممەت بۆ ئامۆژگارییەکان تێبینیی بکەین، هەروەها لە هەسـت و سـۆزەکانی منـداڵ بەرانبـەر ئـەو مەعریفەیـە و شێوازەکانی وەرگرتن و فێربوونی تێبینیی بکەین.

لەم بابەتەدا ئەوەندەمان بەسە ئاماژە بە پێغەمبەری خوا (درودی خـوای لێبێـت) بکەین، کە باوك و باپیر و پەروەردەکارێکی سەرکەوتوو بـووە، هـەرگیز لـە منـداڵێکی نەداوە، چونکە بەرانبەر منداڵ و تازە پێگەیشتووان نەرم ونیان‌و بەسۆز بووە.

یەکێك لەو نموونانەی کە گ وتاری پێغەمبەرایەتیی ڕووندەکاتـەوە نـەرم و بەسـۆز بووە بەرانبەر تازە پێگەیشتووان و پەی بەدەروونیان بردووە، ئەو باسەیە کە لەنێوان خـۆی و تـازە لاوێکـدا ڕوویـداوە، تـازە لاوێـك حـەزی شـەهوەتی بـۆ دروسـت بـووە و دێتــەلای پێغەمبــەر (درودی خــوای لێبێــت) و داوا دەکـات مۆڵــەتی پــێ بـدات بــۆ داوێنپیسیی، سەرباری ئەو ڕەوشتە ناشیرینە، پێغەمبـەر فـەرمان دەکـات بەرانبـەری نەرم بن و ڕێگەی بدەن بێتە پێشەوە و لەنزیك خۆیەوە دایدەنیشێنێت و دەیدوێنێت.

ئەوەی لێرەدا بـۆ ئێمـە گـرنگ بێـت، نـەرم دووانـدنی بـوو بـۆ ئـەو تـازە لاوە، بـە هەڕەشـەی سـزا و دۆزەخ نەیدوانـد، چـونکە گەنجەکـە بـۆ ئـەوە نـەهاتبوو حـوکمی داوێنپیسیی بزانێت، بەڵکو هاتبوو دەرەچە و چارەیەك بۆ گڕی شەهوەتی بدۆزێتەوە،

دەبینین پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) بە تێگەیشتنی بۆ سروشتی دەروونەکان، بەناخی دەروون و سروشتی ئەو گەنجە گەیشت و خودی خۆی کردە بڕیاردەر و شکۆ و شەرەفی خۆی بۆی کردە نموونە، لێی پرسی: ئایا ڕازیی دەبیت لەگەڵ دایکتدا داوێنپیسیی بکرێت؟ ئاخۆ ڕازییت لەگەڵ خوشکتدا داوێنپیسیی بکرێت؟ پاشان لێی پرسی: ڕازییت لەگەڵ پوورتدا داوێنپیسیی بکرێت؟

دەروونی بەرز و بەڕێزی هەمیشە شەرمەزاری و ڕیسوایی ڕەتدەکاتەوە، پێغەمبەری خواش (درودی خوای لێبێت) گەنجەکەی گەڕاندەوە بۆ ئەو حەقیقەتەی کە دەبێت دەروونە بەڕێزەکان لێی بەدووربن، دەروونی بەڕێز شتێکی بۆ خۆی پێ خۆش نەبێت بۆ کەسانی تریش پێی خۆش نابێت، بۆیە بە هەموو خۆشەویستی و زانین بە چەرمەسەرییە دەروونییەکەی پێی فەرموو: دە ئەو ژنانەش دایك و خوشك و پووری خەڵکانی دیکەن. بۆی پاڕایەوە، ئەوەش بۆی بووە هێزی دەروونی و پارێزگاری و ڕێگریی دەروونی بۆی.

کەواتە لەپاڵ میتۆدی گشتگیرانەی شیکاری ڕێکخراو و تەواویی سەرچاوەکانی مەعریفە لە فێرکردنی ئیسلامییدا، پێویستە ڕێوشوێنێکی ڕاوێژکاری هەڵبژێردراوی لێهاتوو لەڕووی زانستییەوە بدۆزرێتەوە؛ تاوەکو بۆچوون و ئیجتیهادەکان لەیەکتر جیابکاتەوە، ئەو بۆچوونە بۆ ئوممەت هەڵبژێرێت کە ئەهلی ڕاوێژ بە پشتبەستن بە بنەماکانی حوکمە نەگۆڕەکانی شەریعەت و مەبەست و دۆخی خەڵك لە بەرژەوەندیی و چاکەی ئوممەتدا دەیبینن و وەڵامدەرەوەی دۆخ و سروشتی دەروونەکان بێت و گونجاوبێت بە بارودۆخ و گۆڕانکارییەکان، بەوەش دەبێتە گوتارێکی بەڕاوێژ، بەلێهاتوییە شەرعی و سیاسییەکانیشی دەتوانێت قەناعەتی گەلان دەستبخات و ڕیزەکانی یەکبخات و وزە و تواناکانی بخاتەگەڕو پەیوەندی کۆمەڵگاکانیشی تۆکمە و بەهێز بکات.

ئەم شێوە میتۆدە مەعریفییە زانستییە ئیسلامییە کاتێك لەگەڵ ڕێوشوێنی شورادا یەکتر تەواو دەکەن، کەشوهەوایەك فەراهەم دێنێت کە بوار بۆ ئیجتیهاد و نوێگەریی

دەڕەخسێنێت، بێ ئەوەی شوێنەوارێکی نەرێنی هەبێت کە وەها لەو ئیجتیهادگەلە بکات ببێتە مایەی پەرتەوازەیی و زیاترکردنی دابەشکردنی ڕیزەکان و شێواندنی دەروونەکان، نابێتە مایەی نائارامی، بەڵکو تەشریعەکە لەڕووی بیروباوەڕ و سیاسییشەوە دەبێتە بەڵگەی جووڵانەوەی ئوممەت، بەمەش گۆڕانکارییەکانی دۆخی ئوممەت و لەسەر بناغەی یاسا نەگۆڕەکانی ئایینەکەی و سروشتی مرۆڤ و پێداویستی و تواناکانی کۆمەڵگا پەرەدەستێنێت.

شوێنەواری ئەو ترس و تۆقاندنەی کە تووشی گوتاری ئیسلامیی بووە، تەنها لەسەر گوتاری بەتەمەن و کامڵەکان نەبووەو بەس، بەڵکو پەلیهاوێشتووە بۆ هەموو ڕەنگ و شێوە گوتارەکانی تر، بەتایبەت گوتاری فێرکردنی منداڵان، بەجۆرێك کە بە میتۆدی پێگوتن و دەرخستن و بەدواداچوون و ناچارکردنی ماددی و مەعنەویی ڕەنگرێژکراوە، هێما و نیشانە پیرۆزەکان خراوەتە کار بۆ سەرکوتکردنی گیانی ڕەخنە و پشکنین و جیاکردنەوە، ملکەچبوونی کوێرانە هاتووەتە ئاراوە، بۆ دەستەواژەی: "دەبمە کۆیلەی هەرکەسێ پیتێکی فێرکردبم".

### شێواندنی پێنجەم: عەقڵییەتی ئەفسانە و شتی پڕوپووچ

شتێکی سەیرە عەقڵییەتی ئەفسانە و شتی پڕوپووچ لە ئوممەتی قورئاندا بڵاوببێتەوە، ئەو قورئانەی کە بانگەواز دەکات بۆ بیرکردنەوە و هەوڵدان و ڕوانین و تێفکرین و پەرۆشی و چاکەکاری و ئیجتیهاد و جیهاد و کۆشش و کارکردن و گەڕان بەدوای وەرگرتنی هۆکارەکاندا.

بەڕاستی سەیرە عەقڵییەتی بێبنەماو پڕوپوچ‌و چاوبەس لە ئوممەتی پێغەمبەرێکدا گەش و نما بکات؛ کە ژیاننامە و سەربووردەی ژیانی ئەو گومانێك هەڵناگرێت، لەوەی بەدوای هۆکار و ڕێوشوێنگرتنی کاروبارەکانەوە بووە و کۆششی کردووە لە ڕووبەڕووبوونەوەی هەر شتێك هاتبێتەڕێی و بەرەنگاری بووبێتەوە.

بەڵکو سەربووردەی ژیانی ئەو و گەیاندنی پەیامەکەی مرۆڤانە و بەشوێنکەوتنی هۆکارەکان بووە، دەربڕینی قورئانییش لەبارەی سروشتی مرۆیی ئەوەوە زۆر ڕوون و بەرچاوە، ئەو گورزی لە دوژمنەکانی دەوەشاند و دوژمنەکەشی گورز لە خۆی و هۆزەکەی دەوەشاند، سەردەکەوت و دەشکا، لەشساغ دەبوو، نەخۆشیش دەکەوت، برسی و تینووش دەبوو، – جگە لە بابەتی پەیامدارییـ– لە شتی تردا دەیپێکا و بەهەڵەشدا دەچووە.

ئەو داهێنەر بوو لە ڕێوشوێنگرتن و پلاندانان و بەڕێوەبردنی شەڕ و ئاشتی: ﴿قُلْ لَا أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ وَلَوْ كُنْتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لَاسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾، [الأعراف: ١٨٨]، واتە: (ئەی محەمەد (درودی خوای لێبێت) پێیان بڵێ: کە من ناتوانم هیچ قازانج یان زەرەرێك بەخۆم بگەیەنم مەگەر ویستی خوای لەسەربێت، خۆ ئەگەر غەیب و شاراوەکانم بزانیبایە ئەوە چاکەی زۆرم کۆدەکردەوە بۆ خۆم و هیچ ناخۆشییەکیشم تووش نەدەبوو، من هیچ شتێك نیم تەنیا ترسێنەرێك (بۆ یاخییەکان) و موژدەدەریشم بۆ کەسانێك کە باوەڕ دەهێنن.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿قُلْ لَا أَقُولُ لَكُمْ عِنْدِي خَزَائِنُ اللَّهِ وَلَا أَعْلَمُ الْغَيْبَ وَلَا أَقُولُ لَكُمْ إِنِّي مَلَكٌ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَى إِلَيَّ﴾ [الأنعام: ٥٠]، واتە: ئەی محەمەد (درودی خوای لێبێت) پێیان بڵێ: من پێتان ناڵێم گەنجینەکانی خوا لای منە، هەروەها لە نهێنی و شاراوەکانیش هیچ نازانم و ئاگادار نیم و پێتان ناڵێم بەڕاستی من فریشتەم، بەڵکو تەنها شوێنی ئەوە دەکەوم کە بە وەحی و نیگا پێم دەگات.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ﴾، [الكهف: ١١٠]، واتە: (ئەی محەمەد (درودی خوای لێبێت) پێیان بڵێ: بەڕاستی من تەنها ئادەمیزادێکم وەك ئێوە، بەڵام ئەوەندە هەیە وەحی و نیگام بۆ دێت.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِنْ مَاتَ أَوْ قُتِلَ انْقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ﴾، [آل عمران: ١٤٤]، واتە: (محەمەد (درودی خوای لێبێت)

تـەنها پێغەمبـەرێك نـەبووە وەفـات بكـات، بێگومـان پێغەمبـەرانی پـێش ئـەمیش (وەفاتیـان کـردووە)، ئایـا ئەگـەر وەفـاتی کـرد یـان کـوژرا و شـەهید بـوو ئێـوە پاشگەزدەبنەوە و هەڵدەگەڕێنەوە؟!

ئاخۆ چۆن زۆربەی هەڵگرانی ئەم پەیامە و شوێنکەوتەکانی ئەم پێغەمبەرە بەرێزە پشتیان لێ کردەوە و خۆیان ڕادەستی چاوبەس‌و خۆهەڵخەڵەتاندن کـرد و هێشـتیان جادووبازی بەسەر عەقڵ و ڕازی دڵیاندا زاڵ بێت؟!

## پشت بەخوابەستن و پشتلێکردنەوە:

هەزاران ئایەتی قورئانی پیرۆز ئاڕاسـتە دڵ و عـەقڵ کـراوە، بەڵگـە دەهێنێتـەوە و بانگی دەکات بۆ کارکردن، بەرپرسیارێتی دەخاتە سەر مرۆڤ، فەرمان بـە موحەممـەد (درودی خـوای لێبێـت) دەکـات تێبکۆشـێت و جیهـاد بکـات و بـەدوای وەرگرتنـی هۆکارەوە بێت ((بیبەستەرەوە و پشت بەخوا ببەستە))[1]، دووپاتیشی دەکاتـەوە کـە خوای پەروەردگار: ﴿الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى (٢) وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَى﴾، [الأعلى: ٢ – ٣]، واتە: ئەو زاتەی هەموو شتێکی دروستکردووە بـەجوانی و ڕێکوپێـك و تێـر و تـەواویی کردووە. ئەو زاتەی کە نەخشەی کێشاوە بۆ هەموو شتێك و جا ڕێنموونیی کردووە.

پـەروەردگار دەفـەرمووێت: ﴿ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا﴾، [الكهف: ٨٩]، واتـە: لـەوەودوا کەڵکی تەواوی لە هەموو هۆکارەکان وەرگرت و بەشوێنیاندا گەڕا. ﴿وَأَنْ لَيْسَ لِلْإِنْسَانِ إِلَّا مَا سَعَى﴾ [النجم: ٣٩]، واتە: بەڕاستی ئادەمیزاد خاوەنی هیچ شتێك نییە، تـەنها ئەوە نەبێت کە خۆی کردوویەتی.

بۆیە بە کارکردن و هەوڵ و تێکۆشان لەڕێگەی هۆکارەکانی دروستبوون و خۆڕسك و، داواکـاری یاسـا خواییـە گەردوونییـەکان، ئامادەسـازی بـۆ دەستخسـتنی بەرهـەم دێتەدی، لەهەموو ئەمانەدا نەئەفسانە، نە جادوویی بوونییان نییـە، هـیچ واتایـەکیش بـوونی نییـە کـەژ بێـت بـە واتاکـانی پشـت بەخوابەسـتن و هـەوڵ و تێکۆشـان و

[1] - الترمذي، الجامع الصحيح (سنن الترمذي)، مرجع سابق، ج٤، ص٦٦٨، حديث رقم: ٢٥١٧.

شوێنکەوتنی یاسا خواییەکانی گەردوون، کە لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی ژیاندا هیچ جێگرەوەیەکیان نییە.

لەراستیدا حەقیقەتی پشت بەخوابەستن و پاڕانەوە و سوودی ئەو دوانە، دوای ئەوە دەبێت کە بەندە کاری کردبێت و هەوڵی دابێت و ماندوویەتی دیبێت، مەبەستی لەو پشتبەستن و پاڕانەوەیە داوای هاوکاری و یارمەتیی لە خوا بێت لەو کاروبارە هەمەکییەکانی گەردوون کە پەییان پێ نابەین و لە توانای زانستی ئێمەدا نین و دەسەڵاتمان بەسەریاندا ناشکێت، بەتەنها خوای گەورە زانست و فەرمانیانی بەدەستە و بەڕێوەیان دەبات.

بەڵام دەسەوسانی و تەمبەڵی و وازهێنان لە گەڕان بەدوای یاسا گەردوونییەکان و هۆکار وەرگرتن و تەنیا دانیشیت و بپاڕێیتەوە، ئەوە پشتلێکردنەوە و لادانە لەڕێگەی ئیسلام و یاسا گەردوونییەکان، ئەمە هەروەك ئەوانە وایە کەپەنا دەبەنە بەر جادوو ئەفسانە و ڕێگەی فێڵباز و جادووباز و درۆزنان، ئا ئەوەیە ئازار و لادان و گومڕایی و کەوتنە سەرولێژایی بێباوەڕی و هاوبەش بڕیاردانەوە.

پێش ئەوەی بچینەسەر ئەو باسانەی پەیوەندییان بە ئەفسانە و شتی پڕوپووچەوە هەیە، گرنگە نموونەیەك بهێنینەوە کەپەیوەندی ئیسلامییانەی نێوان هەوڵ و پەرۆشی و ڕۆیشتن بەدوای هۆکار، لەگەڵ پاڕانەوە و پشتبەستن بە خوای گەورە بۆ دەستخستنی شتەکان روون بکاتەوە.

وەك نموونەی خوێندکارێکە کە مامۆستا وانەی پێ دەڵێتەوە، لەسەر خوێندکارەکە ئەرکە بیخوێنێت و تێیبگات و لەمێشکیدا هەڵیبگرێت، ئەگەرنا بەپێی یاسای هۆکار لەو وانەیەدا سەرکەوتوو نابێت، سوننەتی خوای گەورەش کە لە یاساکانی سروشتەکاندا دایناوە بەهەمان شێوەیە، بۆیە بۆ بەدەستهێنانی بەرهەم دەبێت کار بەو یاسایانە بکرێت و هەوڵ و تێکۆشان بدرێت، تەنیا یادکردنەوە و خوێندنەوە بەس نییە، تا بتوانی سەرکەوتن بەدەستبهێنیت، چونکە سەرکەوتن تەنیا

بەهۆكارە ڕاستەوخۆكانەوە پەیوەست نییە، بەڵكو لە پشت ئەوەوە بەهەمەكی گشتی فراوانترەوە پەیوەستە.

هەندێكجار ڕووداوێك دەبێتـە ڕێگـر لـەوەی خوێندكارەكـە بەشـداری تاقیكردنـەوە بكات، یان دەچێتە هۆڵی تاقیكردنەوەوە و دوای وەرگرتنی پەڕەی تاقیكردنەوە بیری دەچێتەوە پرسیارێكی بەجێهێشتووە، یان وەڵامـی هـەموو پرسـیارەكان دەداتـەوە و دواتر بۆی دەردەكەوێت بە هەڵە وەڵامی پرسیارێكی داوەتەوە. دەبێت بزانین هـەموو ئەوانە كاروبارگەلێكی گشتین، مرۆڤ ناتوانێت لەپێشدا ئەگەریان بكات –لەپاڵ هەوڵ و تێكۆشانیدا– هیچ ڕێگەچارەیەكی نییە جگە لەپشتبەستن بەخوای گەورە، كە خاوەن بڕیــار و هەڵســوڕێنەری گەردوونــە، دەبێــت لێــی بپاڕێتــەوە و داوای هاوكــاری و سەركەوتنی لێ بكات، میتۆدی ئیسلامیش لەژیانـدا بەوشـێوەیەیە، ئـا ئەمەیـە واتـای پشت بەخوابەستنی دروست و پاڕانەوەی دڵسۆزانە.

**تۆقاندن و سەركووتكردن و دواكەوتن، ژینگەی ئەفسانە و جادوبازین:**

ئەم شـێواندنانەی كـە تووشـی عـەقڵی موسـوڵمان بـووە، ژینگەیـەكی لـەباری بـۆ فیكری ئەفسانە و شتی بێبنەما فەراهەم هێناوە. كاتێ كە جەماوەری ئوممەت بوونـە نێچـیری سـتەمكاری و تـرس و ترسـاندنی سیاسـی و تۆقانـدنی فیكـری، گـیرۆدەی ملكەچـبوون و نـەرێنی بـوونو وردە وردە لــە گــەڕان و بەدواداچــوون و بونیادنــان و داهێنان دووركەوتەوە، تا وایلێهات لە نێو هەژاری و ئەفسانە و نەزانیـدا ڕۆ بچـێت، ئـا لێـرەوە مـرۆڤ متمانەبـەخۆبوونی نامێنێـت و جڵـەوی كاروبارەكـانی ژیـانی لەدەسـت دەدات و كۆنترۆڵكردنی پێشهاتەكانی جیهانەكەی لەدەست نامێنێت.

بۆیە سروشتییە نموونەی ئـەم مرۆڤـە كـە لـەقوڵایی گێلـی و نـەزانی و بێتوانـای و دەستەوەستانی و ئازاری چەرمەسەرییەكانی خۆیەوە بـەرەو ناوچەرگـەی ئەفسـانە و شتی پڕوپووچ و هەرشتێك بڕوات كە برەو بەلێكدانەوە و سەربوردەو ئەفسـانە بـدات، ئامادەیە بۆ گوێڕادێران، كالاكە لای ئەم ڕەواجی هەیـە، لەنـەفامێتی خۆیـدا پـەنا بـۆ

گومانـه بێبـەها هۆشـبـەرەکانی دەبـات کـه چەرمەسـەری وای ی بـۆ دەسـازێنێت کـه بەهۆی نەفامیەکەیەوە بێئاگایە لە لەهۆکارەکانی، بـەهۆی دەستەوسانیشـیەوە هـیچ شتێکی بۆ دوورخستنەوەی لەتوانادا نییە، چـونکە ڕۆشـنبیری و دەروون و تواناکـانی تووشی زۆرێك پەککەوتن هاتوون و بێبەشیکردووە لەبەشی زۆری هێزی عەقڵیی یاسـا گەردوونییــەکان و گیــانی داهێنــان و دەستپێشــخەری و توانــای لێکۆڵینـــەوە و بەدواداچـوونو هەڵهێنجانـدن، کـه هـیچ ئوممـەتێکی سـەر ڕووی زەوی لـه ئوممـەتی قورئان بۆ ئەوە لەپێشتر نییە.

**کارەسات لە بەکارهێنانی ئایین و پیرۆزیی بۆ خزمەتە ئەفسانە و جادوبازی:**

بـۆ ئـەوەی نەخۆشـی ببێتـه بـەلاَ، نەهامـەتی و تـا ببێتـه تـاعون، دوومـەڵ ببێتـه شێرپەنجە، شێواندن ببێتە دەرد، هەتا ڕەگوڕیشە دابکوتێت و دەردەکە جێـی خـۆی بگرێـت و چارەسـەری ئـەو هـەموو ناخۆشـی و بەڵایانـەی کـه ڕووبـەڕووی ئوممـەت بوونەتـەوە لـەتوانادا نـەبێت، نەگەڕێتـەوە بـۆ بـرەودان بـە هـیچ زانسـتێك و هـیچ داهێنانێکی نەبێت و هیچ کارێك بەجوانیی ئەنجام نـەدات، هـەموو ئەمانـە لـە ڕێگـەی پیرۆزیی خستنە سەر زۆرێك لە ئەفسانە و شتە بێبنەماکان و برەودانی زۆر بەبابـەتی شـوێنەوار و ئەفسـانە و باسـی ئیسـرائیلی و خـراپ بـەکارهێنانی هەنـدێ ئامـاژەی مێژوویی کە لەقورئاندا هاتوون دروست دەبێت.

کاتێك پێگەیشتنی مرۆڤ و میتۆدی بیرکردنەوە و ڕێبەری ژیانی کامڵ بوو، پـەیامی قورئان و ڕووناکی هیدایەتەکەی لە پەیوەندی مـرۆڤ لەگـەڵ گـەردوون و ئـەو هۆکـار و نهێنییانەش کە خوای گەورە لەگەردووندا دایناوە بەوەحی بـۆ عـەقڵی مـرۆڤ دابـەزی، ئەو حاڵ و بارودۆخانە گۆڕدرا و پێگەی مرۆڤیش لەگەڵیدا گۆڕدرا تـاوەکو بـە عـەقڵ و زانستی خۆی جیهانی خـۆی بـەڕێوە ببـات، لـە دەرەوەی خـۆی، لەدروسـتکراوەکانی دیکەی گەردوون هـیچ شـتێك دەسـەڵاتی بەسـەریدا زاڵ نـەبێت یـان هەڵیبسـوڕێنێت، لەبەر ئەوە: ﴿فَمَنْ يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَابًا رَصَدًا﴾، [ الجن: ٩]، واتـە: ئێسـتا

ئەوەی بیەوێت گوێ بگرێت ڕاستەوخۆ نەیزەکێکی بۆ ئامادەیە و بۆی دەهاوێـژرێت و لەناوی دەبات.

بـەڵکو قورئـانی پـیرۆز روونیکردووەتـەوە، ئـەوەی جادووگـەر و سـاحیران لـەو سەردەمانەی پێشوودا ئەنجامیان داوە، وەك حەقیقەت نیشـانیان داوە، تـەنیا فێـڵ و هەڵخەڵەتاندنی دەروون و چاوەکان بووە: ﴿قَالَ أَلْقُوا فَلَمَّا أَلْقَوْا سَحَرُوا أَعْيُنَ النَّاسِ وَاسْتَرْهَبُوهُمْ﴾ [الأعـراف: ١١٦]، واتـە: موسـا وتـی: دە ئێـوە دەسـتبەکاربن و دایبەزێنن، جـا کاتێـك دایانبەزانـد، جادوویـان لـە چـاوی خـەڵکی دەکـرد و ویسـتیان بیانترسێنن. ﴿قَالَ بَلْ أَلْقُوا فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِنْ سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَى﴾ [طـه: ٦٦]، واتـە: موسـا وتـی: نـەخێر ئێـوە لەپێشـدا دەسـت پـێ بکـەن، جـا هـەر دەستیان پێکرد پەت و گوریس و دار و چـێوەکانیان وا دەهێنرایـە بەرچـاوی بـەهۆی جادوویانەوە، بێگومان وەك مار بەخێرایی دەڕوات.

﴿إِنَّمَا صَنَعُوا كَيْدُ سَاحِرٍ وَلَا يُفْلِحُ السَّاحِرُ حَيْثُ أَتَى﴾ [طه: ٦٩]، واتە: بێگومـان ئەوەی کردوویانە تەنها فێڵ و تەڵەکەی جادووگەرە، جادووگەریش بۆ هەر کوێ بچێت و هەرچی بکات سەرکەوتوو نابێت.

بەبێ ویستی خوای گەورە توانای قازانج و زیانیان نییە، کاریگەریی خراپیشیان کە هەتا ئەمڕۆ پەنای بۆ دەبەن تەنیا بەهۆی فێـڵ و تەڵەکەوەیـە و لـەو ڕێگەیـەوە زیـان دەدەن.

تەنانەت پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێـت) کاتێـك پـەیامی ئیسـلامەتی ئاڕاستەی هەموو جیهان کردووە، لەوانە جیهانی جنۆکە، خودی خۆی لەوەدا جنۆکەی نـەبینیوە، بـەڵکو هـەواڵی پـێ درا کـە جنۆکـەکان گوێیـان لێگرتـووە، جیهـانی ئـەم پەیوەندیی بە جیهانی ئەوانەوە نەکرد: ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا﴾، [الجن: ١]، واتە: ئەی محەمەد (درودی خوای لێبێت) پێیـان بڵێ: وەحی و نیگام پێڕاگەیـەنراوە کـە بەڕاسـتی دەسـتەیەك لـە جنۆکـەکان گوێیـان گرتووە بۆ خوێندنەوەی قورئان.

ئیبلیسیش گەرچی خوای گەورە لەقورئاندا ئاماژەی پێداوە و هەمووشمان هەستی پێ دەکەین کە دەتوانێت وەسوەسە بۆ مرۆڤ دروست بکات، بەڵام توانای بەسەر مرۆڤدا نییە و ناتوانێت کۆنترۆڵی بکات، بەڵکو ئەوە خودی مرۆڤە ئازادانە گوێڕایەڵی دەبێت: ﴿إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ إِلَّا مَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْغَاوِينَ﴾، [الحجر: ٤٢]، واتە: بەڕاستی بەندە چاك و پاکەکانی من بە تۆ فریونادرێن و تۆ هیچ دەسەڵاتێکت نییە بەسەریاندا، جگە لەوانەی کە شوێنتکەوتوون لە سەرکەش و یاخی و سەرگەردانەکان. هەروەها پەروەردگار دەفەرموویێت: ﴿إِنَّهُ لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾، [النحل: ٩٩]،[١] واتە: بێگومان شەیتان دەسەڵاتی نییە بەسەر ئەوانەدا کە باوەڕیان هێناوە و پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن.

خوای گەوەی بۆ مرۆڤی سەردەمی کۆتا پەیام خێر و خۆشی ویستووە، نەك خراپە و ناخۆشی –بە ویستی خۆی– لە هەموو دەسەڵاتێك جیهانی بۆ پوخت

[١]– یەکێك لەو هەڵانەی کە خەڵکی تێیکەوتوون و نووشتەچیان پەنای بۆ دەبەن، بابەتی دەستلێوەشاندنە (المس)، قورئانی پیرۆز باسی دەستلێدانی شەیتانی کردووە، نەك بەو جۆرەی سوودخۆرەکان باسی لەبارەوە دەکەن: ﴿الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَا﴾، [البقرة: ٢٧٥]، ڕوونە ئەم وێنە ڕەوانبێژییەی قورئان گومڕایی سوودخۆران و یاخییەکان لەبەردەم فەرمانەکانی خوا وەسف دەکات بەوەی لە گومڕایی و لادان لە حەق دەستی لێوەشاندوون، ئەمە پەیوەندیی نییە بە نەخۆشییە عەقڵی و دەروونییەکانەوە، چونکە سوودخۆران لەدونیادا گەرچی خەڵکانی لادەر و گومڕان، بەڵام ژیر و بەرپرسیارن، پەیوەندیی بەوەوە نییە نەخۆشیی جەستەیی عەقڵی و دەماریی دەروونییان هەبێت، ئەمە ڕوونە لە شوبهاندنی بەروبوومی دۆزەخ لە زیان و ناشیرینیدا لێکچووی: ﴿طَلْعُهَا كَأَنَّهُ رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ﴾، [الصافت: ٦٥]، پێچوێندراو بە نەریت لای بیسەر شتێکی ناسراوە، سەری شەیتانەکان کەس نازانێت چۆنە، بەڵام لە دەروونی مرۆڤەکاندا شێوە ناشیرینییەکەی جێی گرتووەتەوە.

هەرکەسێك وەها بانگەشە بکات کە نەخۆشییەك لە نەخۆشییەکان پێیدەوترێت دەست لێوەشاندنی جنۆکە، ئەوە فڕوفێڵبازەو هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە.

کردووەتەوە، جگە لەدەسەڵاتی خۆی و بەجێنشینگرتنی، گەردوونی بۆ مرۆڤ فەراهەم کردووە ئاوەدانی بکاتەوە و ئیرادەی تیادا دەربخات و تەنیا بە زانست و هەوڵی خـۆی کانزاکانی دەربکات، ئیتر جیهانێك نەمایەوە بەسەر جیهانی ئەودا زاڵ بێت و ئـیرادەی ئیفلیج بکات و ڕۆڵی کاول بکات و بەرپرسیارێتییەکەی ڕەتبکاتـەوە و دەستەوەسـتان و بێئیرادەی بکات، بـەڵکو ئـیرادە ئـیرادەی خـۆی بێـت و کـرداریش کـرداری خـۆی و بەرپرسیارێتییش تەنیا بەرپرسیارێتیی خۆی بێت:﴿فَمَنْ يَعْمَـلْ مِثْقَـالَ ذَرَّةٍ خَيْـرًا يَـرَهُ (٧) وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَـرًّا يَـرَهُ﴾، [الزلزلـة: ٧–٨]، واتـە: جـا ئـەوەی بەقـەدەر سەنگی گەردیلەیەك خێر و چاکەی ئەنجام دابێت دەیبینێتەوە.

﴿وَلَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلَّا عَلَيْهَا وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْـرَى﴾، [الأنعـام: ١٦٤]، واتـە: هیچ کەسێك هیچ گوناهێك ناکات لەسەر خـۆی نەکـەوێت، هـیچ کەسـێك بـاری گرانـی کەسی تر هەڵناگرێت.

﴿ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾، [البقـرة: ٢٨١]، واتـە: لـەوەودوا هەموو کەس پاداشتی کاروکردەوەی خۆی وەردەگرێت و ستەمیان لێ ناکرێت.

﴿وَمَا أصبكم مِن مصيبة فبما كسبت أيديكم ويعفوا عـن كـثير﴾، [الشـورى: ٣٠]، واتە:ئەوەی تووشتان بووە لەناڕەحەتی بـەهۆی ئـەو کارانەوەیـە کەئـەنجامتان داوەو خوای گەورەش لەزۆریش بوراوە.

ئەم ڕوانینە قورئانییـە، ڕوانینـی زانسـت و بیرکردنـەوە و تێفکرینـە، بەڵگـەی ئـەو هـەوڵ و تێکۆشـان و کـار و جیهـادو ئیجتیهادەیـە کـە تۆزقـاڵێکیش بەتەرازووەکـەی کێشانە دەکات، بەڵام پاش ئەوەی بیری ناچاری و دواکەوتن و عەقڵی لاسـاییکردنەوە و تێکشکان شێواندی، تەنیا هەندێ ئاماژەی کورتی قورئانیی و فەرموودەی سـەحیح وەردەگیردرێت، بەهۆی بێئاگایی "پیاوچاکانەوە" ڕاستو هەڵەی لێکدانـەوەکانیش– پڕ بووە لەدەقی ئاحادی لاواز و هەڵبەستراوەوە–، لێرەوە فێڵکـاران و خـاوەن نیـازە خراپەکان و گێڕەرەوانی ئەفسانە و باسە ئیسرائیلییەکان کـاری خۆیـان کـردووە، بـۆ

ئەوەی ڕەوایەتی بدەنە بیری ئەفسانە و جادووبازی و هەستی ئیسلامییانەی قورئانیی بەنج دەکرێت و پاشان ئوومەت ڕادەستی دواکەوتن و نەزانیی زیاتر بکرێت.

باشتر وابوو بۆ ئەوانەی وا ڕۆچوونە نێو باسکردنی جیهانی پەنهانی جنۆکە و شاراوەی دەرەوەی هەست و پەیبردنەکانی مرۆڤ، کەهەستەکانو عەقڵی مرۆڤ توانای ئاگاداربوون لێیانی نییە، راست و ناڕاستی گێڕانەوەکانیان لەیەکتر جیابکردبایەتەوە و لە سنووری ئامـاژە و مەبەستەکانی قورئانـدا ڕابوەستابایەن و پابەنـدی میتـۆدی ڕوانینـی دروست بوونایـە تێیانـدا، ئـەو میتـۆدەی کـە پشـت بەڕێسـا گشـتییەکان و مەبەستەکانی شـەریعەت و شـوێنەوار و کاریگـەریی کـات و شـوێن و حەقیقـەتی ئـەو تەحەدیانـە دەبەسـتێت کـە ئوممـەت ڕووبـەڕوویان بووتـەوەو ئـەو کێشـانەی بەدەستیانەوە گیرۆدەیە. لەگرنگترینی ئـەو ڕێسـا میتۆدەییانـەی کـە –بـە بۆچـوونی ئێمـە– پێویسـتە لـە کاروبـارە پەنهانەکانـدا پێـوەی پابەنـدبین، ڕێسـای گێڕانـەوەی موتەواتیرە کە ئەستەمە درۆی لەگەڵدا کۆبێتـەوە. لەبەرئـەوەی کاروبارەکـانی غـەیب ناکرێت لەڕووی عەقڵ و شارەزایی و ئەزموونەکانی هەست و پەیوەندییە مرۆییەکانەوە دادگـایی و پشـکنین بکرێـت، بۆیـە پێویسـتە لەسەرچـاوە موتەواتیرەکانـەوە وەربگیردرێت.

خۆ ئەگەر توێژەران لەڕووی تێگەیشتنی دەقەکان و ڕەخنە لێگرتنیانەوە پابەندی مەبەست و بنەماکان بوونایـە، هـەروەها پابەنـدی وردبـوون لـە پشتبەسـتن بـەدەق و ڕەخنەگرتن لەڕشتەی گێڕانەوەی بوونایە، ئەوا ئوممەتیان لـە هەسـتانەوە و کـەوتنی گەورە و سەخت بەدووردەخستەوە، نەیاندەهێشت زۆرێك لە بابەتی درۆ و شـێوێندراو و زیادکراو و ئیسرائیلیی بەپیرۆز بـزانن. دەیـانتوانی ئوممـەت بـەدووربگرن لـە خـراپ لێکدانەوە و ئەو ناچارکردنەی کە لەسـایەی دەستەوەسـتانی و ترسـاندن و زۆرداریـدا یارمەتیدەربوو لەوەی ئوممەت ڕادەستی بیری ئەفسانە و لەکارخسـتنی عـەقڵ بێـت و جڵـەوی بکەوێتەدەسـت کەسـانی فرۆفێڵبـاز و جادووبـاز و بکەوێتـە دوای کـاروانی دەستەوەستانی و دواکەوتن.

**پاڕانەوە و نووشتە پەیوەندییەکی دەرونییە، نەوەك پیشە و خۆبەسەرخوادا فەرزکردن:**

یەکێکی تر لەو شتانەی جێی داخ و خەفەتن، ئەوەیە هەندێ کەس پاڕانەوە و نوشتە بە قورئانی پیرۆز بەکاربهێنێت بۆ ئەوەی دەرگای شتی پڕوپوچ بکاتەوەو جادووبازی بکاتە پیشە، کاتێك پاڕانەوە ببێتە پیشەیەك و هۆیەك بۆ کۆکردنەوەی سەروەت و پلەوپایە و, کەسانێك خۆیانی پێ تایبەت بکەن، یان خەڵك بەکردار –بە وشیاری یان ناوشیارییەوە– کەسانێك تایبەت بکەن بەوەی بە بەڕێوەبردنی توانای خوایی و ببنە نێوەندگیری نێوان خوا و بەندەکانی؛ لە شیفادان و جێبەجێ کردنی پێویستییەکانیان، خەڵکییش بەم کارەیان، وەك ئەوە وایە بڕیاری چاکی و نزیکیی ئەوانەیان لە خوای گەورە دابێت و، تایبەتیان کردبێت بە پەنابۆبردنیان بۆ جێبەجێکردنی پێویستییەکانیان، ئەوانەش بەمە –بە کردار– ڕەحمەتی خوایان خستۆتە ژێر دەستی خۆیان و، ملکەچی پایەو دەسەڵاتی خۆیانیان کردووە –جا خۆیان هەرچییەکی دیکە بڵێن–، ئەوەش بووەتە پیشەو پایەو دەسەڵات بۆیان لەناو خەڵکدا، ئەمە لەکاتێکدایە کە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ﴾، [البقرة: ١٨٦]، واتە: (ئەی محەمەد (درودی خوای لێبێت) ئەگەر بەندەکانم پرسیارت لێبکەن دەربارەم، ئەوە من نزیکم لێیانەوە، بە هانا و هاواری دۆعاگۆیانەوە دەچم، هەر کاتێك لێم بپاڕێنەوە و نزا بکەن.

بێگومان خوای گەورە گوێبیستی پاڕانەوەی بەندەکەیەتی و، بەنهێنییەکانیان ئاگادارە و بە حیکمەتی خۆی بەوەی شیاویان بێت پاداشتیان دەداتەوە، خەڵکانی کۆستبار و مەینەتباریش لەپێشترینی خەڵکین بە گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورەو ڕووتێکردنی بە پاڕانەوە: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ﴾ [ق:١٦]، واتە: سوێند بەخوا بێگومان ئێمە ئادەمیزادمان دروستکردووە و چی بەدڵ و دەروونیدا دێت، ئێمە لە شاڕەگی دڵی لێی نزیکترین.

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾ [غافر:٦٠]، واتە: ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان فەرموویەتی: ئێوە هانا و هاوار بۆ من بهێنن، ئەوە من دوعا و نزاتان گیرا دەکەم.

هەرچی داواکردنە لە دایك و باوك، تاوەکو بۆت بپاڕێنەوە، یان لەوانەی خزم و دەوروبەریان بە چاکیان دەبینن، ئەوە کارێکی خوازراوە(مستحب)، ئەگەر بە ڕاستەوخۆیی و بە گیانی پەیوەندی و چاکەکاری و سۆز و خۆشەویستیی لەنێوان کەسەکاندا بکرێت، نەك بە گیانی فرتوفێڵ و هەڵبەستنی پێگەیەك بۆ خۆی کە دەتوانێت بڕیار لە سۆز و بەزەیی خوا بدات.

گرنگە داواکردنی پاڕانەوە لەو کەسەی بە چاکی دەزانیت، نەبێتە هۆی ئەوەی خۆت لەتەوبە و پەشیمانیی ببوێریت و، کۆشش نەکەیت بۆ چاکبوون و نزیکبوونەوە لە خوای گەورە؛ تاوەکو شیاو بیت بەوەی پاڕانەوەکانت شایستەی وەڵامدانەوە بێت.

داواکردنی دوعا لە خەڵکی چاکەکار، دەبێت هاوکات بێت لەگەڵ هەوڵی چاککردنی دەروونی خۆشمان و، پاڕانەوەکەی دەبێتە ئامڕازێك بۆ زیاتر نزیکبوونەوە لە خوای گەورە، نەك ببێتە ئامڕازێك بۆ تەمبەڵی و ناوشیاری.

بەم شێوەیە, ئەوانەی مەینەتبارن و داوای پاڕانەوە دەکەن لە دایك و باوکیان و, لەوانەی بە دڵسۆزی و چاکەکاری و یارمەتیدانی خەڵکانی خاوەن پێداویستی ناسراون، هیچ ئەنجامێك ناپێکێت، تەنها ئەگەر بەڕاستەوخۆیی و پەیوەندییەکی دەروونی بێت. لە کارەسات و بەڵا گەورەکانیشدا پاڕانەوەکە تەواوی خەڵکی دەگرێتەوە، ئەوەش وادەکات پشت بەخوا پاڕانەوەکە گیرابێت و، پەیوەندی خۆشەویستی و هاوکاریی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگا بەهێز بێت: ﴿ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً﴾ [الأعراف: ٥٥]، واتە: هانا و هاوار بکەن لە پەروەردگارتان بە پاڕانەوەی بەکوڵ.

**بەردەوامیدان بە کۆشش بۆ ڕزگارکردنی دەق و چەمك و ڕاڤەکان و پاڵفتەکردنیان:**

ئەو مەنهەجە فکرییەی کەزیاتر لەئوممەتـدا بـاوە بەدەسـت ئـەوەوە دەناڵێـت کـە هەنـدەکی زمانـەوانی (الجزئیـة اللغویـة) و دەقـی پـەتی تەقلیـدی (النصـیة الحرفیـة التقلیدیة) پشتبەستوو بە ڕوانـین و دۆخگـەلێکی مێـژوویی، هـیچ پەیوەندییـەکیان بـە یاسـا گەردوونییـەکان و ئـەو واقیعـەوە نییـە کـە تیایـدا دەژیـن و بـەو پێشـهات و کێشەگەلەش کە لەمرۆدا تیایدا دەژین، ئەمەش وەهای کردووە فیکـری ئوممـەت وەك مەتـەڵ و چـیرۆکێك بێـت وێنەیـەکی ئـاڵۆزی بـۆ چـەند پارچـەیەکی یەکسـان پـەرت کردبێت، وەك کاغەزی لەتوپـەتکراوە، سـەختە بـۆ کەسـێك کـە شـارەزایی لـەبارەوە نەبێت وێنەی دروستی خۆی لێ دروست بکاتەوە، بۆیە نەزانی خەڵك بۆ چـارەکردن و دۆزینەوەی مەتەڵ و یارییەکە، وێنەکە بۆ چەند وێنەیـەکی شـێواو و جیـاوازتر لەیـەك دەگۆڕن، کە هیچ پارچەیەك بەوی تر گونجاو نەبێت و سەختە یەکێکیان بتوانێت وێنە ڕاستەقینەکە بدۆزێتەوە، بێگومان ئەوەی ئەمرۆ ڕوودەدات تەواو هەر ئەو شێوەیەیە.

لە هەموو بڕیار و کارێکدا دەنگگەلێکی بێ ئەژمار بەڕوانین و ڕشـتەی جیـاواز و دژ بەیـەك بەرزدەبێتـەوە، خـەڵکی نـازانن ڕاسـت و دروسـت کامەیـە؟ هـەر لایـەك پشـت بـەدەقێك دەبەسـتێت و لایەکـەی تـریش بەڵگەیـەکی پێیـە بەڵگـەی ئـەوی تـر تێکبشکێنێت.

میتۆدی ساغ ڕێگە نادات ڕووداو و پیادەکردن و تێکەڵ وپێکەڵبوونی کات و شوێن بەسـەر مەبەسـت و نـەگۆڕ و کولییاتـدا زاڵبێت،هـەروەها ڕێگـا نـادات کۆششـەکانی ڕووبەڕووبوونەوەی پێشهات و کێشەکان سەری لێبشێوێت و ڕاڤەو تێگەیشتنی هەڵە و دەقی شێوێندراو و هەڵبەسـتراو و چـیرۆك و ئەفسـانە و ئیسـرائیلییات بگاتـە فیکـری ئوممەت و نەگۆڕ و بابەتی گشتی و ڕۆشنبیری و مومارەسەی جەماوەرەکەی.

**برەودان بەبیری پڕوپوچ و جادوو و نووسینەوەی، تاوانێکی ئایینییە:**

لــەڕووی ئــایینی و فیکــری‌و کۆمەڵایەتییــەوە تاوانــە بەرانبــەر ئوممــەتی قورئــان و مرۆڤــی جێنشــینیکراو کــە لــەم ســەردەمەدا – لەبــەردەم ئــەو پێشــهاتانەی ئوممــەت ڕووبەڕووی بووەتەوە– برەو بەهەر شتێك بدرێت کەببێتە بەربەست لەبەردەم گیانی زانســت و کــارکردن و هــەوڵ و تێکۆشــان و ئیجتیهــاد و کــارکردن بــە هۆکــار و بەرپرسیارێتی هەڵگرتن.

تاوانــە هەنــدێ کتــێبی ســەردەمانی کــۆن بڵاوبکرێتــەوە کــە تایبــەت بــە دۆخ و پێشــهاتێکی مەعریفەیــەکی ڕابــردووە، زۆربەشــیان لــە بەشــی ئــەدەبی ئەفســانە و دواکــەوتن و تێکشــکانەوەن و بــەدرۆوە دەخرێنــە پــاڵ ئــایین و کــەلتوور، بۆیــە بڵاوکردنــەوەی ئــەو کتێبانــە بــەبێ پشــکنین و وردبوونــەوە و بــرەودان پێــی بــەناوی ئایینــەوە لــەنێو خــەڵکی و تــازە پێگەیشــتوواندا، تاوانــە بەرانبــەر تێکــڕای ڕۆڵــەکانی ئوممەت.

ئەوپەڕی شتێك عەقڵی موسوڵمانێکی ساغ بەرانبەر ئەو کتێبانــە بیکـات، ئەوەیـە بخرێنە بەردەم کەسانی پسپۆڕ تا لێکۆڵینەوە و توێژینــەوە و ڕامـانی لەســەر بکـەن و بەتێگەیشتن لـەو ڕەوش و پاڵنەرانــەی ئــەو کتێبانــەی تێـدا نووسـراوە تێبگـەن، نـەك برەودان بەو کتێبانە لـەنێو تێکـڕای خەڵکیـدا، کەئـەوە فێـڵ و تەڵەکەبازییـە بـەناوی کەلتوورو ئایینەوە، تەنانەت گـەر هەندێکیشـیان درابێتـە پـاڵ کەسـانێکی زانسـتخواز کەلای ئێمە ڕێزدارن، ئەوانیش هەڵەیان کردووە لەتێگەیشـتنی هەنـدێك لـەو کێشـانە، گەر هەر بەڕاست ئەوانیش نووسیبێتیان[١].

---

[١] – دەزانین زۆربەی زانایانی پێشووتر سەدان لەو کتێبانەیان دەدرێتە پاڵ کە ئەستەمە یەك کەس لەژیانیـدا هەموو ئەوانەی نووسیبێتەوە، لێکدانەوە بۆ ئـەوەش، ئەوەیـە خـەڵکانێك ئـەو کتێبانـەیان نووسـیوەتەوە و داویانەتـە پـاڵ ئـەو زانـا گەورانـە تـاوەکو بـرەو بـە بـیری خۆیـان بـدەن، ئەوەیـە وەهامـان لـێ دەکـات ڕەتیبکەینـەوە ئـەو کتێبانـە بدرێنـەوە پـاڵ هەنـدێ زانـا، ئەگەرچـی لەسـەر بـیر و مەبەسـتی ئـەوانیش نەنووسراونەتەوە.

لەڕابردوودا چەندین دیاردە هەبووە کەڕوون نەبووە و مرۆڤ لێیان نەگەیشتووە، بەگەڕانی زانستی و لێکۆڵینەوە لەپاڵ ئەو پێشکەوتنەی زانست لەم سەردەمەدا بەدەستی هێناوە لە نهێنییەکانی گەیشتوون و مەتەڵەکەی دۆزیوەتەوە، هەروەك دەرکەوت زۆر لەو بانگەشانە درۆو هەڵبەستراو بوون.

پەیوەستبوون بە ئەفسانە و چیرۆکی خەیاڵی و مەتەڵ و نهێنی و بڵاوکردنەوەی موعجیزەی درۆینە و تێکەڵکردنی ڕابردووی مرۆڤایەتی و ڕۆڵی ئەفسانە تیایدا لەگەڵ ئێستای مرۆڤایەتی کە لەسەر هیدایەتی وەحی و میتۆدی زانست و عەقڵ وەستاوەتەوە، هەموو ئەوانە تەنها خزمەت بە دوژمنانی ئوممەت دەکەن، بەرهەمەکەشی تەنها وێرانکردنی گیانی زانست و توانایە و بەردەوامیدانە بە لاوازی و دەستەوەستانی ئوممەت.

پێویستە ئوممەت و تازە پێگەیشتووان بە بیروباوەڕی دروست و زانستی دروست گۆش بکرێنو بپارێزرێن، نموونەی ئەو بیر و باسە زیانبەخشانە و دانانی لەهەموو ئەوانەی پەیوەندییان بە پەروەردە و فێرکردن و ڕاگەیاندنەوە هەیە؛ دوور لەچاوی تازەپێگەیشتووان و خەڵکی گشتی و بیستن و ئەدەبیاتیان، ئەو ماددە ژەهراوی و زیانبەخشانە بخرێنە بەردەم پسپۆڕەکان و لەبەردەستی منداڵ و نەشارەزاکان دوور بخرێنەوە.

**ئوممەتان بە زانست و مەعریفە پێشدەکەون، نەك بە ئەفسانە و جادووبازی:**

ئوممەتان بە کاری ساحیر و هەوڵی جادووبازان و هاوکاری جنۆکە و شەیتانە بەهرەدارە یاریدەدەرەکانیان پێش نەکەوتن، بەڵکو بەو عەقڵ و مەعریفە و توانا و کۆششەی کە خوای گەورە بە مرۆڤ بەخشیووە بەگوێرەی ئەو سروشت و توانایەی لە بوونەوەراندا دایناوە و ئەندازەی کردووە پێشکەوتن.

پێویستە درك بە سروشتی ئەو باروودۆخ و سەردەم و قۆناغە باش و خراپانەی کە ئوممەتی ئیسلامیی پێیدا تێپەڕبووە، هەروەها سروشتی عەقڵییەت و توانای

گوتارەکـانی ڕابردوویشـی بکـەین، چـونکە زۆربـەی گوتارەکـانی، تەنانـەت گوتـارە ئەرێنییەکانیشی بۆ کات و شوێن و ڕۆشنبیری و توانای سەردەمی خۆی گونجاو بووە، بۆیە دووبارەکردنەوەی ئەو دۆخە بۆ ئێستا و ئـەمڕۆ کـۆڵی قوورسـتر دەکـات. ئەگـەر زوك خـۆی بمانـەوێت بـەبێ تێگەیشـتنی تایبەتمەندییـەکانی ڕۆژگـاری خـۆی وەك گەنجینەیەکی کەلـەپووری وەربیگـرینو وەك خـۆی پیـادەی بکـەین، ئـەوە ئەوپـەڕی نەزانی و بێئاگاییە و گەورەترین زیانی لێدەکەوێتەوە، لەخۆڕا نییە گـوتراوە: هەڵەیـە هەر شتێ وترابێت بیگێڕیتەوە. چونکە هەموو شوێنێك قسەی تایبەت بـەخۆی هەیـە، هەندێ لەوانەی گـوتراوەو پێشـینەکان قبوڵیـان کـردووە هەڵەیـە بگێڕدرێتـەوەو بـڵاو بکرێنەوەو پیرۆزییان کەلتووریان پێ بدرێت.

پێویستە بیریار و زانایانی ئوممەت نەکەونە داوی میتۆدی هەندەکی و حەرفییەوە، تاوەکو بتوانن لە ڕزگارکردنی ئوممەتدا کاری خۆیـان ئـەنجام بـدەن و لـە چـاککردنی بابەتە هەمەکیەکانی شەریعەت مەبەستەکانی کە شێوێندراون دەسـتپێبکەن، پڕچـەك بـن بـە زانیـاری و توێژینـەوەی زانسـتی و مێـژوویی و کۆمەڵایـەتی و دەروونـی و پـەروەردەیی، بـە شـێوازی میتـۆدێکی گشـتیی شـیکاریی ڕێـك (systematic) سروشتی ڕوانینی ئیسـلامیی دروسـت و شـێوازی هێنانـەدیی لـە جیهـانی هاوچـەرخدا بۆیـان دەردەکـەوێت، هـەروەها بـەو جـۆرە دەتـوانن دەرکـی ڕووداو و دەقـەکانی سـەردەمی پەیامـداری و سـەردەمانی دواتـری بکـەن و ڕەهەنـدە کـاتی و شـوێنەکەی دەرك بکـەن و شـوێنەوار و کاریگەرییەکەشـی لـە تێگەیشـتنی واتـای ڕووداو و دەقـە ڕاسـتەکان دەرك پـێ بکـەن، بـەجۆرێك کـە وردبینیکـراو و جیـاواز بێـت بـەوردترینو دروستترین پێوەری میتۆدی، ئەمەش بۆ زانینی ئەوەی تێکەڵی وردەکارییەکانی بووە لە تایبەتمەندییەکانی ئەوانەی گوتارەکەیان ئاراستە کراوە لەڕووی کات و شوێنەوە لە ڕۆشنبیری و دەرك و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و نەریتە کۆمەڵایەتییەکانیانیان.

زۆرجـار هەڵـە تێگەیشـتن لـەوەدا دروسـت دەبێـت، بـەجۆرێ تەماشـای دەق و ڕووداوەکان دەکرێت وەك ئەوەی لە بۆشـاییەوە سەرچـاوەیان گرتبێـت، وەك ئـەوەی

سەرپەرشتیار و سەرکردە و مامۆستایەك کاتێ بۆ قەومەکەی قسە دەکات و لەگەڵ واقیعیاندا مامەڵە دەکات، لەگەڵ تەواوی مرۆڤایەتی هەموو کات و شوێنەکان قسە بکات، نەك وەك قسەکردن لەگەڵ قەوم و توێژ و کۆمەڵێکی دیاریکراو کە لەڕووی توانا و پەیبردن و ڕۆشنبیری و نەریت و ئاوەز و دەروونەوە جیاوازن، بۆیە شێوەی گوتار و دوواندن تەنانەت لەیەك کات و شوێنیشدا جیاوازە، با ئامانجیش یەك شت بێت، دوواندنی توێژێ بۆ توێژێکی تر جیاوازە، بەپێی دۆخی دوێندراو و ئەولەوییات و بەرژەوەندی و پێویستی و توانای کەسێك بۆ کەسێکی تر جیاواز دەبێت، ئەمە بۆ یەك کات و شوێن، ئەی بۆ ئەو کات و شوێنە چی بڵێین کە چەندان سەدە لەیەکتر دوورن؟

**وشیاریی دایك و باوك بناغەی بونیادنانە:**

لەوانەیە شتێکی بەسوود بێت گەر لێرەدا نموونەیەك لەسەر جیاوازی دوواندن بەگوێرەی سروشتی ڕۆشنبیری و تواناکان و سروشتی دوێندراو بهێنینەوە، بەوەش گرنگی شێوازی تێگەیشتنی زۆربەی تایبەتمەندی ئەو دەقانە تێدەگەین کە کەسانی شوێنکەوتەی میتۆدی هەندەکییانە و تەقلید تێناگەن کە بۆچی خەڵك بەدەم گوتارەکانیانەوە نایەن و بەدوای دەرچەیەکەوەن گونجانیان بۆ دروست بکات لەنێوان مەیلی دەروونی و ئەو قسە و ئاڕاستانەی رووبە{وویان دەکرێتەوە.

دایکان لەمەککە—بەبڕوای من لەزۆر شوێنی دیکەش لەسەردەمی منداڵیی ئێمە و پێش ئێمەش— زۆرێك چەمك و شێوازی کەلتوورییان دەگۆڕییەوە کەزۆریان بەهۆی گۆڕانکاری دۆخ و توانا و ڕۆشنبیریی تیاچوون، لەوانە پێداگربوونیان لەسەر ئەوەی منداڵەکانیان فێر بکەن کەلەهەموو هەنارێکدا دەنکێکی لەبەهەشتەوە هاتووە، خوێنەریش دەزانێت کە جۆری هەناری تائیف لەچیاکانی حیجاز زۆر چاکە، یەك دەنکی بکەوتایە سەر پۆشاك پەڵەی سووری لەسەر بەجێ دەهێشت و پاککردنەوەی گران بوو، چونکە ئەستەم بوو دەنکەکانی بپارێزیو بەر نەبنەوە، ئەوەی کەلەهەر هەنارێك دەنکێکی لەهەناری بەهەشتە بیرۆکەیەکی ئەفسانەی ژیرانە بوو، وەهای لە

منداڵ دەكرد نەهێڵێت هیچ دەنكە هەنارێكی لێ ونبێت، ئەمە كارئاسانییەك بوو بۆ دایكان تاوەكو پۆشاكو شتومەكی ماڵەكانیان پاك و خاوێن بمێنێتەوە، بەڵام كە گەورەبووین تێگەیشتین ئەوەی دەنكێكی هەنارەكە لەبەهەشتەوەیە تەنیا ئەفسانەیەكە و هیچی تر.

بەڵام پێداگریی دایك بۆ پارێزگاریكردنی منداڵەكەی و بە نەزانین پەنابردنەبەر ئەفسانە، تاوەكو مەبەستەكەی بێتەدی، هەندێكجار خراپترین شوێنەواری دەبوو.

یەكێكی تر لەوانەی زۆر لەدایكان كەشارەزای دەروونی منداڵ نەبوون پەنایان بۆ دەبرد، بە ناوی جۆراوجۆر لە وڵاتێك بۆ وڵاتێكی تر دەگۆڕێت، منداڵەكانیان دەترساند، تاوەكو تووشی گرفت نەبن و لە خۆیان دوورنەكەونەوە، بەتایبەت لەتاریكی شەواندا. لەو ژینگانەی كە رووناكیو جوڵە وەك نەبوو وابوو، دیارە لەتاریكییدا دز و پیاو خراپ و رێگر كاری خۆیان ئەنجام دەدەن، دەیكان دەهاتن مناڵە بچووكەكانییان بەوە دەترساند كەجنۆكەیەك هەیە ناوی دوجەیرەیە شەوان لە بەرگی ژندا خۆی پیشان دەدات و مرۆڤ ناتوانێت لە ژنی ڕاستەقینەی جیا بكاتەوە تەنها پێی لەسەر شێوەی سمی گوێدرێژە، بەمە دەتوانین وێنەی حاڵی منداڵێك بكەین كە لەشەودا ناچار دەبێت لەماڵ دەربچێتو ئافرەتێك ببینێت كەلە تاریكی یەكێك لەكۆڵانەكانەوە بەروو ڕووی دێت؟

ئەم ئەفسانە تۆقێنەرە و ئەوەی لە خەیاڵی ئەو منداڵە بچووكەدا دەیڕەخسێنێ، بەسن بۆ ئەوەی رێگر بن لەوەی منداڵ لە تاریكایی شەودا بیر لە چوونە دەرەوە لەدەرگاش بكاتەوە.

خۆزگە حاڵەتەكە لەمەدا دەوەستایەوە، بەڵكو شوێنەواری زیانی دەروونییشی بۆ دروست دەبێت و ترسی تەنیایی و تاریكایی لە دڵی دەرناچێت، ئەمجۆرە پەروەردەیە هۆكارێكە بۆ ئەوەی سیفەتی ترس و ترسنۆكیی لە دەروونی ئەو منداڵەدا بچێنێت و تاوەكو گەورەبوونیش لەگەڵی بمێنێتەوە.

ئـەو کاتـە دەبێـت چـاوەڕوانی بێگانـە بکـەین تـا  لەدەشـت و چـیا و چـۆڵەوانی و ئەشکەوتەکانی ئێمەدا بگـەڕێن و نەخشـە و شـوێنی سـەروەتەکانی ئـەو شـوێنانەمان بکێشن و لە ئێمە شارەزا تربن بەو شوێنانە.

چەندە جێی داخە زۆربەی ئامۆژگاریکار و نووسـەران بەڕاسـتەوخۆ و ناڕاسـتەوخۆ دەقگەلێك بڵاودەکەنەوە کە شوێنەواری خراپی هەیە، بەتایبەت گەر دەقەکە دەقێکی ئـایینیی بێـت، کـە هەنـدێکجار دەقێکـی نادروسـت و شـێوێندراوە، یـان لـە دۆخ و مەبەستی تێنەگەیشتووین، یان خراپ لێکدانەوەو ڕاڤەی بۆکراوە.

**کۆششی زیاتر بۆ ڕزگارکردنی چەمکە بنەڕەتییەکان:**

پێشەوا موحەممەد عەبدە –پاش ئەوەی بەرەوڕووی زانسـتیی ئـەوروپا بوویـەوەو هەندێك لەزاناو بیرمەندان بەشوێن ئەو کەوتن– کاری بەرەنگاربوونەوەی لەسـەردەمی هاوچەرخدا بەمەبەستی پاککردنەوەی کەلەپووری لەئەستۆ گرت تا عەقڵی  موسوڵمان لەلێکەوتـەکانی خورافـەو جـادووو چاوبەسـت دەربـاز بکـات، ئەمـەش بـە دووبـارە پێداچوونەوەی تێگەیشتنی دەقەکان و ئەدەبیاتی کەلەپوور لەو بـوارەدا، سـەرلەنوێ ئەو کێشانەی لە گۆشەنیگای پێشهاتەکانی سەردەم و تێگەیشتن و مەعریفە و توانا و تەحـەددییاتی سـەردەمەوە خسـتەوە روو، ئەمـەش بـە بانگـەوازکردن بـۆ دووبـارە پێداچـوونەوەی دەقـەکانی کەلـەپوور و شـێوازەکانی تێگەیشـتن و ڕەخنـەگرتن و لێکدانـەوەیان و دووبـارە داڕێژانـەوەی گوتـاری ئیسـلامی بـەپێی گۆڕانکارییـەکان و پێویستی و تواناکان.

سـەرەڕای توانـای ئـەو پێشـەوایانەی کـە سـەرەتایەکی گرنگیـان پێکهێنـا، بـەلاَم تاوەکو ئێسـتاش پێویسـتییەکی زۆر هەیـە بـۆ هـەوڵی زیـاتر، هـەوڵی میتۆدییانـە بـۆ جێگرتنـی بناغـە و چـەمکە گشـتییە پێویسـتییە ویسـتراوەکانی ئـازادکردنی عـەقڵی موسـوڵمان لـە بـیری ئەفسـانە و چاوبەسـتکردن، دامەزراندنـەوەی لەسـەر بنـەمای ئوممـەتی"العلق" و "القلـم" و "الحدیـد"، لـە سـەردەمی دەرکـەوتنی توانـای ئـەو

یاسـایانەی سروشـت کـە گـۆڕین و گۆڕانکارییـان بەسـەردا نایـەت، بـە میتـۆدی زانستییانەی ساغ ڕوانین یەکدەخرێت و توانای هاوبەش فراوانتر دەبێـت، بۆیـە بـەبێ میتۆدی زانستیی سـاغ ئوممـەت نابێتـە خـاوەن ڕوانینـی دروسـتی هاوبـەش و توانـای دەربـازکردنی بیرۆکـەو ڕۆشـنبیریو هەڵوێسـتەکانی بەشـێوەیەکی بابەتیانـەی متمانەداری کارا نامێنێت.

بۆیـە بـەڕێوەبردنی گفتوگـۆ سـەبارەت بەبابـەتێکی بنـەڕەتی گرنگـی وەك بەرەنگاربوونـەوەی بـیری ئەفسـانە و جـادوویی و چاوبەسـتکردن، لەسـەر بنـەمای میتـۆدی هەنـدەکی و تـەنها زمانـەوانی بێکـەڵك دەبێـت، چـونکە هـیچ پێـوەندیەکی میتۆدییانە بۆ بیرورا گۆڕینەوە فیکرییەکان و بیرورا ناکۆکەکان لـەئارادا نییـە، بـیرورا گۆڕینـەوەکانیش باسـە هەندەکییـە بێکۆتاکـان دەگـات کەسـنووریان نییـە، سەرەنجامیش تەنیا بە پەشێویی فیکریی و ناکۆکیی سەختی بێبنـەما و تووندڕەویی هەڵوێستە بێهوددەکـانو هـەڵهاتن لـە ڕوانینـی زانسـتی بـەرەو بـەر بڕیـاردان لەسـەر نیەتـەکانو تۆمـەت بەخشـینەوە و دوژمنایـەتی دروسـتکردن دەڕوات، کـە ڕیزەکـان پەرتەوازە دەکات و چوست و چالاکیی لاواز دەکات و هەستی بەکۆمەڵ وێران دەکـات و بەربەسـتی گۆشـەگیری و پەرتـەوازەیی لـەنێوان کـۆی ئوممـەت و نوخبـە ڕۆشنبیرەکانیدا دروست دەکات.

داواکارم لە زانا و بیریارەکانمان گرنگی بە بابەتی مەنهەجی بوون بدەن و کاربکەن بۆ پاککردنەوەی ڕۆشنبیری لەو شێواندن و پیسبوونەی تووشـی هـاتووە، بەتایبـەت بیری ئەفسانە و چاوبەستکردن و فێڵبازی، بەشـێوەیەکی میتۆدییانـەش لێکۆڵینـەوە لەدەقـەکان و کـەلتوور بکـەن، تـاوەکو لـەڕووی دەق و ڕشـتەی گێڕانـەوە و شـێوە و بابەتەوە بەدواداچونی تیا بکرێت، لەمەشدا پشـت بـە بنـەما بەتینـەکانی مەبەسـت و روانگە و بەرەنگاربوونەوەکان(المقاصد والمنطلقات والتحديات) ببەسترێت، بـەجۆرێك کـەهیچ بوارێـك بـۆ ئـەوە نەهێڵرێتـەوە کـە وشـە و ئاماژەکـانی دەق ببنـە گەنجینـەو دەروازە بۆ نەرێنی و پشتلێکردنەوە و ئەفسانە.

لەکۆتایی ئەم باسە خێرا و سەرپێییەدا گرنگە چوارچێوەی چارەسەری پێویست بخەمە بەردەم خوێنەری بەڕێزو، هێڵە بچینەکان و سەرچاوەکانی ئەو چارەسەرییە و پێوەرەکانی پێوانەی ئەنجامەکانی بهێنمەوە یادیان.

لەو بنچینە گشتیانەش پێویستە لە هەموو بوارێکدا شتە هەمەکییەکانی هەر لێکۆڵینەوەیەك لەم بوارەدا بڕیاردەر بن و ئەنجامەکان ڕێکبکەن، ئەو هێڵە گشتیانەش کرۆکی پەیامی ئیسلام و بنەما بنەڕەتییەکانی بەڕێوەی دەبەن: بنەماکانی یەکتاپەرستی و جێنشینایەتی و ئامانجی چاکە بۆ ژیانی مرۆڤایەتی و بنەمای بەرپرسیارێتی مرۆیی لەسەر بناغەی کارکردن و هەوڵدان لەسەر زەویدا بەپێی یاسا گەردوونییەکان.

گرنگترین ئەو بنچینانەی کە ئیسلام و گشتێتی دەقەکانی قورئان هێناویێتی، بریتییە لە:

– بابەتەکە لەبنەڕەتدا بابەتی بوون و نەبوونی جیهانگەلێکی تر لەم گەردوونەدا نییە، بەڵکو ئەوەی بەلامانەوە گرنگە لێرەدا پەیوەندیی ئەو جیهان و بوونەوەرانەیە– ئیدی سروشتیان هەرچۆن بێت– لەگەڵ مرۆڤ و کاریگەرییان لەسەری. ئاشکرایە کە بنەمای بەرپرسیارێتی و بنەمای دەستگرتن بەهۆکارەکانەوە، هیچ بوارێك بۆ ئەو جیهانانەی تر ناهێڵنەوە، تاوەکو کۆنترۆڵی مرۆڤ یان جیهانەکەی بکەن. هەروەها پێویستە لەنێوان جیهانە جیاوازەکانی غەیب و شاراوەکاندا جیاوازی بکەین، هەیانە هیچ شتێکیان لەبارەوە نازانین، لەوانەش ئەو زیندەوەرە وردانە کە مرۆڤ بەچاو نایانبینێت، پێشتر –تاوەکو ئێستاش– زۆر نەخۆشی و کارەسات تووشی مرۆڤ دەکەن، هەندێکیشیان بۆ مرۆڤ بەسوودن، لەئێستادا زانست نهێنیو شوێنەوارەکانیانی دۆزیوەتەوە.

– شەیتان لەجیهانی غەیبە، نەوەو وەچەکانیشی –کە لە نەژادی ئەون لە جنۆکەکان– هیچ دەسەلآتێکیان بەسەر مرۆڤدا نییە.

– کاری جاودوگەر و فاڵچییەکان، فێڵ و گومان دروستکردنە.

– مرۆڤایەتی لەگەڵ دەستپێکی پەیامی جیهانیی ئیسلامدا چووە ڕۆڵێکی نوێی پێگەیشتن و کارەوە، مرۆڤ تیایدا بووە خاوەن ڕوانینی کامڵ و هەڵگری بەرپرسیارێتی، لە قۆناغی منداڵێتی مرۆڤایەتی و جیهانی نەفامی و ئەفسانەوە چووە جیهانی کتێب و عەقڵ و مەعریفەو زانستو کارو داواکردنی هۆکارەکانەوە.کارتی عەقڵو زانینی دۆزییەوە –تاوەکو ئێستاش لەدۆزینەوە بەردەوامە– جیهانە شاراوەکانی زیندەوەرە وردەکان دەدۆزێتەوە، بەمەش زۆرێك لە هۆکارەکانی دەستەوەستانی و ترس و تۆقینی خۆی رەواندووەتەوە، هەروەها زانست لەڕێی دۆزینەوە زانستیەکانەوە زۆرێك ئامرازی فێڵبازو جادووبازانی ئاشکرا کرد، ئەوەش بەدەرخستنی زۆرێك لە یاسا فیزیکییەکان و تایبەتمەندییەکانی ماددەکان و زۆر نهێنی دەروونی مرۆیی و دەرد و ئەو شتانە کاریگەریی تێدەکەن.

– گەر جادووباز و فێڵباز و بەناو ساحیران حەقیقەتێکیان پێ بووایە، ئەوە سوودیان بەخۆیان دەگەیاندو خۆیان دەوڵەمەند دەکرد، بەلام فێڵیان بەکاردەهێنا بۆ دەستگرتنەسەر سەروەتی خەڵکانی بێئاگا و زاڵبوونەسەریان و زیانپێگەیاندنیان لەڕووی ماددی و مەعنەوییەوە.

– بنەمای ڕێزلێگیران و جێنشینیکردن و فەراهەمکردن و بەرپرسیارێتی، واتا پێویستە مرۆڤ جیهانەکەی خۆی بەڕێوە ببات و لەو بەڕێوەبردنی جیهانەکەیدا بەرپرسیارێتی کارەکانی هەڵبگرێت، نەوەك جیهانی نادیار و شاراوە ئەم بەڕێوە ببەن.

– هەموو ئەو دەستهاتە کۆتاییانەی کە هەموو لێکۆڵینەوە و تێگەیشتن و لێکدانەوەیەك پێی دەگات، پێویستە بگاتە ئەو حەقیقەتە یەکلاکەرەوەی کە ئەو کارانەی جادووباز و فاڵچی و فێڵباز و ساحیرەکان دەیکەن، مایەی زیانگەیاندنە بە مرۆڤ، نەك سوود پێگەیاندن، شوێنکەوتنیان و کەوتنە تەڵەی ئەوانەوە بێئاگایی و مایە پووچییە و کارکردنیش بەجادوو فێڵەکانیان خراپە و بێباوەڕییە.

## شێواندنی شەشەم: نەژادپەرستی "وازی لێ بهێنە چونکە بۆگەنە"

من لە مەککەی پیرۆز و ژینگەی دەورووبەریدا پێگەیشتم، لەوێدا چاوم بەڕووی هەموو جۆرە خەڵك و ڕەگەز و نەتەوەیەکدا کردەوە، لە ماڵ و دەورووبەر و گۆڕەپانەکانی حەرەم و حەوشە و ئەڵقە زانستییەکانی ماڵی خوا، ئەوان بەشێکن لە من و منیش بەشێکم لەوان: لەڕووی مرۆیی و نیشتمان و ئایینەوە، جیاوازی لەنێوان کەسیاندا نەبوو، تەنها بەو خەسڵەتو ئاکارانە نەبێت کەهەیانبوو.

ئەم منداڵە لە ماڵ و لە قوتابخانە و لە ماڵی پیرۆزی خوای گەورە، قورئانی پیرۆز و کۆمەڵێ دەقی فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت)ی خوێند، دڵە بەجۆش و عەقڵی کراوەکەی لە ئایەتەکانی خوا و واتاکانی یەکبوونی مرۆڤ و برایەتی موسوڵمانان و چاکەی پەیوەندیی خزمایەتی و برایەتی خۆی پڕ بوو: ﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ [النساء: ١]، واتە: ئەی خەڵکینە لە خەشم و ناڕەزایی ئەو پەروەردگارەتان خۆ بپارێزن کە ئێوەی لە تاکە نەفسێك دروستکردووە، هەر لەو نەفسەش هاوسەرەکەی بەدییهێناوە لەو دوانە پیاوان و ژنانی زۆری خستۆتەوە و بلاْوکردەوە، هەروەها لەو خوایە بترسن کە لە یەکتر داوا دەکەن بەناوهێنانی ئەوەوە، هەوڵ بدەن پەیوەندی خزمایەتیش بپارێزن و (پتەوی بکەن) چونکە بەڕاستی خوا (هەمیشە و بەردەوام) چاودێرە بەسەرتانەوە.

﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ [الحجرات: ١٣]، واتە: ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە هەمووتانمان لە نێر و مێیەك دروستکردووە (کە باوکە ئادەم و دایکە حەوایە) و کردوومانن بە چەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆربەجۆر، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بەیەکەوە...بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا ئەو کەسانەتان کە زۆر لەخواترسە و فەرمانبەرداری خوایە، بێگومان خوا زانا و ئاگایە بە هەمووان.

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِلْعَالِمِينَ﴾ [الروم: ٢٢]، واتە: (یەكێكی تر) لە نیشانە و بەڵگەكانی، دروستكردنی ئاسمانەكان و زەویە (كە زاناكانی ئەستێرەناسی لەئاستیدا سەرسام و سەرگەردانن) و جیاوازی زمان و ڕەنگتانە (دەنگی هیچ كەس لە كەسی تر ناكات، سەرەڕای سەدەها جۆر زمان، كە جۆری قسەكردن و داڕشتنی هەر گەلێك تایبەتمەندی خۆی هەیە، جگە لە هەزاران شێواز كە لەو زمانە سەرەكییانە دەبێتەوە)، بەڕاستی ئا لەو دیاردەیەشدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەیە بۆ زانایان و شارەزایان.

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَى أَنْفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ﴾ [النساء: ١٣٥]، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە هەمیشە ڕاگری دادوەری بن و شایەتیی بۆ خوا بدەن، با شایەتییەكەشتان زیانی بۆ خۆتان و دایك و باوكتان یان خزمانیش هەبێت.

﴿وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلَّا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ [المائدة: ٨]، واتە: ڕق و دوژمنایەتی هیچ كەس و هیچ لایەك هەڵتان نەنێت كە لە دادپەروەریی لابدەن، ئەوە نزیكترە لە تەقوا و خواناسییەوە، دەی كەواتە لەخواترس و پارێزكاربن.

یان لەفەرموودەدا هاتووە: ((هەمووتان لە ئادەمن، ئادەمیش لە خۆڵ دروست بووە، هیچ عەرەبێك فەزڵی بەسەر غەیرە عەرەبدا نییە و هیچ غەیرە عەرەبێكیش فەزڵی بەسەر عەرەبدا نییە ئیللا بەتەقوا و لەخواترسان نەبێت))، ((وەها مەكەن خەڵكیی بەكاروكردەوەیان بێنەلام و ئێوەش بەڕەچەڵەكتان))، ((ئەی فاتیمەی كچی موحەممەد، من لای خوای گەورە هیچ شتێكم بۆ تۆ پێ ناكرێت))، ((گەر فاتیمەی كچی موحەممەدیش دزیی بكردبایە دەستم دەبڕییەوە))، (( موسوڵمان برای موسوڵمانە، ستەمی لێ ناكات و ڕادەستی دوژمنی ناكات، خوای گەورە لە هاوكاریی بەندەدایە تاوەكو بەندەكە لە هاوكایی براكەیدابێت))، (( موسوڵمان بۆ موسوڵمانی تر نموونەی دیوارێكن و یەكتر قایم و تۆكمە دەكەن"، "نموونەی باوەڕداران لە سۆز و

بەزەییان بەرانبەر یەکتر، نموونەی یەك جەستەیە، گەر ئەندامێکی جەستە تووشی ئازار و ناڕەحەتییەك بێت، ئەوە هەموو جەستە شەونخونیی و ئازار دەچێژێت)).

منداڵەکە ئەمانەی دەخوێندەوە و بە سەرسامیو ئالۆزی بیری دەهێناو دەبرد: سەبارەت بەمێژووی ئوممەتو ململانێکانی و، ململانێی هۆز و گەل و نەژادو ڕەنگەکانی، هاوشێوەی ئەوەی لە ئەندەلوس ڕوویدا، بیرکردنەوەکەی درکی بە واتای ئەو هۆزگەری و دەمارگیریی و نەتەوەپەرستی و نەژادپەرستییەی نەدەبرد. تاوەکو پێگەیشتو خۆری منداڵی و بەڕائەتەکەی ئاوا بوو، منداڵەکەش سپیاتی خاکی حەرەمی بەجێهێشت، بەرەو دنیای دوورگەو وڵاتی عەرەب، پاشان بە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای زەویدا گەڕا، بینیی خەڵك بریتین لە جۆرەها توخم و ڕەگەز و هۆز و نەژادو گەل و نەتەوە و سنوور و زمان و کۆت و نامۆیی و لێکدی خوێندن و ڕقلێبوونەوە، ئەوکات ئەو منداڵە دەرکی بەقووڵی ئازار و مەینەتی ئوممەتی ئیسلامی دەکات.

ئیسلام پەیامی یەکبوون و جیهانیبوونی مرۆڤی هێنا، ئەمەش هەمووی کردنە یەکەیەکی تەواو, کە لە ئیجابییەتی جەوهەرەکەیەوە دەردەچن: لە ڕووی ڕۆح و بەها و دادگەری و دەستبازبۆیەکگرتن و سۆز و بەزەییەك کە لەشەریعەتی پەیامەکەو کۆمەڵگای پەیامەکە بەرجەستە بووبوو، بووە کۆمەڵگای یەکتاپەرستی و برایەتی و داد و بەزەیی، کۆمەڵگایەکی دوور لە بۆگەنایەتی نەفامییەتی ڕەگەزپەرستی و هۆزگەری و نەژادپەرستی بوو، برایەتیی مرۆڤ و هاونیشتمانیبوون و جەوهەری مرۆڤی تێدابوو، ئەمەیە ئەو بنکەیەی کە مرۆڤ بە ڕۆح و جەوهەرەوە لە سەری جێگیر دەبێت، هیچ جیاوازییەك لەنێوان مرۆڤەکاندا بوونی نابێت، جگە لەڕووی خۆپارێزی و هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی و گەیاندنی سپاردە.

بازنەکانی ئینتیمای مرۆیی لە پەیامی ئیسلام و بەها و ڕۆشنبیرێتییەکەیدا یەکدەگرن و دەچنە ناویەکەوە، لەیەك نەفسەوە، بەرەو منداڵدان و کەسوکار و ئایین و مرۆڤایەتی، بەگیانی دادگەری و چاکەکارییەوەو، ئادەمیزاد هەموو ئادەمیزادەکان دەگرێتەوە، بۆیە سەیر نییە کە ڕۆڵەکانی پەیامی ئیسلام و نەوەکانی سەردەمی وەحی خاوەن بەرزترین

سیفەتی خۆشەویستی و لەخۆبووردن بۆ یەکتر بوون: ﴿وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِنْ قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾ [الحشر: ٩]، واتە: ئەوان (یاریدەدەرەکان) کەلەماڵو شوێنی خۆیان بوون (لەشاری مەدینە)و پێش (کۆچکردنی برا موهاجیرەکانیان) باوەڕیان هێنا ئەوەی کۆچ بکات بۆلایان خۆشیان دەوێ‌و لەدڵو دەروونی خۆیاندا هیچ جۆرە حەسوودی‌و بەخیلییەك شك نابەن لەبەر ئەوەی کۆچکەران بەشیان دراو (بەشی ئەوان نەدرا لەو ماڵو سامانەی کەلەجولەکەکان گیرا) فەزڵی ئەوان دەدەن بەسەر خۆیاندا، هەرچەندە هەژار و نەداریشن.

## دەمارگیری نەژادی، پیسبوونێکی بیروباوەڕیی ڕۆشنبیریی کۆمەڵایەتیی مەترسیدارە:

گرنگە لێرەدا جیاوازیی بکەین لەنێوان دەمارگیری و ڕەگەزپەرستییەتی سەردەمی نەفامی لەلایەك و سۆز و بەزەیی خزمایەتیی ئیسلامیی لەلایەکی تر، چونکە ڕەگەزپەرستی و دەمارگیری سیفەتگەلێکی ئاژەڵییانە و پەرتەوازەیی و ستەمکارییە، بەڵام گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی ئیسلامی، سۆز و پەیوەندی و بەخشینە، بەهێز تێیدا دەستی لاواز وگەورەش دەستی بچووك دەگرێت.

بۆیە ئیسلام بەئەندازەی ئەوەی ڕێگریی لە دەمارگیری و ڕەگەزپەرستێتی دەکات، جەخت لەواتاکانی داد و برایەتی مرۆڤایەتی دەکاتەوە: ﴿وَلَوْ عَلَى أَنْفُسِكُمْ﴾ النساء: [ ١٣٥]، ﴿وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى﴾ [المائدة: ١٠٦]، ئامۆژگاریی دەکات بۆ بەجێهێنانی پەیوەندیی خزمایەتی و بانگەواز دەکات بۆ چاکەکردن لەگەڵ خزم و نزیکان، تاوەکو پەیوەندییە مرۆییەکان بەتین بن و گیانی خۆشەویستی و دەستبار بۆیەکگرتن و پەیوەندییەکان لەنێو کۆمەڵگادا پەرە بسەنێت، بەڵکو ئیسلام ئەمجۆرە پەیوەندییانە فراوانتریش دەکات، هەتا برایەتی شیرییش دروست دەکات، هەروەها مافی دراوسێی نزیکیش فراوان دەکات، هەموو ئەو پەیوەندییانەش پەیوەندیگەلێکی برایانە و هاوسۆزین، کە هیچ ستەم و نادادی و دەستدرێژیکردنەسەر مافێك و نکوڵی کردن لە

لێهاتووییەك نایانشێوێنێت. شتێکی لەخۆڕا نییە، یەکێکە لە پایەکانی ئیسلام —کە حەجە— لە ناوەڕۆکیدا هێمای یەکبوون و برایەتی مرۆڤە، ئەوەش ئەو کاتە زۆر بەجوانی دەردەکەوێت کەموسوڵمانان خۆیان لە هەموو شتێك کەمایەی جیاوازییان بێت دادەماڵن، تا لە ڕۆژی عەرەفەدا هیچیان بەسەرەوە نییەو لەدوو پارچە قوماشی سپییدا ڕادەوەستن، جیاوازی نییە لەنێوان گەورە و بچووك و هەژار و دەوڵەمەندا، بەهەر زمانێ هاتۆتە گۆ و هەر ڕەنگێکی هەبووە کەلەدایکبووە، هەموویان بران، هەموویان وەچە و نەوەی ئادەمن، هەریەکەیان مرۆڤە هەر مۆڤو بەس.

ئەگەر بمانەوێت گیانی ئیسلام و یەکبوونی ئوممەت و مەزنیی پەیامەکە بهێنینەوە ژیان، دەبێت کاربکەین بۆ پوختە و پاڵفتەکردنی ڕۆشنبیری و بیروباوەڕ و بەهاکانیان "لەبۆگەنی" ڕەگەزپەرستی و ستەم و پیسبوون پاکبکەنەوە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِنْ قَوْمٍ عَسَى أَنْ يَكُونُوا خَيْرًا مِنْهُمْ وَلَا نِسَاءٌ مِنْ نِسَاءٍ عَسَى أَنْ يَكُنَّ خَيْرًا مِنْهُنَّ﴾ [الحجرات: ١١]، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! هیچ کەس و هیچ هۆزێك گاڵتە بەکەس و هۆزێکی تر نەکات و زەلیلی نەکات، چونکە لەوانەیە ئەوان چاکتر بن لەمان، ژنانیش با گاڵتە بەیەکتر نەکەن و یەکتر زەلیل نەکەن، چونکە لەوانەیە ئەمان لەوان چاکتر بن. پێویستە خوێندنەوە بۆ واقیعی ژیانمان —بەگوێرەی چەمکەکانی سەردەمی هاتنەخوارەوەی وەحی— بکەین‌و لە تێگەیشتن و لێکدانەوەی خراپ و نیازی خەڵکانی نیازخراپ و هەڵەی دروون نەخۆشەکان دەربازی بکەین.

نەژادپەرستی (العرقیة)، بەرجەستەکردنێکی ناشیرینە بۆ شێواندنی تێڕوانینی ئیسلامی وبەهاکانی لە شەریعەتی ڕۆشنایی ڕۆحانیدا، لەڕووی یەکبوون و برایەتی و هاوکاری و دەستباربۆیەکگرتن، لە"هێز بۆ حەقە" لەڕووبەڕووبوونەوەی یاسای ئاژەڵی ماددی دارستان کە "حەق بۆ هێزە" جیاکاری و دژیەکی و زۆرداری و ڕاوکردنی تێدایە کە پشت بە سیاسەتی هێزی کەڵبە و چڕنووك و بازوو (Power politics) و بەرژەوەندییە نەتەوەییەکان (National Interests) دەبەستێت.

**جیهانی حەق و ڕووناکی و جیهانی دارستان و تاریکی:**

هێز بوارێك نییە بۆ جیاکاری نێوان جیهانی حەق و ڕووناکی و جیهـانی دارسـتان و ستەمو تاریکی، بەڵکو جیاکاری نێوانیان لە چۆنیەتی بەکارهێنانی هێزدایە، ئاخۆ بـۆ حەق بەکاری دێنێت یان بۆ ناحەق؟ بۆ چاکە بەکاری دێنێت یان بۆ شەڕ و خراپە؟ بۆ دادپەروەری یان بۆ ستەمکاری؟ بۆ سۆز و بەزەیی یـان بـۆ سـتەمکاری؟ بـۆ برایـەتی یان بۆ جیاکاری؟ بۆ ئاشناکردنی خەڵك بە پەرستنی خوا، یان بۆ بەکۆیلەکردنی خەڵك بۆ مرۆڤەکانی تر و سەرشۆڕکردنیان؟

گـەر هـەر دارێـك بەرهـەمێکی هـەبێت، ئـەوا بەرهـەمی یەکتاپەرسـتی برایـەتی و دادپەروەری و دەستبارگرتنە، گەر هەر شتێك دژو پێچەوانەیەکی هـەبێت، ئـەوە ئـەو شــتەی دژ بــە یەکتاپەرســتیی بێــت، بریتییــە لــە جیاکــاریی رنــەژادی و زۆرداری ڕەگەزپەرستیانە و بەکارهێنانی کوێرانـەی هێـز. بـەبێ برایـەتی و هاوسـۆزی مرۆیـی، سـەر زەوی موسـوڵمانان بەتایبـەتو سـەرزەمینی مرۆڤایـەتی بەگشـتی هـیچ خێـر و خۆشی و ئاشتی تێدا نابێت، لەبـەر ئـەوە برایـەتی و هاوسـۆزی وا لاواز بـووە، ئەگـەر لـەوەدا نـەبێت تـەواو لـەنێو بچـێت، لەجیهانێکـدا کـە کۆمـەڵگا و شارسـتانییەت و پێگەیاندنی نەوەکانی لەسەر "بۆگەنی" جیاکـاری ڕەگەزپەرسـتیانەو نەژادپەرسـتیو دەمارگیری پیس بووبێت:﴿إِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاعْبُدُونِ﴾ [الانبیـاء: ٩٢]، واتە: خەڵکینە بەڕاستی ئەم ئایینەی کە ئەم پێغەمبەرانە هێناویانە ئایینەکـەی ئێوەیە، کە یەك ئایینە و منیش پەروەردگارتانم، تەنها من بپەرستن. ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ [الحجرات: ١٠]، واتە: لەڕاستیدا هەر ئیمانداران برای یەکن. ﴿وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا﴾ [آل عمران: ١٠٣]، واتە: هەر هەمووتان بەتوندی دەست بگرن بە ئایینی خواوە و پەرت و بڵاوەمەبن.

ڕاستی فەرمووە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) کـە فەرموویـەتی: ((لَـيْسَ مِنَّا مَنْ دَعَا إِلَى عَصَبِيَّةٍ، وَلَيْسَ مِنَّا مَنْ قَاتَلَ عَلَى عَصَـبِيَّةٍ، وَلَـيْسَ مِنَّـا مَـنْ مَـاتَ عَلَـى

عَصَبِيَّةٍ))[1]، واتە: لە ئێمە نییە هەرکەسێك بانگەواز بکات بۆ دەرمارگیری، لە ئێمە نییە هەرکەسێك شەڕ بکات بۆ دەمارگیری، لە ئێمە نییە هەرکەسێك بکوژرێت لەسەر دەمارگیری)).

ئەگەر بمانەوێت – بەڕاستی –هەست و تێگەیشتن و چەمکی ئوممەت بگێڕینەوە، ئەگەر بمانەوێت بەسەر هۆکارەکانی پەرتەوازەیی و ململانێ و دووبەرەکیدا زاڵ ببین، ئەگەر بمانەوێت ئیمان و یەکتاپەرستی و دادگەری و هاوکاری و یەکتر سەرخستن – بەڕاستی– ببێتە بناغەی بونیادنان و سەرچاوەی ویژدانمان، ئەوا لەسەرمان پێویستە دەست بەپاڵفتەکردنی پەروەردە و ڕۆشنبیرییمان لە ژەهری جیاکاریو ڕەگەزپەرستییەت و دەمارگیری و ستەمکارییەکانی و خۆبەگەورەگرتنەکانی بکەین، تاوەکو ئوممەت ببێتەوە بەبەیەکەیەکی بەیتینی یەکگرتوو لەچوارچێوەی بازنە بەیەکداچووەکاندا کە واتای پەیوەندیی باش و هاوسۆزی و بەزەیی و دەستبارگرتن و سەرخستنی یەکتر" ستەمکاربوو" یان "ستەملێکراو"[2]، لە تاك و خێزانەوە دەست پێبکرێت تا دەگاتە خزم و کەسوکار و نزیکان و گەلان و هۆزەکان، تا بەئوممەت و مرۆڤایەتی دەگات.

---

[1] - السجستاني، سليمان بن الأشعث، سنن أبي داود. تحقيق: محمد محيي الدين عبدالحميد، بيروت: دار الفكر، (د.ت)، ج٢، ص٧٥٣، حديث رقم: ٥١٢١.

[2] - بوخاریی گێڕاویەتییەوە کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ((براکەت سەربخە ستەمکار بوو یان ستەملێکراو. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە دەزانین کەسێك ستەملێکراو بوو سەریبخەین، ئەی ستەمکار بوو چۆن سەریبخەین؟ فەمووی: دەستی بگرن و لە ستەمکردن ڕایبگرن)). بڕوانە:

– البخاري، صحيح البخاري، مرجع سابق، ج٢، ص٨٦٣، حديث رقم: ٢٣١٢.

**دووەم: دەستهاتی تاڵ و شوێنەواری لادانە فیکرییەکان**

**لە بونیادی دەروونیی ئوممەتدا:**

شوێنەوارەکانی ململانێی نێوان دەستەبژێری فیکری و دەستەبژێری سیاسی و ئەو گۆشەگیرییەی دەستەبژێری فیکری کەلێی کەوتەوە، تەنیا بەوە نەوەستا کە ئەوانە لە کاری کرداریی‌و ڕۆچوون لەلایەنە رووکاری و تیۆرییەکانی کاروباری سیاسی کۆمەڵگا و ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی، یان تەنیا نەبووە هۆکاری کورتبوونەوەی گرنگیپێدانیان بەکاروبارە تاکییەکانی رۆڵەکانی ئوممەت، بەڵکو پەلیهاوێشت بۆ گۆڕانکاریگەلێکی جەوهەریی لە فیکری دەستەبژێری فیکری و سروشتی ڕوانینی بۆ کۆمەڵگا، پەلیهاوێشت بەرەو ڕەنگڕێژکردنی پەیوەندیی نێوان دەستەبژێری فیکری و دەستەبژێری سیاسی  بە ڕەنگی دوژمنایەتی و دژبەیەکیی ڕۆڵەکانیان و کێشە لەسەر دەسەڵاتیان لەناو تەواوی ئوممەتدا.

ئەو کارە ڕەهەندێکی سیاسی ململانێکاری بەردەوامی بەخشیە گوتاری فیکری و ئایینی، کە لایەنگری و ویژدانی ئوممەتی پەرت دەکات و متمانەی –لەبەر هۆکارگەلێکی جیاواز– بەرانبەر بەسەرکردە سیاسییەکانی و ئەو سیستمە کۆمەڵایەتییەکانی لەدەست بدات کە لەسەر بنەمای دەمارگیری و ستەم و سەرکوتکاریی بونیادنراوە.

کاریگەریی ئەو بەرهەمە تاڵە لەسەر فیکری ئیسلامی و گرنگیدانی زانایان، دوورخستنەوەی رەهەندی پەروەردەی دروست و کەرەستە ڕۆشنبیری و مەنهەجییە تیۆری‌و کردارییەکانی‌و دواکەوتنی دامەزراوە پەروەردەییە فێرکارییەکانی لێ کەوتەوە، ئەمەش بووە هۆی کاری مەعریفی و پەروەردەیی وەها کە پشکی زۆری هەبوو لە داڕماندنی ئەو بنەماو بناغە دەروونییەکان کە بونیادی کۆمەڵایەتی و ئاوەدانکاری و شارستانییەتی ئوممەتیان لەسەر دامەزرابوو.

لەراستیدا گوتاری تۆقاندن و سیاسەتی تۆقاندن، دوو بەرووبوومی نەفرەتلێکراوی ئەو دەستەوەستانییە بوو کە تووشی دەستەبژێری فیکری و سیاسیی ئوممەت بوو،

چونکه ئەو توندوتیژیەی -کەخۆی لەو جۆرە گوتارەدا دەبینێتەوە- بۆ خۆی هۆکاری کەسی دستەوسانن بۆ بەڕێوەبردنی ئەو هەلۆیستانەی کەئەو کەسەی تایبەتمەندە پێی لەیاساکانی جولانیو کلیلەکانی سوڕانی جولێنەرەکەی تێناگەن، بەمەش تێکڕای ڕۆڵەکانی ئوممەت دەبنە سووتەمەنی ململانێی سیاسی نێوان دەستەبژێری فیکری و دەستەبژێری سیاسی، کە خەمی پاراستنی پێگەکانی لا ناکۆکەکانو بەدەستهێنانی لایەندارییانو زاڵبوون بەسەر کۆمەڵبوونیاندا بوو.

لەراستیدا بناغەی ئەو کێشەیەی کە ڕێڕەوی کۆمەلگای پەیامداریی گۆڕی، بریتییە لە لاوازیی هۆکاری پەروەردەکاری ئیسلامیی بوو لە پێگەیاندنی ئەو عەرەبە دەشتەکی (ئەعراب)یانەی کە لە ریزی سوپای فەتحدا بە سەرباز قبولکران، لاوازیی ئامادەسازی و پەروەردەیی و ئاراستەکردن-لەکۆتایی کارەکەدا- ئەو هۆکارە خراپە بوو کە ئاژاوەیان دروستکرد و بووە هۆی ڕووخانی خیلافەتی ڕاشیدین، وایکرد فیکری دەمارگیری هۆزایەتی بتوانێت پادشایەتیەکی زۆردار کە هەموو ئەوەی فیکری هۆزایەتی -دواترش گەلی- لەکاریگەرییە بیروباوەڕی و گۆڕانکارییە سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابوورییەکان لە خۆیدا هەڵیگرتبوو دابمەزرێنێت.

بۆ نموونە؛ هەموو ئەو بەڵگەنامانەی بەخشینی زەوی لەسەردەمی دەوڵەتی سەردەمی پەیامدا، کە بەخشینو دابڕینەکانی تەنها بۆ بەکارهێنان بوو، نەك خاوەنداریێتی، بەلام لەدوای خیلافەی ڕاشید بووە خاوەنداریێتیی ڕەها بۆ تاك و سەرکردە و خێزانەکان[1]، ئەمەش بەلگەیە لەسەر قووڵی گۆڕانکاری و لادانەکان و، فراونی سنورەکەیان و دووریان لە سیاسەتەکانی سەردەمی پێغەمبەرێتی راشید.

قورئانی پیرۆز ڕوونیکردووەتەوە کە عەرەبە دەشتەکییەکان لە چ شارستانیەتێکی سەرەتایی و چ لاوازییەکی بیروباوەڕی و پەروەردەییدا بوون، ئەمەش وای پێویست

---

[1] - Habibul، Sayed."AL-Iqta: A Historical Survey of Land Tenure and Land Revenue Administration in Some Muslims Countries، with Special Reference to Persia"، in ythe Contemporary Aspects of Economic and Social Thinking in Islam، Plainfield،in: the Muslim Students Association of USA and Canada،1970.

کـرد کـار بـۆ پەروەردەکردنـەوە و پێکهێنانـەوەی لایـەنی دەروونـی و کۆمەڵایـەتی و ژیارییان بکرێت تا بێنە نێو کۆمەڵگای ئیسلامییەوە: ﴿قَالَتِ الْأَعْرَابُ آمَنَّا قُلْ لَمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِنْ قُولُوا أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ الْإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ﴾ [الحجرات: ١٤]، واتە: هەندێك لـە بیابان نشینە عەرەبەکان وتیان: باوەڕمان هێنا و موسوڵمانین، پێیـان بڵـێ: نـەخێر، باوەڕتان نەهێناوە، بەڵام بڵێن: بەناچاری موسوڵمان بووین، هێشتا باوەڕ نەچۆتە ناو دڵەکانتانەوە.

﴿الْأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا وَأَجْدَرُ أَلَّا يَعْلَمُوا حُدُودَ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ﴾ [التوبة: ٩٧]، واتـە: زۆربـەی عەرەبـە کۆچـەری و دێهـاتی و بیابـان نشـینەکان (لـە عەرەبە شارنشینەکان) دڵـڕەقترن لـەبارەی کـوفر و دووڕوویـیـەوە (چـونکە دوورن لـە سەرچاوەی زانست و مەدەنییەتـەوە)، شایسـتەترن ئـەو سـنوورانە نـەزانن کـە: خـوا ناردوویەتییە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکەی (دەربارەی حەڵاڵ و حەرام).

لەبەر ئەوە ئیسلام دەستیکرد بەڕاهێنان و پەروەردە و فێرکردنیان، کاری کرد بـۆ ناردنی شاندە فێرکارییـەکان بـۆ شـوێنی نیشـتەجێبوونو ماڵـەکانیان، بەڵامئـەو ئـەو هەوڵو سیاسەتانە سەختی هەڕەشە سەربازییەکانی فارس و ڕۆم بـووە ڕێگریـان، کـە لەڕۆژهـەلات و ڕۆژئـاوای دەوڵـەتی ئیسـلامیەوە دەکـرانو موسـوڵمانەکان دەچەوسێنرانەوە و ڕێگرییان لەخەڵك دەکـرد مـافی چـوونە نێـو ئیسـلامیان هـەبێت، لەلایەکانی دەوڵـەتی نزیـك دەبوونـەوەو چـاویان تێبڕیبـوو، ئامادەسـازییان دەکردبـۆ وێرانکردنی دەوڵـەت و کۆمـەڵگا و گەڕاندنـەوەی عـەرەب بـۆ سـەردەمی نـەفامییان و ملکەچبوون بۆ دەسەڵاتیان.

ئا بەوشێوەیە ململانێی سیاسی، دەرەکی و نێوخۆیی، بووە هۆی فەرامۆشـکردنی لایـەنی پـەروەردەیی لەدەوڵـەتانی ئیسـلامیداو فەرامۆشـکردنی ڕەهەنـدی مـەعریفیی مرۆیـی کۆمەڵایـەتی لـە لێکۆڵینـەوەی سروشـت و ڕووداو و گۆڕانکارییـەکانی کـات و شوێن، بەوەش درك بە گرنگـی منـداڵ و پـەروەردەکردنی وەك بناغـەی گۆڕانکـاری و ڕاستکردنەوەی ڕێگاکە نەکەن.

بەوشێوەیە دەرفەت نەڕەخسا لەبەردەم عەقڵی موسوڵماندا  کە بەدەست ستەم و تۆقاندن و ڕۆچوون لەلایەنە هەندەکی و تیۆرییەکاندا دەینالاَند، تا ڕووبەڕووی خراپ شێواندنی کەسێتی مرۆڤی  موسوڵمان و لادانی مومارەسە کۆمەلاَیەتییەکانی ببێتەوە و گرنگیدانی زانستی رووبکاتە گەشەپێدانی پێویستی زانستە گەردوونییە کۆمەلاَیەتییەکان و تێگەیشتن لە منداڵ و چاودێریکردنی منداڵو زانستەکانی پەروەردەکردنی و جۆری ڕۆشنبیرییەکەی و خوێندنەوەی دەروون و هۆکارەکانی گەشەپێدانی کەسێتی و عەقڵیەت و تواناکانی بدات و بیکاتە بابەتێکی بنەڕەتی زانستی، کەتێیدا هەوڵی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەو تێبینیی بدرێت، بەمەبەستی ئاشنابوونی سروشت و ئاکارەکانی و کلیلی نهێنییەکانی و وزە شاراوەکانی و شێواز و توانا و ئامانجە گونجاوە پێشکەوتووەکان بۆ هاوتابوون لەگەڵ پێویستی و ڕێگرییەکانی بەردەمی بدۆزرێتەوە.

ئەم کەمتەرخەمییە بە گرنگترین هۆکارە ڕاستەقینەکان دادەنرێت کە دواکەوتنی ئوممەتو نەبوونی توانای چاکسازیو هەستانەوە تا ئەمڕۆ راڤە دەکات، لەهەمان کاتدا سەرکەوتنی هەوڵەکانی ڕێنسانسی نوێی ئەورووپاش راڤە دەکات، کەوایکرد – لەژێر ڕۆشنایی تێڕوانینە گەردوونییە عەلمانییە لیبراڵییە نوێیەکەی و میتۆدی مەعریفە هەستی و عەقڵییەکەیدا– بابەتیی پەروەردە کەلەسەر بناغەیەکی زانستیی ئەزموونی دامەزرابوو بکاتە بنچینەی هەستانەوەیو بەردی بناغەی پەرەپێدانی وزەکانی.

لـەو بەدواداچـوونەی کردمـان بـۆ لایەنـەکانی ناتـەواوی و کـەموکورتی لـە ڕەوتـی ئوممەتی ئیسلامی و، ئەو لادان و شێواندنانەی تووشـی هـاتووە، دەبێـت ئـەوەشمان لەبیر نەچێت کە بەخششەکانی ئیسلام بۆ مرۆڤایەتی و کارلێکی لەگەڵیـدا، سـەرەڕای هەموو بارودۆخەکان و، بەدرێژایی تێکڕای سەردەمەکان، بەردەوام بـووە. بۆیـە بنکـە موسـوڵمانە مرۆییـە فراوانەکـە بـەردەوام لـە ناخیـدا –بـە ئەنـدازەی جیـاواز بـەپێی سەردەمێك بۆ سەردەمێکی تر، ولاّتێك بۆ ولاّتێکی تر – زۆرێك لە گیانی ئیسلامەتی و بیروباوەڕ و بەها و بنەما بنەڕەتییەکانی ڕێدەکات.

ئەمەی کەلە گیانی ئیسلام ماوە، هەر ئەوە مایەی مانەوەی ئەو هێز و وزە و بـەها و ئامانجە بالاّیانەی کە لە قەوارەی ئەم ئوممەتەو ناسنامەیدا ماوەتەوە. ئەگـەر –بـۆ چـەندین سـەدە– بـە نەتـەوە نـەفام و بتپەرسـتەکانی دەورووبـەری خـۆی بـەراوردی بکــەین، ســەرباری ئــەو شــێواندن و لادانانــەی تووشــی عەقڵییــەت و دەروون و سیسـتمەکەی بـووە، ئـەوا شارسـتانییەتی ئیسـلام بـۆ چـەندان سـەدە بـالاّترین شارستانییەتە، لەمیانەیدا زانا و بیریـار و فەیلەسـوف و دروسـتکار و پیشـەوەرەکانی ڕەنـگو ئاسـۆی نوێیـان بـە پێشـکەوتن و داهێنـانی زانسـتییان بەخشـی. بـەبێ ئـەو کەلتوورە زانستییە شارستانییە دێرینە، شارستانییەتی مرۆڤایـەتیی نەیـدەتوانی لـەو ڕێڕەوە بەردەوام بێت کە ئەمڕۆ بەدیهێناوە و پێیگەیشتووە.

بەلاّم سەرەڕای هـەموو ئەوانـە، نابێـت خۆمـان بـەدووربگرین لـە ڕەخنـەگرتن لـەو هۆکارانەی کە گیانی بەرەوپێشچوونی ئیسلامییان لاوازکرد و ڕێگەیانـدا بەدواکـەوتنی ئوممەتو تێکشکانی رۆڵـی، لەکاتێکدا کـە ئوممـەتانی تـر پێشـدەکەون و رکابـەری ئیسـلام دەکـەنو خێـرو بێرەکـانی بـەوجۆرە خراپـەی لەئێسـتادا دەیبیـنین بـەڕێوە دەبەن.

**یەکەم: بزووتنەوەکانی چاکسازیی ئیسلامی و پێویستی هەڵسەنگاندنیان:**

گەر لە مێژووی ئیسلامیی وردببینەوە، دەبینین چەندین هەوڵی چاکسازی هەبووە، زۆرێك لەزانا و بیرمەندان و سەرکردە و سوڵتانەکان لەسەر بنەماگەلێکی ئایینی و سیاسی و مەدەنیی پێی هەستاون. لە گرنگترین هەوڵەکانیش هەوڵی ئەبو حامیدی غەزالیی (ساڵی (٥٠٥ك/ ١١١١ز کۆچی دوایی کردووە) کە لەخەمی ڕاستکردنەوەی ڕەوتی فیکری ئیسلامی و دەربازکردنی لە وڕێنەکانی فەلسەفەی میتافیزیکی گریکی کە سەری لە فیکری ئیسلامیی تێکدا و وزەو تواناکانی لەشتانێکدا بەفیڕۆدا کە لە تێڕوانینی ئیسلامدا بێسوودە.

کاتێك کتێبی "تهافت الفلاسفة" ئەو ڕەهەندەی ئاشکرا کرد، "إحياء علوم الدين" هات بۆ ئەوەی ئوممەت بتوانێت وزە ڕۆحییەکانی خۆی بەدەست بهێنێتەوە، ئەوەش بە گێڕانەوەی پەیوەندیی ئەرێنی و ئاوێتەکردنی مەعریفەی شەرعی و ویژدانی ئیسلامی، دەربازکردنی عەقڵی مەعریفی شەرعی لە شێواویەکانی فەلسەفەی میتافیزیکیی گریکی و لادانەکانی و، پابەندبوونی شەرعی ئیسلامیی تێکەڵ –بەپێی تێڕوانینی خۆی– بە زوهدی ئیسلامیی، دوور لە لادانەکانی تەسەوفی فەلسەفی توانەوەیی(حلولی) کە موسوڵمانان لە فەلسەفەی میتافیزیکیی گریکەوە بەمیرات بۆیان مابوەوە.

بەداخەوە هەوڵەکانی غەزالیی سەرکەوتوو نەبوون، چونکە چاکسازییەکی میتۆدیی ڕیشەیی نەبوو لەخاڵەکانی چاوگەی مەعریفەی ئیسلامیدا، بەڵکو هەوڵە چاکسازییەکانی پێشەنگەکانی تەنیا لە بازنەی ڕامانی فیکریی تیۆرییدا مانەوە کە پێویستییەکانی گۆڕانکاریی ڕیشەیی فیکری کۆمەڵایەتیی ئیسلامیی نەهێنایەدی.

لەدوای غەزالی، زۆرێك بیریار و چاکسازیخوازی تر هاتن، لەوانە شێخی ئیسلام تەقیەدین ئەحمەد ئیبن تەیمییە و پێشەوا عەلیی کوڕی ئەحمەدی ئیبن حەزم و عەللامە عەبدولڕەحمان ئیبن خەلدون. هەر لەو هەولانە ئەو چاکسازییە سیاسی و کارگێڕی و سەربازییانەی کە ئەمیرەکانی بنەماڵەی زەنگی و سەلاحەدینی ئەیوبیی

پێی هەڵسان و توانییان بەشێکی زۆری وزەی ڕۆحی و ماددیی ئوممەت نوێ بکەنەوە، بەجۆرێك کەبتوانن سوپای خاچپەرستە داگیرکەرەکان تێکبشکێنن و خاك ڕزگار بکەن و شوێنە پیرۆزییەکان وەرگرنەوە.

بەهاتنی هۆزە تورکە دەشتنشینە بەهێز و چاونەترسەکان بۆ ناو ئیسلام، خـوێنی ئوممـەت نـوێ بوویـەوە، پاشـان ئـەوەی ببەدوایـدا هـات بەدامەزرانـدنی دەوڵـەتی نەوەکانی عوسمان (عوسمانییـەکان) و ئـەو ڕێکخسـتنە کـارگێڕی و سـەربازییەی کـە ئاڵای ئیسلامی لە ڕۆژهەڵاتی ئـەوروپادا بـەرزکردەوە، ئەگەرچـی وڵاتـی عەرەبـەکان و وڵاتانی موسوڵمانی دەورووبەری لە متبوونو ڕەوەستاندا بوون. دەوڵەتی ئیسلام لـە ئیسپانیاش لە پەرتەوازەیی خۆی و شەڕ و کوشتاری هۆز و ڕەگەزپەرستی و ئـەمیر و پادشای شوێنەکانیدا بەردەوام بوو تـاوەکو ئیسـپانەکان ڕووخانیـان و کاولیـان کـرد، پاشـان لـە سـەدەی هـەژدەی زایینـەوە جیهـانی ئیسـلامیی نغـرۆی دواکـەوتنو دستەوسـانیو داڕمـان بـوو، لەبـەردەم هێـزە تـازە پێگەیشـتووەکانی ئـەوروپادا پاشەکشەی کرد.

پاشان لایەنەکانی بەرەنگاربوونەوە و هەوڵدان بۆ چاکسازی و گۆڕانکـاریی، لـەنێو ئوممەتی ئیسلامییدا دەستی بە جووڵانـەوە کـرد، لەوانـە هـەوڵی شـێخ موحەممـەدی کوڕی عەبدولوەهاب (١٧٠٣– ١٧٩٢ز)، بـۆ زیندووکردنـەوەی فیکـری ئـیبن تەیمییـە، هەروەها بزووتنەوەکەی موحەممـەی کـوڕی عـەلیی ئەلسەنوسـی لـە لیبیـا (١٧٨٧– ١٨٥٩ز) و بزووتنەکەی پێشەوا موحەممەدی مەهدیی لـە سـودان (١٨٤٣– ١٨٨٥ز) و بزووتنەوەکـــەی عەبدولحەمیـــد بـــن بادیســـی جـــەزائیریی (١٨٨٩– ١٩٤٠ز) کـــە بزووتنەوەیەکی ئیسلامیی ئیسڵاحیی بوو بـۆ ڕزگـارکردنی جـەزائیر دامـەزرا و پاشـان سەربەخۆییوونی ئەو لە ساڵی (١٩٦٢ز) هاتە دەست، لەوانە ئەو چاکسازییە مـەدەنی و سەربازییانەی سوڵتانە عوسمانییەکان پێی هەڵسان، لە سوڵتان سەلیمی سێیەمەوە (١٧٦١– ١٨٠٨ز) دەسـتی پێکـرد و بـە سـوڵتان عەبدولحەمیـدی دووەم (١٨٤٢– ١٩١٨ز) کۆتاییهات، هەروەها ئەو چاکسـازییە مەدەنییانـەی کـە خـدێوی موحەممـەد

عـەلی پاشـا (١٧٦٩- ١٨٤٩ز) لەسـەر شـێوەی ئـەورووپی لەلایەنـەکانی ئـابووری و کشتوکاڵی و پیشەسازی و فێرکردن و سەربازییەوە هێنایە میسرەوە، بزووتنەوەکەی جەمالەدینی ئەفغانی (١٨٣٨- ١٨٩٧ز) کە جووڵانەوەیـەکی چاکسـازیخوازی فیکـری سیاسیی بـوو، هـەروەها قوتابخانـەی شـێخ موحەممـەد عەبـدە (١٨٤٩- ١٩٠٥ز) لـە چاکسازیی ئایینی و ڕۆشنبیری، ڕێکارە عەلمانییەکانی جەنەڕاڵ کەمال پاشا ئەتاتورك (١٨٨١- ١٩٣٨ز) لـە نوێکردنـەوەی تورکیـا لەسـەر شـێوازی ئـەورووپا ئـەو کاتـەی کەخیلافـەی عوسمـانی هەڵوەشـاندەوە و دامەزرانـدنی کۆمـاری تورکیـای لەسـاڵی (١٩٢٣ز) ڕاگەیاند و یاسای سویسری خستە شوێنی شەریعەتی ئیسلام.

هـــەروەها بزووتنەوەکـــەی پێشـــەوا حەســـەن بـــەننا (١٩٠٦- ١٩٤٩ز) کـــە بزووتنەوەیەکی ئیسلامیی سیاسیی کۆمەڵایەتیی ئیسلاحیی بـوو لـە میسـر و وڵاتـانی عەرەبییدا بڵاوبوویەوە، بزووتنەوەکەی پێشەوا ئەبو ئەعلای مەودوودیی (کۆچکردووی ١٩٧٩ز)، کـە بزووتنەوەیـەکی ئیسـلامیی سیاسـیی کۆمەڵایـەتیی ئیسـلاحیی بـوو لـە نیمچە دوورگەی هیندا بڵاوبوویەوە، لـەپاڵ زنجیرەیـەکی دووروودرێـژی بیرمەنـدان و چاکسـازیخوازان، لەوانـە: شـا وەلیوالڵـەی دەهلەوی(کۆچـکردووی١٧٦٣ز) و عەللامـە موحەممەد ئیقبال (کۆچکردووی ١٩٣٨ز) و خەیرەدین تونسی (کۆچـکردووی ١٨٩٠ز) و عەبدولڕەحمان کەواکبی (کۆچکردووی ١٩٠٢ز) و ڕەشید ڕەزا (کۆچکردووی ١٩٣٥ز) و سەید قوتب (کۆچکردووی ١٩٦٦ز) و مالیك بن نەبی (کۆچکردووی ١٩٧٣ز) و جگـە لەمانیش.

سـەرباری ئـەو هـەموو هەوڵـە زۆر و هەمـەجۆرەی کـە هـەموو لایەنـە ئیسـلامی و مەدەنییەکانی لەلایەنەکانی بیروبـاوەڕ و سیاسـی و کۆمەڵایـەتی و ئـابووری گرتـەوەو دەستپێکردنێکی دروستیان هەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئاشکرایە کە لەسەر دەستی ئەوان سەرچاوەی دەرد و بەڵا نەدۆزرایەوە و نەیانتوانی مەبەستی خۆیان بەدیبهێنن و وزە شـاراوەکانی ئوممـەت بەشـێوەیەکی کـارا بجـووڵێنن و بونیـادە فیکـری یـان

دەروونییەکەی چاك بکەن و ئەو کەلێنە گەورەی لەڕووی ئەنجامدانی ئەرکەکان و توانا و شارستانییەتەوە هەبوو نەهێڵن[1].

لەبەردەم ئەم حاڵەتەی کە ئوممەتی تێدایە، لێکۆڵەر و بیرمەند توانای بەردەوامبوونی لەگەڕان و لێکۆڵینەوە نابێت تا ڕێنوێنی نەکرێت بۆ لای هۆکاری دەردەکە یاخود هۆکارە گرنگە گەورە کاریگەرەکانی و هۆکارەکانی چارەسەرەکردنی بدۆزێتەوە، هەتا جەستەی ئوممەتی پێ چارەسەر بکات و تواناکانی بگۆڕێت و سەرکەوتووانە ڕووبەڕووی تەحەددا و پێشهاتەکان بێتەوە، هەتا لەکۆتایی ڕێگاکەدا بەخششی خۆی پێشکەشی مرۆڤایەتیی بکات و لەشساغی و ماف و شکۆی خۆی وەربگرێتەوە و پشکداربێت لە بونیادنانی شارستانییەتیەکەیدا.

**منداڵ، سەربازی ون:**

ئەوەی لەم توێژینەوەدا دەیبینین، ئەوەیە هیچ شتێك نەماوەتەوە بیری چاکسازی و بزووتنەوە چاکسازیخوازە ئیسلامییەکان تاوەکو ئێستا پەرۆشانە قسەیان لەسەر نەکردبێت، لەگەڵ ئەوەشدا گرنگترین ئەو ڕەهەند و هۆکارانەی کە پێویستە ئاوڕیان لێ بدرێتەوە بابەتی منداڵە، بەو سیفەتەی ئامڕازێکی بنەڕەتی ئەنجامدانی ئەو چاکسازی و گۆڕانکارییە پێویستەیە، چونکە منداڵ توانای ئەو بارودۆخانەی هەیە کە مەرجەکانی چاکسازی و گۆڕانکاری دەستەبەر دەکات کە بزاڤە چاکسازیخوازەکان بانگەشەی بۆ دەکەن و دەبێتە مایەی دووبارە ئامادەکردنەوەی تاکی موسوڵمان و کۆمەڵگای موسوڵمان و سەرلەنوێ بەدەستهێنانەوەی توانا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی پێشهاتەکان.

---

[1] - بۆ پەیبردن بەرەهەندەکانی ئەم بابەتە فیکرییە، بڕوانە:

– أبو سليمان، عبدالحميد أحمد. أزمة العقل المسلم، هرندن والرياض: المعهد العالمي للفكر الإسلامي والدار العالمية للكتاب الإسلامي، ١٩٩٤م.

گەر فیکری ئیسلامیی لە پرۆسەی گۆڕانکاریی و گەشە و پەرەپێدانی بەرچاوی جەستەیی و دەروونیی لای منداڵ ڕابمایە، ئەوا ئەو بیرکردنەوەیە پەی بە ڕەهەندی گۆڕانکاریی لە دەروونی مرۆڤایەتی و تێگەیشتنی رەوش و داخوازییەکانی دەبرد، ئەوەش دەبووە باشترین دەروازە بۆ ئەنجامدانی چاکسازیی میتۆدەییانەی مەعریفەی ئیسلامی و دووبارە بونیادنانەوەی کەسێتیی موسوڵمان بەرەهەندە تاکی و کۆمەڵیەکانییەوە.

**ڕۆشنبیریی گشتی و ڕۆشنبیریی تایبەت:**

**نەخۆشییەکە تاوەکو ئێستاش بونیادەکە ورد و خاش دەکات:**

جێی سەرنجە، کە بەشە کەمەی ئوممەت بۆ منداڵ و پەروەردە و فێرکردنی لە سەردەمانی ڕابردوویدا تایبەتی کردبێت، دوو لایەنی جیاواز بووە:

بەشی یەکەم: ئەم بەشە ئاڕاستەی منداڵی کەسە تایبەتەکان بووە، لەشێوەی ئامۆژگاریو ڕێنموونییدا پێشکەشی پەروەردەکارانی مناڵانی کەسانی تایبەت کراوە کە لەماڵەکانی خۆیاندا فێریان دەکردن، لەم فێرکردنەدا زۆر واتای باشەو ڕێزو باشی شێوازی پەروەردەکردنی تێدا بووە کە نەوە و منداڵی گەورەو دەسەڵاتدارانی لەسەر پەروەردە دەکرا، تاوەکو ئەو مناڵانە ئامادە بکرێن بۆ پێگەکانی سەرۆکایەتی و فەرمانڕەواییو دەسەڵاتداری لەکۆمەڵگادا. لەوانە وەسێتی موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان و عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان و حەجاجی سەقەفی و هاروون ڕەشید و گەورەو دەسەڵاتدارەکانی تر، کەلە کتێبەکانی مێژوو و کەلپووردا بۆمان پارێزراوە، مامۆستایانێك ئەو منداڵانەیان پەروەردەکردووەو فێری زانستەکانی ئایین و ئەدەب و ڕۆشنبیری و سەرکردایەتییان کردوون.

بەشی دووەم: ئەم بەشە تایبەت بووە بە منداڵی خەڵکانی گشتی، فێرکردنی ئەمانە لە حوجرەکان بووە، تێیدا فێری بەشێك لە قورئانی پیرۆز و هەندێ بنەمای ژماردن دەکران کە پێویستبوون بۆ بەڕێوەبردنی پێویستییەکانی ڕۆژانەی تاك.

ڕەوشی ئەو قوتابخانە بچووکانە و توانای فێرکارەکانی و شێوازەکانی فێرکردنیش تێیاندا –وەك ئەوەی مێژوو بۆمان باسی دەکات– زۆر خراپ بووە و سووکایەتی پێکردنی زۆری تێدا بووە، پشتی بە لەبەرکردن و سزای جەستەیی بەستووە، لەسەر خەرجیی باوکانیان خوێندویانە، ئەوانیش دەستکورت و هەژار بوون.

خەڵکانێکی زۆر کەمی خاوەن فیکر و زانست گرنگییان بە دۆخی نالەباری ئەو قوتابخانانەو ڕەوشی خراپی فێرکردن تێیاندا داوە، بارودۆخەکەیان خستۆتە ڕووو نێگەرانی خۆیان بۆ ئەو ڕەوشە دەربڕیووە، لە نموونەی پێشەوا غەزالی و عەللامە ئیبن خەلدون، ڕەخنەیان لەڕەوشی ئەو قوتابخانانە و ئامڕازەکانی و داتەپینی ئاستی مامۆستاکانیان گرتووە، تەنانەت هەندێکیان ئامۆژگاری باوکانیان کردووە نەهێڵن مامۆستاکان هیچ کاروبارێکی بیروباوەڕ فێری منداڵەکانیان بکەن، ئەمەش بەهۆی دارمانی مەعریفەی ئەو مامۆستایانە و خراپبوونی بیروباوەڕیانەوە.

دەرئەنجامی ئەمەش خراپی ڕەوشی فێرکردنی گشتی ڕۆڵەکانی ئوممەت دارمانی ڕۆشنبیری و هۆکارەکانی پەروەردەکردنیان بوو، ئاشکرایە بوونی دوو جۆر ڕۆشنبیری و فێرکردن، یارمەتیدەر بوو بۆ دروستبوونی ئەو دۆخە.

لەپاڵ ئەم دوو جۆر فێرکردنەدا، جۆری سێیەمیش هەیە بۆ ئامادەکردنی فەرمانبەران، ئەوەش لە هەندێ قوتابخانە و ئەڵقەی سنووردراوی وانەخوێندندا لەڕێگەی ئەوقافەوە ئەنجام دەدرا، کەمینەیەکی گەنجی هەڵبژێردراو تێیاندا دەیانخوێند، تاوەکو ببنە دەستەبژێری زانستی ئایینی و لە دیوانەکان و کارەکانی فەتوا و دادوەرییدا کاری نووسەری و خزمەت ئەنجام بدەن، لەو قوتابخانانەدا وانە ئایینی و ئەدەبی و زمانەوانییەکانیان دەخوێند، بەتایبەت وانەکانی فیقه و بنەماکانی، بەهۆی پێویستیی زۆر بە کەسانی شارەزای فەتواو دادوەریی ئەوپەڕی برەوی هەبوو.

ڕەوشی فێرکردنی ڕۆڵەکانی ئوممەت لەڕابردوودا بەو جۆرە بوو، لە ئێستاشدا تا ڕادەیەکی زۆر لەزۆربەی وڵاتانی ئیسلامییدا هەر بەوجۆرەیە ئەگەر لەهەموویاندا وا نەبێت، دەبینین منداڵی گەورە و دەوڵەمەندەکان لەسەر خەرجیی باوکانیان لە

قوتابخانه تایبەت و بیانییەکاندا دەخوێنن، ئەو قوتابخانانەش هەموو کەرەستە و ئامراز و شێوازێکی فێرکاری و تەکنەلۆژیی پێشکەوتوویان بۆ دابینکراوە کە لە قوتابخانەی منداڵانی خەڵکی گشتییدا فەراهەم نییە، لەهەمان کاتدا ئەو قوتابخانانە لە بەرۆژئاواییکردنی عەقڵی فێرخوازانیدا بەشدارن، بەشێوەیەك کە پەیوەندی زۆربەیان بە نەتەوە و ئایین و ڕۆشنبیرییانەوە لاواز دەبێت و دەرککردنیان بە حەقیقەتی هەستی ئوممەتەکەیان و وزە شاراوەکانیو جوولان تێیدا لاواز بێت، لەهەموو حاڵەتێکدا دەیانگۆڕێت بۆ سەرکردەو فەرمانڕەوای لوتبەرزی ستەمکاری گەندەڵی خۆشگەزەران، کە دەتوانن –بە ئامرازەکانی سەرکوتکاری و هاریکاری بێگانە و لەخشتەبەرییەکانیان و بەکاریگەریی ئەو پیسبوونە ڕۆشنبیری و نەخۆشییە ویژدانییانەی خستوویانەتە نێو ڕۆڵەکانی ئوممەتەوە– دەستبگرن بەسەر جومگەکانی دەسەلاتی ولاتەکەیانەوە و هەموو هێزەکانی هەستانەوە و توانا و دەستپێشخەری و داهێنان خامۆش بکەنەوە و حاڵی گەلانی خۆیان بەو دەستەوسانیو هەژاریو نەفامیو دواکەوتوویە بەتاریکیو ناڕوونیەکانی گەیاند کە بەدەست سەرکوتکاری بێگانەوە دەینالاند کەچاوی بڕیبووە خێرو بێرەکانیو هەوڵی هەڵسو کەوتکردن بەسامانەکانی و ئەتککردنی پیرۆزییەکانی دەدا.

بەهۆی کەمتەرخەمییەکانی ڕۆشنبیریی ئیسلامییەوە، منداڵ بووە ئەو ئەڵقە بەتاڵەی کە دەستەوەستانی ئوممەت لەگۆڕینی رەوشیو نوێکردنەوەی وزەکانی تێدا دەسوڕایەوە.

بێگومان وەلانانی کاروباری پەروەدەی منداڵی موسوڵمان و دەستەوەستانی عەقڵی موسوڵمان لەو بوارەدا و درك نەکردن بە گرنگی گەشەپێدانی پەروەردەیی و فێرکردنی منداڵ لە ولاتانی ئیسلامی و کەمتەرخەمی زۆر لە فەراهەمهێنانی پێویستییەکانی ئەو گەشەپێدانە، یەکێکە لەگرنگترین هۆکارەکانی بێ توانایی لەئەنجامدانی چاکسازیی و گۆڕانکاری پێویست لە دووبارە داڕێژرانەوەی عەقڵی و ویژدانی منداڵی موسوڵمان.

**گەشەپێدانی وشیاریی پەروەردەیی و**

**چاککردنی فێرکردن بەردی بناغەی چاکسازیین:**

گرنگترین ئەو هەڵانەی ئێمە تێیدەکەوین، ئەوەیە ئێمە خۆمان لە ئامۆژگاریکردنی پێگەیشتوواندا ماندوو دەکەین، لەکاتێکدا کە گرنگی نادەین بەگەشەکردنییان کەمندالَن، هەولَ نادەین گۆڕانکاریی پێویست لە بونیادی ویژدان و دەروونیاندا دروست بکەین، بەجۆرێك خەون و ئومێدی ئوممەت بەدیبهێنێت، لەکاتێکدا کەلەتەمەنی وەرگرتنو فێربوون و کاریگەربوونداندان، بەمجۆرە لادان و دەستەوەستانیی یەك لەدوای یەك بەردەوام دەبێت، ئەو کاتەی مندالَ وەك دارێکی نەرم لەبار وایە فەرامۆش دەکرێت، بۆیە لە گەورەبووندا لار و وشك و بێسوود دەبێت، هیچ هاوار یان چارەسەرێك سوودی نابێت لەگەڵیدا.

لەراستیدا تێگەیشتنی عەقڵی لای کەسانی پێگەیشتوو بەتەنیا –وەك پێویست– بەس نییە بۆ جووڵاندنی ویژدانیان و نابێتە هۆی هەڵچوون و کارلێککردنیان، ئاخۆ چەندە مرۆڤی ترسنۆك هەیە هیچ ئازایەتییەکی لێ نابینرێت، کەچی چەندین شیعری پڕ جۆش و خرۆشی لەبەرە کە زۆر کەسی ئازا و بوێر نایزانن، چەندە پزیشك هەیە بکەزۆر جگەرە دەکێشێت و دەشزانێ کە زیانی جگەرەکێشانیش چییە، کە بەخەیاڵی ئەوانەدا نەهاتووە لێویان لە تووتنی جگەرەش نەداوە، ئەی چەند رۆڵەی موسولَمان –بەڕۆشنبیر و خەڵکانی گشتییەوە– هەیە پەرۆشانە تەماشای کەناڵە هەواڵیەکان دەکەن و ڕۆژنامەو شیکارییەکان لەهەموو سەرچاوەکانەوە دەخوێننەوە و هیچ ناتەواوییەکی درککردنی عەقڵی لایەنەکانی ناتەواوی لەنێو ئومەتەکەیانو ئەوەی پێویستیان پێیەتی نییە، کەچی لەکار و کردەوە و هەڵسوکەوتو رەفتارو بەخشینیاندا هیچ شوێنەوارێکی ئەوە نابینیت، وەك ئەوەی مرۆڤی موسولَمان ئامێری رادیۆ یان تەلەفزیۆن بێت لە زۆر رەویو مشتومڕدا، کەچی لەکردار و هەولَ و بەخشینی عەقڵییدا هیچی لەباردا نییە.

لەگرنگترین هۆکارێکی ئەم دیاردە نەخۆشییە، ئەوەیە کە ڕەهەندە گشتییەکانی بونیادنـانی کەسـێتیی موسـوڵمان لەقۆناغـەکانی پێگەیشـتنی سـەرتایدا فـەرامۆش کراون، دەرفەتەکانی بونیادنان لەدەستدراوە، بۆیە باسکردنی بۆ پێگەیشـتووان هـیچ سوودێکی نابێت، چونکە هەموو ئەوەیادخستنەوەو ئامۆژگـاری و ڕوونکردنـەوە لای پێگەیشـتوو دروسـتی دەکـات بریتییـە لەتێگەیشـتنی عـەقڵی، کـە ئـەوە هـیچ پەیوەندییەکی بە هەڵچوونی ویژدانییـەوە نابێـت، گـەر بـەکرداریی لـەکاتی منداڵییـدا تیایـدا نەچـێندرابێت، نموونەشـی لەمـەدا وەك نموونـەی کاریگـەریی زمـانی یەکـەم و زمانی دووەمە لەسەر دەروون و هەڵچوونەکانی.

لەبەر ئەوەی هەڵچـوون و داهێنـان تـەنیا بـە زمـانی یەکـەم دروسـت دەبـن، بۆیـە دەوڵەمەندکردنی زمانی یەکـەمی هـەر گـەلێك بـە هـەموو شـتێکی نـوێ، کـارێکی زۆر گرنگە. هەرچی زمانی دووەمە کە لە دەروونی مرۆییدا پشت بە وەرگێڕان دەبەستێت، ناتوانێت بە ئاسانی هەستەکان بجووڵێنێت، چونکە لە زمانی یەکەمـدا بێـژە و بابـەت لەیەك دانەبڕاون و بەبێ وشە و بێژە تێڕوانینی بابـەت ناکرێـت، یەکتربەسـتنی نێـوان بێژە وەك هێما و بابەتیش وەك ناوەڕۆك نهێنیی هەڵچوون و کارلێککردنن لەو زمانەدا.

## وانەی موساییانە و گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی:

ڕەنگە لێرەدا گرنگ بێت بۆ ئەزموونی ئیسلامیمان وەك پەند و وانـە ئـەو چـیرۆکە قورئانییەی موسا لە چاکسازی بەنی ئیسرائیلدا بهێنینەوە. لە میسری فیرعەوندا بەنی ئیسـرائیلییەکان لاواز بـوون و سـتمکارانە کرابوونـە کۆیلـە، خـوای گـەورە ویسـتی چـاکەیان لەگـەڵ بکـات و ئـەوەی بـەهۆی سـتەم و چەوسـاندنەوە و کۆیلەیەتییـەوە لەدەروونیاندا خراپ ببوو خوای گەورە بۆیان چاك بکاتەوە. ئەوە بوو کـاتێ موسـای پێغەمبەر (سەلامی خـوای لەسـەربێت) ئـەوانی لـە میسـر بـەرەو بیابـانی سـینا بـرد، لەڕێگەی بەرەو زەویی بەڵێنپێدراودا داوای لێکردن ڕووبکەنە ئەو خاکە و وەریبگـرن و

دەوڵەت و کۆمەڵگای لەسەر دروست بکەن، تاوەکو ئازادیی خۆیان وەربگرنەوە و بەرپرسیارێتی خۆیان هەڵبگرن.

لەبەرئەوەی ئەو قەومە بەکۆیلەییەتی پێگەیشتبوون، نەیانتوانی بەشوێنکەوتنی بونیادنان و قوربانیدان و دەستپێشخەرییەکانی هەڵبستنەوە، بۆیە هەر دەبوو لە ترس و دەستپێشخەریی نەکردندا وەك کۆیلە وەڵام بدەنەوە، بۆیە موسا پێیگوتن:﴿يَاقَوْمِ ادْخُلُوا الْأَرْضَ الْمُقَدَّسَةَ الَّتِي كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَرْتَدُّوا عَلَى أَدْبَارِكُمْ فَتَنْقَلِبُوا خَاسِرِينَ (٢١) قَالُوا يَامُوسَى إِنَّ فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَنْ نَدْخُلَهَا حَتَّى يَخْرُجُوا مِنْهَا فَإِنْ يَخْرُجُوا مِنْهَا فَإِنَّا دَاخِلُونَ﴾ [المائدة: ٢١–٢٢]، واتە: ئەی قەوم و عەشیرەتم بچنە ناو ئەو زەوییە پیرۆزەی (القدس)، کە خوا پێویستی کرد لەبەر سوودی خۆتان بچنە ناوی، پاشگەز مەبنەوە و پاشەکشێ مەکەن تا خەسارەتمەند و زەرەرمەند نەبن. (کەچی) وتیان: ئەی موسا بەڕاستی خەڵکێکی ئازا و بەرز و دلێری تێدایە، بێگومان ئێمە هەرگیز ناچینە ناوی تا ئەوانی لێدەرنەچن، جا ئەگەر ئەوان دەرچوون لێی، ئەوە بێگومان ئێمە دەچینە ناوی و لەوێ دەبین!!

نەرێنی و دەستپێشخەری نەکردنی خۆیانیان دەربڕی –ئەمە سیفەتی دووەمی دەروونیی کۆیلەیە– بەرپرسیارێتییان لەسەر خۆیان لابرد و باری شانی کەسی تریان گران کرد، ئەو کەسەش گەورەمان موسا بوو (سەلامی خوای لەسەربێت)، ئەمەش لەزمانی گەلانماندا ئەمڕۆ یەکسانە بە: "حکومەت"، یان "نەتەوە یەکگرتووەکان"، یان "کۆمەڵگای نێودەوڵەتی". لەبەر ئەوەی کۆیلە –بەهۆی دۆخ و پیکهاتەی دەروونییەوە– نەرێنی دەبێت، چونکە هیچ بەرژەوەندیو حەقێکی لە دەستپێشخەرییدا نییە، هەموو ئەوەی لەتوانایەتی ئەوەیە ملکەچی فەرمانەکان ببێت، چونکە کۆیلەیەکی فەرمانپێکراوە".

بەشی دووەم بەمشێوەیە بوو، ئەویش وەڵامی بەنی ئیسرائیل بوو بۆ موسا (سەلامی خوای لەسەربێت)، وەڵامی سەرشۆڕانەی و دەستبەرداربوون لە بەرپرسیارێتی و خستنە ئەستۆی "کەسی تر":﴿قَالُوا يَامُوسَى إِنَّا لَنْ نَدْخُلَهَا أَبَدًا مَا

دَامُوا فِيهَا فَاذْهَبْ أَنْتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلَا إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ﴾ [المائدة: ٢٤]، واتە: كەچی وتیان: ئەی موسا دڵنیابە ئێمە هەرگیز ناچینە ئەو شارەوە و ڕووی تێناکەین مادەم ئەو جەنگاوەرانەی تێدا بێت، (ئیتر تۆ کەیفی خۆتە حەز دەکەیت)بچۆ خۆت و پەروەردگارت جەنگ بکەن دژیان، ئێمە بەڕاستی ئا لێرەدا دانیشتووین (چاوەڕێی سەرئەنجامین)!!

موسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) دەیزانی سەرزەنشت و هاوار و ئامۆژگاریی هیچ لە سروشتی ئەوانە ناگۆڕێت کەبە"کۆیلایەتی" پێگەیشتووان و وزەی پێویست و ئەو هێز و ئازایەتییەیان بۆ فەراهەم ناکات کە بونیادنان و بەرگریی پێویستی پێیەتی، بۆیە دەبوو هەوڵەکانی ڕووبکاتە نەوجەوانان تاوەکو ئامادەیان بکات و لە بناغەی بونیادنانیاندا سیفەتە پێویستەکانی بونیادنانی شارستانییەت و دامەزراندنی کۆمەڵگا و ڕووبەڕووبوونەوەی پێشهاتەکان بچێنێت.

گرنگە دەرك بەوە بکەین کە جیاوازییەك لەنێوان ئاڕاستەکردنی ویژدان و وزەی دەروونی و لەنێوان سروشتی هەردووکیاندا هەیە، دەروون و وزەی دەروونیی دەتوانرێت بە پشتبەستن بەو قەناعەتانەی کە دەکرێت بەپێی ئەوەی بەسەر مرۆڤ دێت لەتێگەیشتن و ئەزموون ئاڕاستە بکرێن و دووبارە ئاڕاستە بکرێنەوە، بێباوەڕ ببێتە باوەڕدار، ستەمکار دەست لە ستەمکاریی هەڵبگرێت، گومڕا هیدایەت وەربگرێت. بەڵام بنچینەی سروشتی دەروون و بونیادنانی دەروونی ئەمەیان گۆڕانکاریی قبوڵ ناکات، بەجۆرێ کە کەسی ئازا و بوێر نابێتە ترسنۆك، مرۆڤی چرووك نابێتە بەخشندە، ئازاد و بەڕێز نابێتە سووك و ڕیسوا.

نموونە بۆ ئەوە، سەربازی سوپایەکی باش لەگەڵ ئەندامی دەستەیەکی چەتەی تاوانکار هەردوکیان لەدوو سیفەتی بنەڕەتیی خەسڵەتەکانی بونیادنانی دەروونییدا هاوبەشن، ئەوانیش ئازایەتی و دڵسۆزییە، بەڵام لەڕوویەکەوە جیاوازن، سەربازی سوپاکە کەسێکی چاکە و پارێزگاریی لە نەتەوە و نیشتمان دەکات، بەڵام ئەو کەسەی ئەندامی گرووپێکی چەتەگەری تاوانکارە کەسێکی خراپە و خۆی دەخاتە

خزمەت تاوان و ئازاردانەوە، ڕەنگە پیاوە چەتە و تاوانبارەکە لە ستەم و وێڵیی خۆی پاشگەزبێتەوە و ببێتە کەسێکی چاك، ڕەنگە و دەکرێت سەربازەکەش گومڕابێت و بانگەواز بۆ خراپەکاریی بکات. عومەری کوڕی خەتاب و ئەبو جەهل –عەمری کوڕی هیشام– دوو پاڵەوان و سەرکردەبوون: یەکێکیان پاڵەوانی هیدایەت و ئیسلام، ئەوی تریان پاڵەوانی بێباوەڕی و نەفامی.

بۆیە بڕیاری موسا (سەلامی خوای لەسەربێت) بەڕێنمایی خوای گەورە–کە خوای گەورە سروشت و حاڵی دەروونیی ئەو قەومەی دەزانی– ئەوە بوو رووبکاتە کارکردنی ڕیشەیی بۆ هێنانەدیی چاکسازی و ئەنجامدانی گۆڕانکاریی لە ئاستی دڵ و دەروون و پەلە نەکردن لە هێنانەدیی بەرهەمی ئەو کارە، ئەوەش بە کارکردن لەسەر دووبارە پەروەردەکردنەوەی ئەو قەومە، لەبەر ئەوە هەموو هەوڵێکی روو لەنەوجەوانان بوو، تاوەکو لەڕووی ڕۆشنبیری و عەقڵ و دەروونییەوە لەسەر بناغەیەکی ساغ بونیادیان بنێتەوە.

بەمجۆرە موسا (سەلامی خوای لەسەربێت) –بەڕێنوێنی خوای گەورە– نەوجەوانانی "کۆیلەی" بەنی ئیسرائیلی ناچارکرد، بۆ چل ساڵ لە بیابانی سینادا لەسەختیو ناڕەحەتیدابمێننەوە، بۆ ئەوەی بونیادنانی نەوەیەکی ئامادە و دەربازکراو لە شێواندنەکانی عەقڵ و دەروون کەبەهۆی سەردەمی کۆیلەیەتییە هەیانبووە: ﴿قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْ أَرْبَعِينَ سَنَةً يَتِيهُونَ فِي الْأَرْضِ فَلَا تَأْسَ عَلَى الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ﴾ [المائدة: ٢٦]، واتە: خوا فەرمووی: بەڕاستی ئەوە ئیتر شاری قدس لەسەریان حەرامە، دەبێت چل ساڵیش وێڵ و سەرگەردان بن لەسەر زەویدا(تا ئەو نەوە ترسنۆکە تیا بچێت و نەوەی تازە پێبگات)، ئیتر خەفەت مەخۆ بۆ گەل و هۆزی تاوانبار و ستەم پیشە.

ئەنجامەکەی بونیادنانی نەوەیەکی ئازاد بوو: ﴿قَالَ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُمْ مُلَاقُو اللَّهِ كَمْ مِنْ فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ [البقرة: ٢٤٩]، واتە: ئەوانەی دڵنیابوون بەخزمەت پەروەردگاریان دەگەن، وتیان: (مەترسن) چونکە

چەندەها جار دەستەی کەم، زاڵ بوون بەسەر دەستەی زۆردا بەفەرمانی خوا و خوا یار و یاوەری خۆگر و ئارامگرانە.

﴿فهَزَمُوهُمْ بِإِذْنِ اللَّهِ وَقَتَلَ دَاوُودُ جَالُوتَ وَآتَاهُ اللَّهُ الْمُلْكَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَهُ مِمَّا يَشَاءُ وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَفَسَدَتِ الْأَرْضُ﴾ [البقرة: ٢٥١]، واتە: ئەوسا ئیتر بە فەرمانی خوا لەشکری جالوتیان بەزاند و داود (کە یەکێك بوو لە سەربازانی تالوت) جالوتی کوشت، لەوەودوا خوای گەورە پاشایەتی و دانایی پێبەخشی و هەرچی ویستی بوو فێری کرد، خۆ ئەگەر خوا هەندێك لە خەڵکانی بە هەندێکی تری لەناو نەبات، هەر هەموو سەر زەوی پڕ دەبێت لە تاوان و خراپە.

لەم ئەزموونە پەروەردگارییەدا پەند و وانە و ئامۆژگاریی بۆ هەر کەسێك تێدایە کە لە سروشت و نەریتەکان بگات و شارەزایی هەبێت لە زانستەکانی دەروون و پەروەردە و کۆمەڵگا.

بۆیە ئامادەنەبوونی بابەتی منداڵ لەوەی ببێتە چەقی پەروەردەیی زانستیی گرنگ لە پرۆژەی چاکسازی ئوممەتدا، تەنیا لە ئاراستەکردنی گوتاری ئامۆژگارییدا بۆ پێگەیشتووان قەتیس بکرێت، پەلەی لێکردنەوەی بەرهەمەکەیان هەبێت، بەڵکو ئەمە گوزارشتە لەتەنگەژەیەکی فیکری ئوممەت و بێئاگاییە لە ڕۆڵی مەعریفە و لێکۆڵینەوە و خوێندنەوە و پێوانەو ئەزموون لە زانستی سروشتەکان و یەکترتەواوکردنی لەگەڵ مەعریفەکانی وەحیدا.

## دووەم: پێگەی فیکر لە کێشە هەرەگەورەکانی ئوممەتدا:

گومان لەوەدا نییە ئەو کێشە و تەنگەژانەی کە ئوممەت پێیەوە دەناڵێنێت زۆر و هەمەجۆرن، هەروەها ئەو هۆکارانەشی کە پێیدەگەیەنێت و خۆراکی دەدات، بەڵام کێشەیەك هەیە – لەهەموو بارودۆخەکاندا–بە دایکی زۆرێك لە کێشەکانی تر دادەنرێت و کە لەوەوە سەرچاوە دەگرن و کاریگەری ئەویان لەسەرە، هەروەك هۆکاری تریش هەیە کەئەو کێشانە دروست دەکەن و بەردەوامی پێدەبەخشن، بەڵام

ئــەوەی لــەنێو ســەختی ئــەو کێشــە کەڵەکــەبوو و بەدوایەکـدا هاتووانــەو هۆکــارە بەیەکداچووەکانیاندا گرنگە ئاگاداربوونە لەو هۆکارە بنەڕەتیانەی، کەبۆ مامەڵەی کارا لەگــەڵ ئــەو کێشــانەدا, بــەرەنگاری ئــەو هۆکــارە بنەڕەتیانــە ببینــەوە، تــا ببێتــە سەرچاوەی چارەسەرو زاڵبوون بەسەر هۆکارەکانی تردا.

ئاشکرایە جیهانی ئیسـلامیی شـوێنەکانی بەرفراوانـە، دەوڵەمەنـدە بـە سـەروەتی مرۆیی و ماددیی، ڕیشەی مێژوویی و شارستانیی هەیە، پڕە لە ئومێـد و، بـە بـەها و بنەماکان ئامادەکراوە، لەگەڵ ئەوەشدا جیهانێکی دواکەوتووە، لە حاڵەتێکی سەختی پەرتەوازەییدایە، شەڕ و ململانێی بەشبەشی کردووە، ئەوەش بۆتە هـۆی ئـەوەی زۆر هێزی تر کەلەرووی قەبارە و سەروەتی زۆر و ئامانجو مەبەستی بەرزدا وەك ئەم نـین، بتوانن بەسەریدا زاڵ ببن و بیچەوسێننەوەو لە مافەکانی خۆی بێبەشی بکەن و مامەڵە بەماڵو سامانیەوە بکەن.

هەندێك سەربوردە لە ئەدەبیاتی میللییـدا هەیـە بـۆ گوزارشـتکردن لـەواقیعی ئـەم حاڵـە لـە هـەزار بابـەت باشـترە، لەوانـە: دەگێڕدرێتـەوە کـە عـەرەبێکی دەشـتەکی پرسیاری لەپیاوێك کردوە کە ئایا خۆشی دەوێت،، وەلامەکەی ئـەوە بـوو: "بـەڵێ... چونکە نە هاوسێیەتی و نە نزیکیەتی!!"بەجۆرێك حاڵی ئوممەتیش لە پەرتـەوازەیی و شــەڕی یەکترکردنــدا پەیوەندییــەکی پێچــەوانەی ئــەوەی هەیــە کەپێویســتە پەیوەندییـەکانیو پەیوەسـتیو بەیەکەوەبەسـتنەکانی لەسـەری بێـت کـە رایەڵـەی هاریکاری گەشە پێدەکات، هۆیەکانی خۆشەویستی نێوانیان بەتینتر دەکات.

ئەگەر بنەڕەت ئەوە بێت: " موسوڵمان بـرای موسـوڵمانەکەی تـرە، سـتەمی لـێ ناکات و ڕادەستی دوژمنی ناکات"، "خوای گـەورە لـە هاوکـاریی بەندەدایـە، تـاوەکو بەندەکـە لـە هاوکـاریی براکەیـدابێت"[١]، " موسـوڵمان بـۆ موسـوڵمانی تـر نموونـەی

---

[١] - القشيري، مسلم بن حجاج. صحيح مسلم، تحقيق: محمد فؤاد عبدالباقي، بيروت: دار احياء التراث العربي، (د.ت.)، ج٤، ص١٩٩٦، حديث رقم: ٢٥٨٠.

دیوارێکن و یەکتر قایم و تۆکمە دەکەن"[1]، "نموونەی باوەڕداران لە سۆز و بەزەییان بەرانبەر یەکتر، نموونەی یەك جەستەیە، گەر ئەندامێکی جەستە تووشی ئازار و ناڕەحەتییەك بێت، ئەوا هەموو جەستە شەونخونیی و ئازار دەچێژێت"[2]، چۆن ئەم حاڵە خراپ و پێچەوانەیە لێکبدەینەوە؟ بە چ ئایین یان بیروباوەڕێك، بەچ عەقڵ و لۆژیکێك، بەکام سوود و بەرژەوەندیی دەتوانین لەم حاڵەتە تێبگەین و پاسا و بۆ واقیعەکەی بهێنینەوە؟!

تێڕوانینەکان بۆ تێگەیشتنی ئەم دیاردەیە زۆرن، هەروەك ئەو سەرچاوانەش کە دەدرێنە پاڵی چەندین جۆرە، هەموو ئەو چارەسەرییانەی لەسەر ئەو تێڕوانینو سەرچاوانە بونیات نراوە –وەك ئەوەی دەیبینین– شکستی هێناوە، لەبەر ئەوە دەبێت ڕوانینێکی گشتگیرتر و قووڵترمان هەبێت، تاوەکو لەدیاردەکە تێبگەین و هۆکارە قووڵ و جەوهەرییەکانی بدۆزینەوە، بەبێ ئەوەی لەمێشکماندا تێکەڵی ئەو هۆکارە لاوەکی و نیشانەی نەخۆشییانە ببن کەلێی دەکەونەوە.

**ئیسلام سەرچاوەیەکی ئەو خێر و خۆشییە کە لەئوممەتدا ماوە:**

ئەوەی جێی داخە و کۆسپە لەبەردەم هەستانەوەی ئوممەتدا، ئەوەیە کەزۆرینەی دەستەبژێرە فەرمانڕەواکانیو جێبەجێکارە هاوچەرخەکانی کرۆکی فیکرو تێڕوانینیان بۆ ئوممەتەکەیانو بۆ شوناس و مێژوویان لە تێڕوانینی رۆژئاواوە سەرچاوەی گرتووە، ڕۆژئاوای چاوچنۆکی دەستبەسەرداگری داگیرکار و ئەدەبیاتی ئەوەوە بۆ هەموو یادگە مێژووییە خاچپەرستەکەی لەگەڵ جیهانی ئیسلامیو دەوڵەتی عوسمانی و تێکڕای چەرمەسەرییە مێژووییەکانی لەگەڵ کڵێسای سەدەکانی ناوەڕاست و بیرە کەهەنوتییە ئەفسانەییەکەی وەرگرتووە، کە پیرۆزی بەکارهێنا بۆ قۆرخکردنی

---

[1] - البخاري، صحیح البخاري، مرجع سابق، ج١، ص١٨٢ حدیث رقم: ٤٦٧، هەروەها بڕوانە:
– القشیري، صحیح مسلم، مرجع سابق، ج٤، ص١٩٩٩، حدیث رقم: ٢٥٨٥.

[2] - القشیري، صحیح مسلم، مرجع سابق، ج٤، ص١٩٩٩، حدیث رقم: ٢٥٨٦.

دەسەڵات و سەروەت و جێگیرکردنی ستەمکاری و گەندەڵی و هەڵکێشانی چرۆی هێزەکانی عەقڵ و زانین و گۆڕانکاریی و داهێنان لەکۆمەڵگادا، ئەمەش وەهای لە دەستەبژێرانی فەرمانڕەوای ئوممەتی ئیسلامیی کرد کە لە سروشتی رشتەبەندە شارستانیەکەیان و ئەو وزە شارستانییە ئاوەدانکارییە چاکە ئەرێنیانەی تێیدا تێنەگەن، کە بۆماوەی سیاسی هۆزگەر و گەلپەرستی لەپێناوی بەکارهێنانی پیرۆزیی لە خزمەت قۆرخکردنی دەسەڵات و سەروەت و سامان و توانای چەوسانەوە و خراپەکاری و لەگۆڕنانی هێزەکانی عەقڵ و زانین و داهێنان و چەمکەکانی یەکتاپەرستی و جێنشینی و بەرپرسیارێتی و ئازادی و ڕاوێژ و بەهاکانی تەواوکاری دەستباربۆیەکگرتن هەستابوو بەشێواندنی، بەبێ پشکنینێکی زانایانەی ڕەخنەگرانە کە هەرکێشە یان بەڵایەك بەسەر موسوڵماناندا بێت بیخرێتە ئەستۆی ئیسلام، لەکاتێکدا ئیسلام تیایدا پاك و بێگەرد بێت و بەشداری ئەرێنییانەی تێیدا هەبووبێت و تۆماری مێژوویی لەوەدا ڕۆش بێت.

ئەو حەقیقەتە ڕوونەی گرنگە بەلامانەوە لێرەدا، واتا لە بواری یەکبوون و دەستباربۆیەکگرتندا ئەوەیە کەهەر بەشدارییەکی ئەرێنی لەمێژووی موسوڵماناندا کەپاڵپشتیی یەکبوونی موسوڵمانان بکات و بانگەشەی بۆ بکات، ئەوە بۆ ئیسلام و بەهاکانی دەگەڕێتەوە، چونکە ئیسلام بوو گەلان و هۆزەکانی یەکخست، یەکسانی و برایەتی خستە نێوانیان، هەموو خراپەکارییە ڕەگەزپەرستییەکانیانی بۆ ئەرێنیی گۆڕی کەبانگەشە بۆ یەکسانی و برایەتی و هاریکاری بکات. هەموو مرۆڤایەتی لە یەك کەسەوە دروست بوون، جیاوازی گەلان و هۆزەکانیش هۆکارە بۆ یەکترناسین و تێکەڵبوون بەیەك و تەواوکاری، جیاوازیی زمان و ڕەنگی مرۆڤیش یەکێکە لە رووکارە سەرسوڕهێنەرەکانی دروستکراوەکانی خوای گەورە، جوان و ناوازە و یەکسان و کامڵ مرۆڤەکانی دروست کردووە، هیچ شتێکیان کەرەستە یان ئامرازی خۆبەزلزانی و لوتبەرزی و رقلێبوونو دوژمنایەتی نییە، چونکە بەڕێزترین کەسێك لای خوای گەورە،

ئەوەیانە کە زیاتر "لە خـوا دەترسـێت" و "خۆشەویسـتترینیان" لای خـوا ئەوەیانـە "بەسوودترنیانە" بۆ دروستکاراوەکانی خوای گەورە.

سەدای قورئانی پیرۆز و فـەرموودە و تۆمـاری مێـژووی سـەردەمی هـاتنی وەحـی لەبونیاتنانی ئوممەت و سیاسەتەکانی لە دادگەری و هاریکاری و دەسـتباربۆیەکگرتن و یەکدڵی و پتەوکردنی بنەماکانی ئاشتی گشتی و ئاسایشی کۆمەڵایەتی لەکۆمەڵگادا، داخو ئازار و پەشیمانیو ئومێدی نەبڕاوەی ئەو یەکبوونەوە لەدەروونی موسوڵمانانیدا دەوروژێنێت کە ئیسلام داوای دەکات.

خـۆ ئەگـەر ئیسـلام و بـەها و ڕوانینـە گەردوونییەکـەی هۆکـاری پەرتـەوازەیی و ململانێی نێو ڕیزەکانی ئوممەت نـەبێت، ئـاخۆ هۆکارەکـە لـەفرە نـەژادی و ڕەگـەز و زمان و نەریت و دووریی وڵاتەکان و لاەکانیدایـە؟ ئـاخۆ داگیرکـەر و پیلانـی بێگانـە و فێڵ و دوژمنایەتییەکانی، هۆکارێکی تـری ئـەو پەرتـەوازەیی و رقلێبـوونو ململانـێ و دوژمنکارییەی نێوان وڵاتانی جیهانی ئیسلامی و گەلەکانیەتی؟

**داگیرکەر لاوازکار و نەخۆشییە:**

ئێمــە –ئەگەرچـی دەزانـین داگیرکــەر بــە سیاســەت و پــلانو فێــڵ و دوژمنایەتییەکەیەوە، لـەرابوردوو و ئێستاشـدا لـەو هۆکارانەیـە کـە بەشـدار بـووەو و بەشدارە لەو حاڵەتەی بێئومێدی کە جیهانی ئیسلامی پێی گەیشتووە– لەهەمانکاتـدا باوەڕمان وەهایە کە داگیرکەر و سەرکەوتنی سیاسەتە ستەمکارییە دوژمنکارییەکانی، نیشانەی نەخۆشین، خاکێکی نەخۆش لەبار بووە بۆ ئەوەی نەخۆشی مەترسیدارترو قوڵتر لەجەرگەی قەوارەی ئوممەتدا دروست بکاتو توانای بەرگری نەهێڵێت، ملکەچی سیاسـەتەکانی داگیرکـەر بێـتو توانـای نـەبێت لەسیاسـەتەکانی داگیرکـەرو توانـای پەرتـەوازەکردنی ئوممـەت و دروسـتکردنی دوژمنایـەتی و هەڵایسـانی شـەڕی نێـوان دەوڵەتان و گـەلانی موسـوڵمانان دەربـازی ببێـت، مەگـەر ئەوکاتـەی کەبەسـەر ئـەو هۆکارانەدا بتوانین زاڵ ببین کەلەنێو ئوممەتدا هەیە و بوونەتـە هـۆی لاوازیـی توانـای

بەرگری و کردوویەتییە جێیەکی لەبار بۆ جێبەجێکرانی سیاسەتەکانی داگیرکەر و پیلانەکانی تێیدا.

بۆ ئەوەی دەرك بەوە بکەین کەئەو هۆکارانە رووکەشو لاوەکین، پێویستە گشتگیرتر و قووڵتر لەدیاردەکانی نەخۆشی نێو کیانەکەمانو دەروونمان تێبگەین. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە باشترە چەند نموونەیەکی مرۆیی بهێنینەوە کە هاوشێوەی خەسڵەتەکانی ئوممەتەکەمانو ئەو نسکۆیانە بێت کەبەهۆی سەپاندنی سەرکوتکاری و داگیرکارییەوە بەسەریدا هاتووە، تا ببینین ئەو نەتەوانە چۆن ڕووبەڕووی وەستاونەتەوە، هەتا شوێنەوارەکان بەراورد بەوەی بەسەر ئێمەدا هاتووە بزانین، ئایا ئەو هۆکارانە لەخۆیاندا بەسن بۆ لێکدانەوەی دیاردە نەخۆشەکانمانو شوێنەواری لەکیانماندا. سێ نموونە هەڵدەبژێرین کە حاڵی ئەوانو حاڵی ئوممەتی ئیسلامی چەندین رووی هاوشێوەیان هەیە، ئەوانیش: چین و هیند و ئەورووپایە.

### بەراوردکاری بابەتی یەکبوونی ئیسلامی: چین و هیندو ئەورووپا:

#### چین:

لە چینەوە دەستپێدەکەین، چونکە لە زۆر سیفەتدا لەڕووی چەندێتی و چۆنێتی و فراوانی و هەمەجۆریی و مێژووییشەوە وەك لێکچووی جیهانی ئیسلامیی وایە.

چین جیهانێکە -وەك جیهانی ئیسلامی- زیاتر لەیەك لەسەر پێنجی دانیشتوانی سەر زەوی لەخۆ دەگرێت، جیهانێکی فراوان و فرەلایە: لە وڵاتی بەفر و شەختەوە لەمەنشوریاوە تا دەگاتە جیهانی بیابان و دارستانی چڕ تاوەکو کەنارەکانی وڵاتانی هێڵی کەمەری زەوی (ئیستیوا). چەندین گەل و هۆزی گەورەی ژمارە زۆر و فرە نەژادو رەچەڵەك جیاوازی لەخۆ گرتووە، بگرە زمانەکانیشیان هەمەجۆرەو یەك زمانی قسەکردنی هاوبەشیان نییە، پەیوەندی قسەکردنی نێوان گەلەکانی لەڕێگەی ناسینەوەی هاوبەشی وێنەی هەزاران وشەی قورسی ئاڵۆزەوەیە، چونکە زمانی چینی زمانێکی وێنەیە، وەك زمانی هێرۆگلیفیی فیرعەونیی کۆنی لەنێوچوو. بەمجۆرە کاتێ

دوو کەسی چینی بەیەك دەگەن، لەگەڵ ئەوەی هەردووکیان چینین بەڵام بەهۆی جیاوازیی زمانی قسەکردنیانەوە سەختە بە زارەکی لەیەکتر تێبگەن، بەهۆی زمانی وێنە کێشراوی نووسراوەوە هەموو خوێندەوارانی چین دەتوانن لەزمانی یەکتر تێبگەنو ئامرازی پەیوەندی هاوبەشی نێوانیانە.

چین خاوەن مێژووییەکی دوورودرێژە، ئیمپراتۆر و دەرەبەگەکان حوکمی ئەو گەلانەیان کردووە و زۆر شەڕ و ململانێ لەنێوانیاندا ڕوویداوە، گەلەکانیان تووشی زۆر چەرمەسەری و ستەملێکران هاتوون، هەروەها داگیرکەر چنگی لە وڵاتەکەیان گیرکردووە و خستونیەتە ژێر فەرمانڕەوایو ستەمو چاوچنۆکی خۆیەوە، وەك ئەوەی بەهۆی حوکمڕانی سوڵتان و میر و دەرەبەگ و داگیرکارانەوە بەسەر جیهانی ئیسلامییدا هاتووە.

چین بەهۆی ڕۆشنبیریی گەلەکانی و دەروون و هەستی بەکۆمەڵیان وەك یەك کۆمەڵگا و دەوڵەت و قەوارە ماوەتەوە. ئەو ناکۆکییەی ئێستا لەنێوان چین و دوورگەی تایواندا هەیە لەحەقیقەتدا ئامانجی جیابوونەوە و پەرتکردنی چین نییە، بەڵکو ململانێی نێوان کۆمەڵ و بەرژەوەندییەکانە لەژێر پەردەی شەرعییەتدا، ئەوەی وادەکات ئەو ململانێیە بەردەوام بێت و دوورگەی تایوان لە یەکبوونی دەوڵەت و خاکی نیشتمانیی چینیی دایك دەربچێت و ئاگرەکە خۆشتر بکات، تەنیا بەرژەوەندییەکانی بێگانە و زاڵیی مووشەك و کەشتییەکانیانە.

**هیندستان:**

نموونەی دووەم دەوڵەتی هیندستانە، هیندستانیش ژمارەی دانیشتووانی زۆرەو نزیکەی یەك لەسەر پێنجی خەڵکی جیهانەو یەك ملیار کەسی تێپەڕاندووە، نیمچە کیشوەری هیند لە چیای بەفرینی هیمالایاوە درێژ دەبێتەوە تاوەکو نزیك بەهێڵی کەمەرەیی. زۆر گەلی هەمەجۆر و ڕەنگو نەژادو بنەچە و زمان و بیروباوەڕ جیاوازی لەخۆگرتووە، هیندستانیش –وەك چین و جیهانی ئیسلامی– بەستەمی ئیمپراتۆر و

میره دەرەبەگەکانو داگیرکەردا تێپەڕبووە، بگرە هەندێ لەوەی کەبەسەر ئەو وڵاتەدا هاتووە، سەختترو تاڵتر بووە.

خاکی دەوڵەتی پاکستانی موسوڵمانیش پێشتر بەشێك بووە لە جیهانی هیند، ئەوەی هیند بەدەست کێشەی نەژادو زمان و ئایین و کۆمەلایەتی و ئابوورییەوە دەناڵێنێت چەند هێندەی ئەوەیە کەپاکستان بەدەستیەوە گیرۆدەیە، ئەگەر هیند لەدوای جیابوونەوەی پاکستان بەیەکگرتوویی مایەوە، بەلام جەژنی نەتەوەیی بەنگلادیشی موسوڵمان ڕۆژی جیابوونەوەیەتی لەدەوڵەتی پاکستان، کە لەبنەڕەتدا بەناوی ئیسلامەوە دامەزرا، ئەو ململانێیەی لە هەرێمەکانی پاکستاندا ڕوودەدەن هەڕەشەن بۆ ئایندەی یەکێتی ئەو وڵاتە موسوڵمانە.

ئەوەی لێرەدا شیاوی ئاماژە پێکردن بێت، ئەوەیە هەندێ شیکەرەوەی سیاسی، جەنگەکانی نێوان هیند و پاکستان بۆ ئەوە دەگێڕنەوە کە هیندۆسەکانو ڕۆشنبیری و دەروون و هەستی بەکۆمەڵیان بنەمای جیابوونەوەی هیچ بەشە خاکێکی نیمچە دوورگەی هیند لە دەوڵەتی جیهانی گەورەی هیند رەتدەکاتەوە.

### ئەوروپا:

نموونەی سێیەم، کیشوەری ئەوروپاو یەکێتییە ئابووری و سەربازی و سیاسییە سەرکەوتووەکەیانە. هەموومان مێژووی ئەوروپاو ئەو ململانێ داگیرکاریو نەتەوەییە گەورانە دەزانین بەدرێژایی چەندین سەدە لەنێوان دەوڵەت و گەلانی ئەوروپادا روویدا، هەروەها چۆن ململانێکانیان ئاگری جەنگە جیهانییەکانی هەڵگیرساند و چەندین ملیۆن مرۆڤ تێیاندا لەناوچوو.

ئەم کیشوەرە، بەمێژووی ململانێکانیەوە و بە فرە ڕۆشنبیری و ڕەگەزو نەژاد و زمان و گەلەکانیەوەو، بەو گۆڕانکارییە گەردوونییانەی بۆی ئاراستەکراوە، بەرژەوەندییەکانی لە دۆخی ململانێو رووبەڕووبوونەوەوە گۆڕدرا بۆ یەکبوون و کۆبونەوەو دەستباربۆیەکگرتن و هاوکاری لە بونیادنان و گەشەپێدان، تابتوانن

هاوبەشی گروپـە ئـابووریی و سیاسـییە جیهانییـە گـەورەکان بکـەن لـە دابەشـکردنی دەسـتکەوتو بـازاڕو داهاتەکانـدا. بـەکرداریش لـە پێنـاوی بـەدیهێنانی بەرژەوەندییەکانیدا، توانی ئەوروپایەکی یەکگرتوو بونیاد بنێت, بە هـەموو دەزگـاو دامـەزراوەو گروپەکانیـەوەو دراوە یەکگرتووەکەیـەوە کـە (یۆرۆ)یـە, بەمەبەسـتی دابەشکردنی دەستکەوتەکان لەگەڵ دۆلاردا، بەوپێیـەی دراوێکـی جیهانییـە و کۆگـای پاشـەکەوتە جیهانییەکانـە، تـاوەکو بەهۆیـەوە دەسـت بگـرن بەسـەر سـەروەتی بەتالأنبراوی ولأتانی گەلانی هەژار و بچووکدا، لە پێشەوەی هەموویان ولأتانی جیهانی ئیسلامی، بۆ ئەوەی گرەنتی دراوە ئابوورییە گەورەکانی بکات، کـە نرخەکـەی تـەنیا نرخی ئەو کاغەزەیە کەلەسەری چاپ دەکرێت.

باشە گەلانی ئەوروپا کە لەدوێنێدا دوژمنی یەك بوون، چۆن توانییان لـەپێناو ئـەو بەرژەوەندییانـەدا یـەك بگـرن و برینـەکانیان سـاڕێژ بکـەن؟ چـۆن توانییـان کەبەبەرژەوەندییەکانییان دوژمنایەتیو تۆڵەسەندنەوەی نێوانیان بسڕنەوە؟! ناتونین هیچ لێکدانەوەیەك بۆ ئەم دیاردەیە بدۆزینەوە تەنیا لەڕێگەی ڕۆڵی هەست و دەروون و ڕۆشنبیری دەستەجەمعی ئەو گەلانەوە نەبێت، کـە سـەرباری هـەموو ئـەو شـتانەی ڕوویدا، لەپێناوی بەرژەوەندییە گشتیەکانیاندا توانی یەکیان بخات.

بە یەکگرتنی ئەوروپا، ئـەو کەوانـە ترسـناکە پێکهـات کـە لـە چـەند یەکێتییـەکی جیهـانیی گـەورەدا پێکهـاتووە و دەوری جیهـانی ئیسـلامی و ئـەفریقیای لاواز و پەرتـەوازەیان داوە، ئـەویش یەکێتییـەکانی چـین و هینـد و ڕووسـیا و ئـەوروپا و ئەمریکایـە، جیهـانی ئیسـلامی و ئـەفریقیاش لەبەرانبەریانـدا، بـەڵکو ئـەمریکای باشـووریش، بوونەتـە ناوچـەی دەسـەڵات و ململانـێ و نێچـیرێك کەکـەمتیارەکان کەوتوونەتە سەری. ئـەم بارودۆخـە جێـی نیگەرانییـەی ئـەمڕۆی جیهـانی ئیسـلامی و ئەفریقیا –لەکاتێکدا وەك کارەساتێکی مرۆیی وایـە بـۆ ڕۆڵـەکانی– بووەتـە ناوچـەی کێبرکێ و ململانێی نێوان هێزە جیهانییەکان، بۆ مرۆڤایەتی گرنگە ئەو بۆشاییەی پڕ بکاتەوەو یەکێتی جیهانیی ئیسلامیو ئەفریقی دروست بکات و ببێتە هاوبەشـی هێـزە

جیهانییەکان، بەوەش جیهان لەمەترسیەکانی شەڕێکی وێرانکەر دووردەکەوێتەوە کەلەتوانادا نییە شوێنەوارەکانیو شوێنەواری چەکە کاولکەرەکانی لەسەر ئاییندەی مرۆڤ و شارستانییەتی مرۆڤایەتی مەزەندە بکرێت. لەو نموونانەی کە پێشتر هێنامانەوە دەردەکەوێت کەئەو هۆکارەکانەی پەرتەوازەیی جیهانی ئیسلامی و دابەشبوون و ململانێکانمان و توانای دوژمن بۆ بوون بەسەرماندا بۆی دەگێڕینەوە، بەتەنیا بۆ شیکردنەوەی ئەم حاڵەی ئێمەی تێدایە بەس نین. ئەگەرچی ئەو هۆکارانە لای جگە لەئێمەش بوونی هەیە، بەڵام ئەوان نەگەیشتوونەتە ئەو ناکۆکی و پەرتەوازەی و لاوازییەی ئێمە پێی گەیشتووین.

لەوانەیە یەکێك لە جیاوازییە سەرسوڕهێنەرەکان ئەوەبێت کە زۆربەی ئەو ڕێکەوتنە ئابووری و سیاسیانەی ئەوروپای یەکخست، لە ولاّتانی عەرەبیشدا هاوشێوەی ئەو ڕێکەوتنانە ئەنجام دراوە، وەك ڕێکەوتننامەکانی بازاڕی هاوبەش و کەمکردنەوەی باجی گومرك و هاندانی بازرگانی و ئاڵوگۆڕی بازرگانیی لەنێوان ولاّتانی عەرەب و ڕێکەوتننامەکانی بەرگریی هاوبەش، کەچی لەسەر ئەرزی واقیع هیچ کام لەو ڕێکەوتننامانە نەهاتوونەتە دی، بەربەستی نێوان ولاّتانی عەرەب و گەلانیان وەك خۆی ماوەتەوە، دیوارەکانی بەرزو بەرزتر دەبێتەوە، ململانێکانیش زۆرتر و ئاڵۆزتر دەبن، وای لێهاتووە لەسەر هەر کارێك ڕێکبکەون هەرگیز ڕووناکیی بەخۆیەوە نابینێت، یان لەواقیعی پەیوەندییەکانی لایەنە عەرەبییەکاندا جێبەجێ نابێت!!!

## ئایین و عەقڵ و بەرژەوەندی هەموویان فەرمانی یەکبوون و دەستبار بۆیەکگرتنمان پێدەکەن:

ئەگەر ئایین فەرمانی بەپەرتەوازەیی و ململانێمان پێ نەکات، بەڵکو هانمان بدات بۆ یەکبوون و برایەتی، عەقڵ و بەرژەوەندیش فەرمانی ئەو پەرتەوازەییەمان پێ نەکەن و هانمان بدەن بۆ یەکبوون و دەستبار بۆیەکگرتن و یەکتر سەرخستن، ئیدی بۆ لەنێو خۆماندا پێچەوانەی ئەوەی ئایین و عەقڵ و بەرژەوەندی داوان لێدەکەن کار دەکەین؟

پەرتەوازەیی و ململانیٚ لەو نەخۆشییە کۆمەڵایەتییانەن کەپەیوەستن بە بەلایەنی دەستەجەمعی کەسێتی مرۆڤەوە، ئەو لایەنەیە کە پێویستە لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی بۆ بکرێت و ئەو هۆکارانە بدۆزرێتەوەکە بووەتە هۆکاری شێواندنی لایەنی دەستەجەمعیی لەکەسێتی مرۆڤی موسوڵماندا.

هەموومان دەزانین کە یەکدەستی و کۆمەڵبوون و هاریکاریو یارمەتیدان لە گرنگترین پێکهێنەرەکانی لایەنی کاری بەکۆمەڵو گشتی کەسێتی مرۆڤن، ساغی پێکهێنانی لایەنە جیاوازەکانی کەسێتی مرۆڤیش – تاکی و کۆمەڵیان وەك یەك– کارێکی پێویستن بۆ سەقامگیریو هاوسەنگیی کەسێتی مرۆڤ، پاشان سەقامگیری و هاوسەنگی کۆمەڵگا. مرۆڤ لە بنچینەی سروشتە مرۆییەکەیدا تاکێکە هەڵسوکەوتەکانی پەیوەستن بەئیرادەو هەڵگرتنی بەرپرسیارێتییەکانی بوونیوهەستان بەئەنجامدانی ئەرکەکانی ئەو بوونە، لەرووی گیانی و ماددییەوە، ئەم کارەش لەڕووی ماددی و مەعنەوییەوە نایەتەدی، تەنیا لەرێی لایەنی دەستەجەمعی لە پێکهێنانی مرۆڤدا دێتەدی، بەهەمان شێوە پێکهێنانی کۆمەڵگاش کە کارێکی زۆر پێویستە بۆ بوونی مرۆڤ و بەردەوامبوونە ماددییەکەی، هەر لەخێزانەوە، بە دایك و باوکەوە، تا کۆمەڵگا، کە ئامرازی تاك و بواری ژیان و مانەوەیەتی.

لەڕێگەی کۆمەڵگا و پەیوەندییەکانی و ڕۆڵی مرۆیی تیایدا، بەهۆیەوە، بوونی ماددی و پایەبەرزیی رووحی و بەرزی بەهاکان بۆ ئەندامەکانی کۆمەڵگا دێتەدی. چونکە هیچ مرۆڤێك نییە و ناتوانێت گەورە ببێت یان بەتەنهایی بمێنێتەوە، بەگوێرەی سروشت و پێویستییەکانی خۆی بەو جۆرەیەهەروەها بەهۆی ماوەی درێژی منداڵییەوە، کەواتە دەبێت کۆمەڵگایەك هەبێت بیپارێزێت و چاودێریی گەورەبوونی بکات، ئەمەش لەڕێگەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیەوە گوزارشت لەویستی خۆی دەکات، لەبوارەکەی خۆیدا شاراوەکانی ناخی خۆی لەهەست و بەها و ئامانجەکان بەدیبهێنیٚ و، بەو کارلێککردنەش ماددەی دەروونی پاك بکاتەوە و، بە چۆنیەتی کارلێك و پاڵنەرەکانی لەکۆمەڵگادا، مانای بوونی خۆی بەدی بێنێت.

**ناتەواوی دەستەجەمعیی لە ڕۆشنبیری ئوممەتدا:**

**کەسێك شتێکی نەبێت ناشتوانێت بیبەخشێت:**

هەر ناتەواوییەك لەچاودێری لایەنی دەستەجەمعیی لەپێکهیاتەی کەسێتیی تاکدا، دەبێت لەڕووی ڕۆحی و ماددییەوە شوێنەواری خراپی دوورمەودای لەسەر ڕۆڵی تاك و جۆری ژیانو بوونی هەبێت، بەمەش سروشتی لایەنی دەستەجەمعیی لەکەسێتی تاکدا بە باش و خراپ وەك سروشتی کۆمەڵگاو جۆری پەیوەندییەکانی و دامەزراوەییەکانی دەبێتو کاریگەری لەسەر رادەی هاوسەنگی و سەقامگیری و توانای بەجێگەیاندنی ئەرکەکانی خۆی لە چاودێری ژیانی مرۆیی رۆڵەکانی ئوممەتو پێشکەوتنیان دەبێت.

گەر ناتەواوییەکمان لە بەجێگەیاندنی کارە بەکۆمەڵەکانی تاکەکانی کۆمەڵگادا بینی و کەمتەرخەمییان لە چاودێریکردنی پەیوەندییەکان و دامەزراوەکانی کۆمەڵگاو بەشداری ئەرێنی بونیادنەرانەیان لەپێداویستی و داواکارییەکانیدا بەدی کرد، لەسەرمان پێویست دەبێت لە هزری ئەو کۆمەڵگایە و ڕۆشنبیری و پرۆگرامەکانی پەروەردەی بڕوانین و وردببینەوە.

چونکە منداڵ تێگەیشتن و پەیوەندییەکانی و ئەرکەکانی وەك تاك و بەکۆمەڵ لە دوو سەرچاوەوە وەردەگرێت: سەرچاوەی یەکەم خۆڕسکییە و لە هەستکردنی بەپێداویستیەکانی و دەرکی خۆڕسکی عەقڵییەوە دەبێت.

دووەمیش: لە هەمەکی چەمکەکانی ڕۆشنبیری کۆمەڵگاکەیەوە سەرچاوە دەگرێت. بەگوێرەی رادەی سەلامەتی ئەو هەمەکی و ڕۆشنبیری و هاوسەنگی و بەدەمەوەچوونی لەگەڵ جووڵانەوەی واقیعی کۆمەڵگا و پێداویستی و توانا و گۆڕانکاری و پێشهاتەکانی، هاوسەنگیی خود بە تاکی و دەستەجەمعی و, سەلامەتی رۆڵەکەی و، رادەی توانای سەرکەوتنی لە ڕووبەڕووبوونەوەی هەر شتێك بێتەڕێی و، پاشان رادەی توانای لەدەوڵەمەندکردنی خۆی و کۆمەڵگاکەشی لەڕووی ڕۆحی و ماددییەوە.

لایەنی دەروونیی ویژدانی ڕۆحی لە قۆناغی منداڵییدا، بەگوێرەی ڕۆڵی بنەڕەتی لە بونیادنانی کەسێتیی مرۆڤدا، کارێکی گشتگیرتر و گرنگترە لەلایەنی مەعریفی تێیدا، بگرە لایەنی مەعریفیی لە قۆناغی منداڵییدا ئامرازێکە لە ئامرازەکانی بونیادنانی لایەنی دەروونی و ویژدانی، بۆیە دەبێت لە ڕشتەبەندی ڕۆشنبیری پەروەردەیی هەر نەتەوەیەکدا گرنگی مەزن بەم لایەنە بدرێت، جەختیش لەوە بکرێتەوەکە لایەنە ڕۆشنبیرییە مەعریفییەکانی کە پێشکەشی منداڵ دەکرێت بە پلەی یەکەم ئامرازی بونیادنانی دەروونی و ویژدانی و ڕۆحی و داڕێژەری جۆری عەقڵییەتی ئەو نەوجەوانەیە، لەپاڵ ئەو ڕۆڵە مەعریفییەی کە لە بونیادنانی تواناکانی منداڵدا لەگەڵ لایەنی ویژدانییدا یەکتر تەواو دەکەن.

**لایەنی دەستەجەمعیی لە فیکری ئیسلامیدا:**

گەر بە وردی بڕوانینە مێژووی فیکری ئوممەت، بەتایبەت لایەنی دەستەجەمعیی تایبەت بەپێکهێنانی کەسێتیی موسوڵمان، ئەوا لەبارەی هاوسەنگی قەوارەی و سەلامەتی بەجێگەیاندنی ئەرکی مرۆیی شارستانییەوە، گونجانێکی سەیری ڕاستەوانەیی و پێچەوانەیی، لەنێوان ئەرێبوون و نەرێبوونی کۆمەڵگادا دەبینین.

گیانی دەستەجەمعی لە سەردەمی هاتنی وەحیدا لە باشترین حاڵەت و بەرزترین ئاستیدا بوو، هەستی تاکەکانی کۆمەڵگا بەئینتیما و بەرپرسیارێتی و هاریکاری بەو سیفەتەی ئەندامی یەك جەستەی ئوممەتن، لە لوتکەدا بوو: ﴿وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِنْ قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ [الحشر: ٩]، واتە: ئەوانەی کە پێشتر ماڵ و شوێنی خۆیان ئامادەکرد بۆ پێشوازیی لە کۆچەران و دڵ و دەروونی خۆیان ڕازاندەوە بە ئیمان، ئەوانەشیان خۆشدەوێت کە کۆچیان کردووە بۆ لایان و لە دڵ و دەروونیاندا جێی هیچ جۆرە حەسوودی و بەخیلییەك نابێتەوە (لەسەر ئەوەی کە بەشی کۆچبەران دراوە و بەشی ئەوان

نـەدراوە) حـەز بـە بەخشـینی دەسـتكەوتەكان بـەوان دەكـەن، فـەزڵی ئـەوان دەدەن بەسەر خۆیاندا هەرچەندە هەژار و نەداریشـن، جـا ئـەوەی خـۆی لـە نەفسـی ڕەزیلـی بپارێزێت و زاڵ بێت بەسەریدا، ئا ئەوانە هەر سەرفرازن.

ئەم گیانە دەستەجەمعییە بەهێزو كاراییە لـەخۆڕا دروسـت نـەبوو بـوو، بـەڵكو لـە بنچینەی پێگەیشتنی هۆزایەتی ئازاد و سـادەی عەرەبـەوە سەرچـاوەی گرتبـوو، كـە سیستمەكانی ستەمكاریو سەركوتكردن نەكۆتو بەندی كردبوو نەتێكی نەشكاندبوو، گیـانی ئیمـانی یەكتاپەرسـتانەی جێنشـینبوونی ئیسـلامی و سیسـتمەكەی كەلەسـەر دادپەروەری و هاوریكاری دامەزراوە گیـانی دەسـتەجەمی بـەهێزتر و قـووڵترو كـاراتر كرد.

ئەوە پێغەمبەری خوایە (درودی خوای لێبێت) سـەركردەی حكومـەتی كۆمـەڵگای ئیسلامییە، بناغەكانی سیسـتمێكی دادپەروەرانـە دەچەسـپێنێت، كەتێیـدا چـاودێری تاكەكانی كۆمەڵگا دەكات، شكۆی مرۆییان دەپارێزێت و مافی موسوڵمانان و غـەیرە موسوڵمانان دەپارێزێت، وەك چاودێریو هاندانی هاریكاری نێوان تاكـەكانی كۆمـەڵگا دەوڵەت یاسـایەكی دانـا گرەنتـی دانـەوەی قـەرزەكان بكـات، ئەگـەر قـەرزدار مـرد و جێماوەكـەی ئەوەنـدە نـەبوو قـەرزی خـاوەن قـەرزی لـێ بدرێتـەوە، ئـەوە دەوڵـەت قەرزەكەی بۆ دەداتەوە: ((هەركەسێ مرد و سەروەت و سامانێكی بەجێهێشـت ئـەوە بـۆ میراتبـەرەكانی دەبێـت، هەركەسـێ مـرد و قـەرزی لەسـەر بـوو ئـەوە دانـەوەی قەرزەكەی لەئەستۆی مندایە)).

لەبەر ئەوە موسوڵمانان لەپێناو ئوممەتـدا قوربـانی و هـەوڵ و كۆششـیاندا، بۆیـە شتێكی سەیر نییە لە ساتی تەنگانە و ناڕەحەتییدا (ساعة العسرة) پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لێبێـت) داوای لـە موسـوڵمانەكان كـرد ببەخشـن، ئـەوانیش مـاڵو سامانێكی زۆریان بەخشی، بێگومان ئەوەی لەپێشەوەی بەخشـەران بـوو ئەبوبـەكری

سدیق بوو (خوا لێی ڕازیی بێت) پیاوی ژیر و خاوەن بۆچوونی دروست و بەپێز و تێگەیشتنی بەهێز و بەجێ[1].

هەروەك چۆن موسوڵمانەکان سەروەتیان بەخشی، ئەبو بەکریش(خوا لێی ڕازیی بێت) سەروەت و ماڵی بەخشی، بەڵام نەك ئەوەی لێی زیاد بوو بێت، یان زۆرێك لەماڵەکەی، بەڵکو هەموو ماڵەکەی بۆ کاتی پێویست و ناڕەحەتی بەخشی، بۆ ماڵ و منداڵی خۆی هیچ شتێکی نەهێشتەوە!! باشە پیاوێکی داناو تێگەیشتووی وەکو ئەبوبەکر بۆ ئەمە دەکات؟ وەك ئەوەی ئەحمەد گێڕاویەتییەوە، پێغەمبەری خوا

---

[1] - شتێکی سوود و لەجێی خۆیدایە لەگەڵ خوێنەردا شتێك لەبارەی کەسێتی و حیکمەتی ئەبوبەکرەوە باس بکەین، تاوەکو بەڵگەی کاری ئەو لە تێگەیشتنی ڕۆحی کۆمەڵگای سەردەمی پێغەمبەرێتیی بزانین، ئەبوبەکر بەهۆی بۆچوونی دروست و ئەوپەڕی بەرچاوڕوونییەوە بوو کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) کردیە هاوڕێی گەشتی پڕ لە مەترسی و جەربەزەیی، لە گەشتی پێویست بەعەقڵ و ڕێوشوێنگرتن و پلان، کەسێکی جەنگاوەری نەکردە هاوڕێی گەشتەکەی، ئەبوبەکر ئەو پیاوە بوو کە بە بیری پوختی خۆی گەشتی شەوڕەویی پێغەمبەری خوای بەڕاستخستەوە، ئەو پیاوە بوو کە بەپێی گێڕانەوەی ئەبو داوود و ئەحمەد لە کۆچی دوایی پێغەمبەری خوادا (درودی خوای لێبێت) لەو کۆستە بێوێنە و ساتە خەماوی و سەختەدا بەدڵێکی ئازایانە و باوەڕێکی ڕوونەوە وەستایەوە، تاوەکو ئوممەت ژیر و وریا بکاتەوە، لەکاتێکدا پێغەمبەری خوای لەهەموو کەسێکی تر بەلایەوە خۆشەویستر بوو وتی: "هەرکەسێ خوای پەرستبێت، ئەوا خوا زیندووە و نامرێت، هەرکەسێکیش موحەممەدی پەرستبێت، ئەوا موحەممەد کۆچی دوایی کردووە!"، ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِنْ مَاتَ أَوْ قُتِلَ انْقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَنْ يَنْقَلِبْ عَلَى عَقِبَيْهِ فَلَنْ يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ﴾ [آل عمران: ١٤٤]، تەنانەت عومەر و ئەو موسوڵمانانەی بەو ڕووداوە واقیان وڕمابوو وەك ئەوەی ئیبن ماجە دەیگێڕێتەوە: عومەر وتی: "وەك ئەوە بوو ئەو ڕۆژە ئەو ئایەتەم بەر گوێ کەوتبێت".

ئەو پیاوە بوو کە بەسەرکەوتن و بەرچاوڕوونییەوە کەشتیی دەوڵەتی ساوای ئیسلامی لەدوای کۆچی پێغەمبەری خوا(درودی خوای لێبێت)بەلێزانی و بۆچوونی بەجێوە بەڕێوە برد، لەکاتێکدا کەوتبووە نێو شۆڕش و هەڵگەڕانەوەی سیاسیی عەرەبە دەشتەکییەکانەوەو لەو دەوڵەتە هەڵگەڕابوونەوە، بەپێداگرییەوە بڕیاری دا ئەو ئەعرابانە ملکەچ پێ بکات و بیانگێڕێتەوە ڕێساکانی گردبوونەوەی مرۆیی شارستانی و سەرکوتکردنی هێزە دژە شارستانییەتەکان.

(درودی خوای لێبێـت) لێـی دەپرسـێت: ((بـۆ منداڵـەکانت چـیت بەجێهێشـتووە؟))، ئەبوبەکر بەدوو وشە وەڵام دەداتەوە، کەبەزیرەکیو لێهاتوویی خۆی بەو دوو وشـەیە سروشتی سیستەمی کۆمەڵایەتی و ڕەهەندە دەستەجەمعییەکەی و شێوازی گەیاندنی پوخت کردەوە، کە گوتی: "خوا و پێغەمبەرەکەیم بۆ بەجێهێشتوون".

ئەو کەسەی پەی بەگرنگی ڕەهەندی دەستەجەمعیی نابـات، وەهـا گومـان دەبـات ئەو وەڵامەی ئەبوبەکر (خوا لێی ڕازیی بێـت) گوزارشـتە لەتـەنیا ئیمـانی قـووڵی ئـەو بەخوای گەورە، ئەمەش گومانی تێدا نییە کەئیمانەکەی بەو جۆرەیە و نموونـەی ئـەو وەك نموونەی هاوەڵە پایەبەرزەکانە، بەڵام دەربڕی ئـەو سیسـتەمە کۆمەڵایەتییەشـە کە ئەبو بەکری بۆ دەگەڕێتەوە، کـە کۆمەڵگایـەکی یـەکگرتووی دەسـتبار بۆیـەکگرو هاریکار بووە و هەژار و لاواز تیایدا نەفەوتاوە و پێویسـتییەك نـەبووە بـۆ چـرووکی و کۆکردنەوە و لە گەنجینەدانان، تاك هی هەمووان بووە و هەموانیش هی تـاك بـوون، بە  برایانە و کۆشش و لەئەستۆگرتن و هاودەستیی ژیاون.

ئا لێـرەدا هەنـدێ جیـاوازیی گـرنگ دەردەکـەوێت لـەنێوان کۆمـەڵگای سـەردەمی پێغەمبەرایەتی و تێگەیشتن و چەمك و کارکردنی لەگەڵ چـەمکەکانی سـەردەمی ئـەو ستەم و دابڕانەی کە لە سیسـتمی کۆمـەڵگادا ڕەهەنـدی دەسـتەجەمعی لاوازکـردووە، دەرهاوێشتەی ئەوەش بۆ بێئاگایی دەستەبژێری فیکریی دەگەڕێتەوە لە تێگەیشـتنی ئەو ڕەهەندەو ئـە و واتـا و نیشـانانەی لـە دەق و واتاکانـدا بوونیـان هەیـە و بـەوەوە پەیوەستن، چونکە "ئەوەی دەبینێـت وەك ئـەو کەسـە نییـە کـە دەبیسـتێت"، هـیچ شتێك لە ئەزموون ڕوونتر و بەڵگەدارتر نییە.

کۆمەڵگای سـتەمکار و زۆردار و سـەرکوتکەر کـە کۆمـەڵگای دادپـەروەر و شـکۆ و لەئەستۆگری نەبینیووە و هاوسەردەمی نەبووە، پەی بە واتا و نیشانەی نێو دەقەکان نابات، "هەر دەفرێك ئەو شتەی لێ دەڕژێت کە لەنێویدایە".

بۆیە بیرمەندانی دابڕانو داڕێـژەرانی ئـەو بـیرە، لەوەڵامدانـەوەی ئەبوبـەکر وەهـا تێگەیشتوون کە دەربڕینی ئیمان و پشتبەسـتنی بـووە بـەخوای گـەورە، پـەی بـەوە

نابەن کە بڕیارەکەی بڕیارێکی هەڕەمەکییانە نییە، تەنیا هەڵچوون و تەقینەوەیەکی سۆزدارانە نییە و پەشیمانی و داخی بەدواوە بێت، بەڵکو بڕیارێکی وشیارانەی ساغ و پلان بۆدارێژراو بووە، ئەمەش تەنها بۆ باوەڕو متمانەی رەهای بەخوای گەورە دەگەڕێتەوە، هەروەها بۆ باوەڕو متمانەی بە حکومەتی ئیسلامی و سیستەمی لەدەستەبەری و چاودێرییکردنی خاوەن پێداویستییەکان دەگەڕێتەوە: "خوا و پێغەمبەری خوام بۆ بەجێهێشتوون".

بەبێ تێگەیشتنی ئەو سیستمە و سروشتەکەی، ناتوانیت لەم گفتوگۆ کورت و پڕ واتایەی نێوان پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) و ئەبوبەکر تێبگەیت، تەنیا ئەوانە لێی تێدەگەن کە کۆمەڵناسان و کەسانی خاوەن ئەزموونن، بۆ کەسێك ئاسانە تێیبگات کە لەو سیستمەدا ژیابێت و پەی بەسروشتی بەجێگەیاندنی بردبێت.

بەڵام کاتێك ڕەهەندی دەستەجەمعیی تێکچوو، ئیدی بووە قۆرغکاری سەروەت و سامان و خێر و بێرەکانو دروستکردنی دەستوپێوەند و خواردنی مافەکانو ستەم له بێبەش و هەژار و خاوەن پێویستییەکان،بەجۆرێك تاکەکانی خەڵك باوەڕ و متمانەیان بەکۆمەڵگا و سیستمی کۆمەڵایەتی نەما و هەموو کەسێك خۆی گرەنتیی ژیانی خۆی و منداڵەکانی کرد، ئیتر هەموو کەسێك تەنیا گرنگی بەخۆی دەداو نە پشتی بەکۆمەڵگا دەبەستێت و نەکۆمەڵگاش پشت بەو دەبەستێت، بۆیە سەیر نییە تاکەکانی ئەمڕۆی کۆمەڵگاکەمان بەمەبەست و ئەنقەست لە بەجێگەیاندنی مافی گشتی ڕادەکەن و خۆدەدزنەوە و لەکاتی هەبوونیشدا رژدی دەنوێنن لەبەدەمەوەچوونی پێویستی گشتیدا، لەپێش چاویان دامەزراوەکان وێران دەکرێن و شتە گرنگەکان لەنێو دەبرێن حەقیان بەسەریەوە نییە، وەك ئەوەی پەیوەندی بەوانەوە نەبێت، ئاخۆ چەندە جێی داخ و ئازارە کاتێك بەراورد دەکرێن لەگەڵ ڕۆڵەی ئەو گەلانەی گرنگی دەدەن بە پەروەردەکردنی هەستی دەستەجەمعی و هەستی هەوڵ و بەخششیان تیایدا بەهێز دەکرێت.

**شوێنەوارە مەترسیدارەکانی لاوازی**

**ڕەهەندی دەستەجەمعی لە ڕۆشنبیری و پەروەردەدا:**

کە لە کەسێتی مرۆڤی موسوڵماندا ڕەهەندی دەستەجەمعی لاواز بوو، ئیتر سەیر نابێت دامەزراوە گشتییەکانی ئوممەت وێران ببن و لەبەر یەك هەڵبووەشێنەوە و بەجێگەیاندنی مافە گشتییەکان و باجدان سەخت بێت، دەستەکان لەبەخشین و گیانەکان لە خەبات و قوربانیداندا چرووك بن، لەو کاتەی کە تاك هەوڵ دەدات هەموو ئەوەی لەتوانایدایە لە پێویستی و تەواوکاری بۆ خۆی و منداڵەکانیدا دابین بکات، هیچ گوێ بەپێویستی ئوممەت و هەژار و پەککەوتەکانی ئوممەت و ماڵ و منداڵەکانیان نادات، چونکە دەزانێت تەنیا خۆی دەتوانێت گرەنتیی خۆی و خێزانەکەی بکات گەر پێویستی و ناڕەحەتییەك تووشیان بێت، جگە لە خۆی هیچ کەسێکی تر پێداویستییەکەی بۆ چارە ناکات و زمانی حاڵی دەبێتە ئەوەی کە دەوترێت: "هەر کەسێ سۆز و بەزەیی بۆ دەرنەبڕدرێت، ئەویش بەزەیی نابێت".

جێی سەرسامبوون نییە هەموو ئەوەی پەروەردەی ڕەهەندی دەستەجەمعی لە بونیادنانی کەسێتیی زۆربەی ڕۆڵەکانی گەلانی ئیسلامی سەردەمانی هەرەسدا پێیگەیشتووە، دیاردەی سواڵکردن بڵاو بووبێتەوە، چونکە گەر کۆمەڵگا و سیستەمەکەی کەسانی خاوەن پێویستی و بێبەشیان هێندەی شکۆی مرۆڤی پارێزگاریی لێ بکردبایە لەئەستۆ بگرتایە، ئەوا سەرشۆڕی سواڵکردن و دەربەدەربوونی ئەو منداڵانە نەدەما، کە بوونەتە خاکێکی بەپیت بۆ تاوان و کرداری قێزەون.

بێگومان بڵاوبوونەوەی ئەو دیاردانە و بێدەنگ بوون لە بەرانبەریاندا بووەتە دیارترین بەڵگەیەکی بەرچاو و ئازاردەری ویژدان و شایەتی لاوازیی ڕەهەندی دەستەجەمعی ئوممەت، شایەتی ناساغی بەجێگەیاندنی سیستەمی کۆمەڵایەتیو لەخۆگرتنی لێکەوتەکانیشیەتی.

بۆیە شتێکی سەیرو نامۆ نییە لەگەڵ لاوازیی ڕەهەندی دەستەجەمعیی لە بونیادنانی کەسێتی موسوڵماندا، فەسادی کۆمەلاٌیەتی و دەرهاوێشتەکانی بلاٌوبێتەوە، لەڕووی هەژاری و نەزانی و نالەباربوونی خزمەتگوزارییەکان و هەڵهاتن لە بەجێگەیاندنی ماف و ئەرکە گشتییەکان و تەماشاکردنی سەروەتی گشتیی بەوەی حەلاٌڵە بۆ کەسێك بتوانێت دەستیبخات.

لەپاڵ ئەم نەخۆشییە کۆمەلاٌیەتییانەدا، نەخۆشیی دواکەوتن هەیە لە بەرانبەر پارێزگاریکردنی بەرژەوەندییەکانی ئوممەت و بەرگریکردن لە قەوارەی و دڵسۆزانە کارکردن بۆی، بەڵکو ئەم نەخۆشییە پەلدەکێشێت بۆ خیانەتکردن لە ئەمانەت و ئەتککردنی پیرۆزییەکانی و لەتوپەتکردنی و ململانێکردن بۆ تالاٌنکردنی خێر و بێری.

بە ڕووخانی خیلافەی ڕاشیدی و زاڵبوونی گیانی سەردەمی جاهیلی هۆزگەرایی بەسەر گۆڕەپانی سیاسی، بە گیانە ڕەگەزپەرست و حەزە ئاژەڵییەکانی بۆ زاڵبوون، دوور لە بنەماکانی ماف و داد و چاکسازی، تاوەکو خۆی لە ڕەگەزپەرستی و نەژادپەرستی و خۆویستی و خۆبەزلزانی و بەحەلاٌڵزانی مافەکاندا ببینێتەوە، بەخێراییەکی ناچوونیەك هێزی پاڵنەری ڕۆحیی ئیسلامی پاشەکشەی کرد و ململانێ و ناکۆکییەکان بلاٌوبوونەوە، خوێنڕێژرا و ڕۆحی ئیسلامی و ڕەهەندی دەستەجەمعی لاوازبوو، یەکدەستیی ئوممەت پەرت بوو بۆ کۆمەڵە ڕەگەز و هۆز و گەل و پادشانشین و میرنشینێك، لەگەڵیدا دەستپاکەکانی سەردەمی پەیامداریی شکستیان هێناو خۆیان بەدوور گرت لە سیاسەتی ئوممەت و ئەوەی تووشی بووە لە گەندەڵی و خراپە و توندوتیژی و خوێنڕێژی، لە مزگەوت و قوتابخانە و گۆشەکاندا یەکلابوونەوە بۆ وانەوتنەوە و زیکر.

زیانی ئوممەت لەدۆڕانی ئەو گەڕەی ململانێی نێوان دەستپاکەکانی سەردەمی پەیامداری و خوێندکارانی قوتابخانەی مەدینە کەزانایان بوون لەبەرانبەر هۆزگەری و دەمارگیرییدا نەوەستا، بەداخەوە بەڵکو پەلیهاوێشت بۆ کۆڵەواربوونی بەرگری و بێ

توانا بوون لەدووبارە دروستکردنەوەی بونیادی پـڕۆژەی چاکسـازیی لـەژێر ڕۆشـنایی سیاسەتەکانی سەردەمی پەیامداریدا.

بەداخـەوە شکسـتهێنانی هەوڵـەکانی پیـاوانی قوتابخانـەی مەدینـە و میراتبـەرانی سـەردەمی پەیامـداریی بەدرێـژایی سـەدەیەك دوای دەسـەڵاتی ڕاشـیدی، بـەدابڕان و گۆشەگیری کۆتایی هات، ئەمەش لە خۆڕادەستکردن بە دەستەوسانیو بێتواناییـەوە زیاتر نزیك بوو، جگە لەهەندێ هـەڵاوێردی سـنووردار, ئـەو خۆبەدەسـتەوەدانە بـووە هۆی رەگ داکوتانی نەرێنیی کۆمەڵایەتی لە فیکر و ویژدانی ئوممەت و فەرامۆشکردنی ڕەهەندی دەستەجەمعییش لە پێگەیاندنی ڕۆڵەکانی و وێرانکردنی بنـەما و ڕێسـاکان، بۆ ئەوەی دامەزراوەکانی دەسەڵات و سیاسەت لەویـژدانی ئوممەتـدا جێگـەی گومـان بێت و لای کۆی ئوممەت دەسەڵات و سیاسەت هیچ ڕەوایەتییەکی نەبێت.

پیاوانی قوتابخانەی مەدینە کە بە دانایی و بۆچـوون دروسـتیی لەپێشـترین کـەس بـوون، لــەجیاتی ئــەوەی لــەپێناو چاکســازیی و گۆڕانکارییــدا هەڵــەی شــێوازی توندوتیژیی ڕوون بکەنەوە و بەدوای سەلامەتترین شێوازی چاك و بەسوودا بگەڕێن، ئــەوەش لەڕێگــەی ناســینی سروشــتی ناتــەواوی و شــێوازە کاراکــانی دووبــارە بونیادنانــەوەی کەســێتیی ئیســلامی و ڕاســتکردنەوەی ڕێــڕەوی ئاڕاســتەکانی و بەهێزکردنی هۆکارەکانی لایەنی دەستەجەمعیی چاکەخواز تیایدا، کەچـی بـەجۆرەها شێواز گۆشەگیرییان بەردەوام بوو بێ ئەوەی زانا و بیریاران پەی بـە ڕۆڵـی منـداڵێتی ببـەن لـە دووبـارە داڕێژانـەوەی کەسـێتی و عەقڵییـەتی ئوممـەت و دامەزراندنـەوەی بونیادە دەروونییەکەی بەشێوەیەکی ساغ و سروشتی، بەڵکو بابەتی پەروەردەکردنی منداڵ لەچەند لایەنێکی فێرکاری زارەکییانـەی مەعریفـەی ئایینیـدا قـەتیس کـرا کـە سروشتێکی سادەی کەسیی سنوورداری هەبوو.

بەشـێوەیەکی نەرێنییانـە هەوڵـەکان لـەپێناو ململانـێ و ڕەتکردنـەوەی یـەکتردا بەردەوام بوون، هەر لایەك بەردەوام بوو بۆ قایمکردنی شوێنی خۆی و فەراهەمکردنی ئامڕازەکان و ئامادەکردنی لایەنگر و دۆستەکانی، تاوەکو بەپێی توانا پارێزگاری لـەو

پێگانە بکەن کەبەردەوام بووەو لەگەڵیدا تواناکانی ئوممەتیش لەهەرەس و وێرانبوون بەرداوام بوو.

دەسەلاَت و سیاسەت و کاروبارە گشتییەکان و سەروەت و داراییەکان بووە دەرەبەگایەتی، بۆ دەستەبژێرێکی سیاسیی هۆزگەری دەمارگیری شعوبیی سەربازیی بوو، بەلاَم کاروبارە تایبەتەکانی تاك و هەڵسوکەوتەکانی نێوان تاکەکان، ئەوانە لەسنووری دەسەلاَتی دەستەبژێرێکی فیکریی ئایینیدا بوو.

دارودەستە و سەرباز و سەروەت بووە داردەستی دەستەبژێرە سیاسییە فەرمانڕواکان، ئینجا مزگەوت و گۆشەکانی پەرستن و ئەڵقەکانی ئامۆژگاری و فەتوایش بووە ئامڕازی دەستەبژێری فیکریی ئایینیی، تێکڕای خەڵکیش لەململانێی ئەوانەدا بوونە نێچیری ستەم و نەزانی و هەژاری، وەهای لێهات کۆمەڵگای موسوڵمان بووە شوێنی بەپیتی جادووبازی و ئەفسانە و خۆڕادەستکردن بە نەهێشتنی وشیاری و دەروێشایەتیش بەشێوازی تەسەوفی حلولیی بەنجکرا.

**پێویستیی دووبارە بونیادنانەوەی ڕەهەندی دەستەجەمعیی لەڕۆشنبیری و پەروەردەدا:**

کارەسات لەوەدا بوو کە ئەم دۆخە نەخوازراو و نەخۆشییە لەسەر دەستی هەڵبژاردەی فیکریی بە ناوشیارییەوە ڕیشکە دابکوتێت، بۆیە ڕوانینی گشتیی ئیسلامیی بەجۆرێك داڕێژرایەوە لەڕووی ڕۆشنبیری و پەروەردە و فێرکردنەوە ڕەهەندی دەستەجەمعیی لەبیر بکرێت، گۆشەگیری و دابڕانیش ببێتە تایبەتمەندییەکی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئەوپەڕی ئامانجیشی پەرستن بێت لە چەمکە فیقهییەکەیدا، مرۆڤی موسوڵمانیش دوای ئەوەی لە ڕەهەندە ڕۆحییەکەی خاڵیی دەکاتەوە، بەرانبەر بە ژیان نەرێنیی بڕوانێت، مامەڵەکانیش (معاملات) تەنیا بووە بابەتگەلێکی ڕێککاریی یاسایی بۆ مامەڵەی کڕین و فرۆشتن، نەك بواری هەوڵدان و ئاوەدانی و ئەمەکداربوون لە بەرانبەر بەرپرسیارێتییەکانی جێنشینبوون لەزەویدا.

کتێبەکانی فیقهی ئیسلامیی بووە ئەڵقەی بەیەکگەیەنەری ڕۆشنبیریی فیکریی تایبەت و ڕۆشنبیریی تێکڕای خەڵك، واتا لەحەقیقەتدا بووە ڕێبەری پێکهێنانی عەقڵییەتی مرۆڤی موسوڵمان و بناغەی بونیادە دەروونییەکەی.

ئەم پێگە بەرزییەی کتێبەکانی فیقه لە ڕۆشنبیریی موسوڵمان لە سەردەمانی دواتردا، وەهامان لێ دەکات دەرکی مەودای ئەو زیانە سەخت و دەردە هەمیشەییە بکەین کە تووشی پێکهێنانی عەقڵییەت و دەروونی موسوڵمان هاتووە، کاتێك کتێبەکانی فیقه ڕەهەندی دەستەجەمعیی گشتیی لە پلانی ئاراستەکردندا پشتگوێخست و پەرستنەکانی لە کاروبارەکانی یادی خوا و دروشمەکاندا کورتکردووەتەوە، کە ڕەهەندی ڕۆحیین لە ژیانی مرۆڤدا و ژیان و بابەتی جێنشینبوونی تەنیا لە موعامەلاتدا داناوە.

بۆ ئەوەی کتێبەکانی فیقه و ڕۆشنبیری و پەروەردەی ئیسلامیی چاك بکرێت و ببێتە ڕێبەری تێگەیشتن و ڕۆشنبیری و فیقه و پەروەردەیەکی گشتیی دروست، ببێتە ڕێسایەکی وشیاریی شارستانیی سەرتاپا و ئیجابی، فیکر و ڕۆشنبیری و فیقهێکی شارستانییانە بەرهەم بهێنێت کە گرنگیی بداتە پێکهێنانی عەقڵ و دەروون و کەسێتیی تاك و کۆمەڵی موسوڵمانان و هەر لەسەرەتاو قۆناغی ساواییدا گرنگیی بە پەروەردەکردنی بدات، بێ ئەوە هیچ بوار و ئومێدێك لە کەسێتییەکی ئیسلامییدا نابینیتەوە کە خاوەن هێز و هاودەستیی و دەستپێشخەریی و داهێنان بێت و بتوانێت ئوممەتی ڕێنیشاندەر بخاتە پێشەوەی ڕیزی نەتەوە پێشکەوتووەکان لە پێشکەوتن و سەرکردایەتی و پێشەوایەتیکردندا[1].

---

[1] - گەر بگەڕێینەوە بۆ ئەو کتێبانەی زاناکان لە باسەکانی دەسەلآت و سیاسەتدا نووسیویانە، دەبینین هەمووی تیۆرییانەیە، یان پەیوەستە بە ڕێکخستنە ئیدارییەکانەوە و تایبەتمەندن بە ڕۆحی ئامۆژگاریی بۆ فەرمانڕەوایان و زۆرجار ئەو کتێبانە کراونەتە دیاریی بۆ فەرمانڕەوا، کتێب و نووسراوگەلێك نەبوونە ئاراستەی ئوممەت کرابن، لەکاتێکدا ئەوان سەرچاوەن، کتێبەکان ئاراستەی ئەوان نەکراون لە بابەت ڕاوێژ و باسی ماف و ئەرکی ئوممەت و ڕۆڵەکانی نییە، باسی بەرژەوەندییە سیاسییەکانیان ناکات، لەوانە ئەو کتێبەی (الأحكام السلطانية)ی ئیمامی ماوەردییە کە دادوەری دادوەرانی عەباسییەکان بووە، ملکەچیی

## سێیەم: گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی و وتاری پەروەردەیی

گەر ملکەچی ئەوە بووین کە ئوممەت لە ساتی ئێستادا دواکەوتوو و ماندوو پەرتەوازە بووە، لەکاتێکدا لە سەرچاوەی مرۆیی و بنەما و بەهای ئەخلاقیی ڕۆحییشدا دەوڵەمەندە، گەر بەوە گەیشتین ئەم دواکەوتنەی ئوممەت بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە فیکری تووشی بێتوانایی بووە، بەهۆی سەردەمانی گۆشەگیری و ململانێی نێوان دەستەبژێری سیاسی و فیکریی و ئەو شێواندنەی تووشی تێڕوانینی گەردوونییانەی ئوممەت بووە بەو هۆیەوە، ئەوەشی بەم هۆیەوە لە میتۆد و زانستەکان و مەعریفە مرۆییەکانی بەهۆی تاك لایەنی و ڕووکەشیی و جەقبەستن و بەشەکییانەوە تووشی هاتووە، ئەوەشمان بینی کە بەدرێژایی چەندین سەدە چۆن هەوڵەکانی چاکسازی و هەستانەوە شکستی هێنا لەبەدیهێنانی ئامانجە باڵاکانی لەپێناوی نوێکردنەوەی وزەکانی ئوممەت و ڕاستکردنەوەی ڕەوتی، پرسیاری گرنگ لێرەدا ئەوە دەبێت: چۆن ڕزگارمان ببێت؟ چۆن دەتوانین وزەی نوێ بکەینەوە و ڕێگەکە چاك بکەین و گۆڕانکاریی بهێنینە ئارا؟ ئەو شێوازە چاکسازییە گرنگە کامەیە کە بەشێوەیەکی کارایانە پرۆژەی چاکسازیی ئیسلامیی لەنێو ئەو شێواز و ئامرازانەی تاقیی کردووەتەوە تاوەکو ئێستا پەنای بۆ نەبردووە؟

دەبێت لەسەرەتاوە دەستپێبکەین، ئەویش ماهییەتی کێشە و ماهییەتی کاری پێویست و ماهییەتی ئەو پێشهاتەیە کە ئوممەت ڕووبەڕووی دەبێتەوە.

---

بووە بۆ واقیعی دەسەڵاتی میرە تورکەکان، کە میری سەربازەکان بوون و دەسەڵاتیان داگیرکردبوو بۆ پاراستنی وێنە و شێوەی خیلافەت و یاسای شەریعەت، بە قیاس لەسەر گرێبەستی هاوسەرگیریی بەیعەت بەشایەتیی دوو کەس قبوڵ دەکرا!

بۆ سوودی زیاتر بگەڕێرەوە بۆ کتێبی (العنف وإدارة الصراع السياسي في الفكر الإسلامي بين المبدأ والخيار: رؤية إسلامية)ی دانەر، کە گرنگیی پابەندبوونی شورا ڕوونەدەکاتەوە لە بەڕێوەبردنی سیاسییانەی کۆمەڵگادا، هەروەها گرنگیی پابەندبوون و کارکردن بە ئامرازە مەدەنی و ئاشتەواییەکان لە ڕاستکردنەوەی ڕێڕەوی سیاسیی لەکۆمەڵگادا، چونکە منداڵدانی کۆمەڵایەتیی لە پەرتەوازەیی دەپارێزێت و بزووتنەوەکانی چاکسازییش پێدەگەیەنێت و ڕێنمایی دەکات و لەکۆتاییشدا سەقامگیریی سیاسیی بۆ کۆمەڵگا بەدیدەهێنێت.

ئەگەر كرۆكی كێشەكە بریتی بێت لە توانای گۆڕانكاری و نەرێبوون و نەبوونی دەستپێشخەری و داهێنان و پەنابردنەبەر سەركزی و لاوازیی وزەی دەروونی و ئازایەتیی ئەدەبی و لاوازیی شكۆی مرۆیی و ئامادەنەبوونی عەقڵی زانستیی داهێنكاری و گیانی كار و دەستپێشخەری، ئەگەر كێشە و ئیشكالییەت لەكۆتاییدا ئامادەنەبوونی مرۆڤی شكۆ و ئازا و هەوڵدەر و سەرخەر و توانای گەیاندنی زانست و مەعریفەبێت، ئەوا وەڵامەكەی بەوە دەبێت پێویستە گۆڕانكاری لە سروشتی بونیادی دەروونی و ویژدانیی ئەو مرۆڤەدا بكرێت، دەبێت كاربكرێت بۆ پێكهێنانی عەقڵیەتێكی زانستی داهێنكاریی ئەرێنیی بونیادنەری موسوڵمان، بە هەموو ئەو بنەما و بەها و تێگەیشتن و تێڕوانینە یەكتاپەرستییە جێنشینییە باڵایانەی لەو عەقڵییەتەدا پێویستییەتی. بەمجۆرە گۆڕانكاری ڕاستەقینە ئەستەم دەبێت و هەوڵی چاكسازیی ویستراویش لە هێنانەدیی ئامانجەكانیدا شكست دەهێنێت، چونكە گوتاری پێگەیشتووان بناغەكانی بونیادی دەروونیی خۆیان ناگۆڕێت، لەبەر ئەوەی ئێمەش, گوتارەكەمان تەنها رووە لەپێگەیشتووانە، گۆڕانكاریی پەروەردەیی پێویستیش لە دەروونی تازەپیێگەیشتواندا ئەنجام نادەین.

**چۆن لە گوتاری پەروەردەیی ئیسلامیی تێبگەین:**

بەپێی شوێن و كەسی دوێندراو و دۆخ و ڕەهەند و ئامانج، گوتاری سەردەمی پەیامداریی هەمەجۆر بووە، لە هەموو ئەو جۆرانەدا گوتارێكی كارای كاریگەربووە، لە گرنگترین ئەو هۆكارانەش كە دواتر گوتاری ئیسلامیی لاواز كرد، لاوازیی ئەزموونیئەوانە بوون كە بوونە دەمڕاستی ئەو وتارە و پەیبردنیان لاواز بوو بە ڕەهەند و دۆخی دوێندراوان و پێویستییەكانیان، ئەوەش وەهای كرد لە تێگەیشتنی ئەو گوتارەو تێگەیشتنی حەقیقەتەكەی و واتا و مەبەستەكانی هەڵە تێبگەن، ئەمەش وایكرد ئەو رەهەندانە لە گوتارەكانیاندا تێكەڵ بكەن و بیشێوێنن و كاریگەریشی لاواز بكەن، بیگۆڕن بۆ گوتارێكی تیۆری، زۆرجاریش شوێنەوارەكانی بەو جۆرە نەدەبوو كەدەویسترا.

**لاوازیی توێژینەوە مرۆییەکان بووە هۆی تێکەڵکردنی ڕەهەند و بوارەکان:**

لاوازیی توێژینەوە مرۆییەکان لە سەردەمانی دواییني ئوممەتدا بووە هۆی لاوازیی فیکری ئیسلامی و تێکەڵکردنی ڕەهەند و بوارە جیاوازەکان.

لە زۆر بابەت و باسدا شوێنەوارەکانی تێکەڵکردنی ڕەهەند و بوار و دۆخەکانم هەست پێکردووە، کۆتا شتیان ئەوە بوو کە لە لێکۆڵینەوەی بابەتی توندوتیژی و بەڕێوەبردنی ململانێی سیاسیی لە تێڕوانینی ئیسلامییدا خستوومەتەڕوو، ئەو کتێبەش لەلایەن پەیمانگای جیهانیی بۆ فیکری ئیسلامیی چاپکراوە.

لەو کتێبەدا روونم کردووەتەوە کەلەگرنگترین ئەو هۆکارانەی بوونەتە ئاستەنگ لەبەردەم ڕەوتی چاکسازی و ڕاستکردنەوەی ئیسلامیی کێشەی تێکەڵکردنی نێوان ڕەهەندی بەڕێوەبەردنی ململانێی سیاسیی لە ناوخۆی کۆمەڵگایە لەگەڵ ئەو ململانێی سیاسییەی کەلەنێوان کۆمەڵگاکان روودەدات، بە واتایەکی تر، تێکەڵکردنی نێوان چەمکە سیاسییە نێوخۆیی و سیاسیە دەرەکییەکانە، موسوڵمانان لەم تێکەڵکردنەدا وەك کەسێکن شمشێر لە شوێنی خۆیدا دانەنێت و کارەکان بە ئامانجی خۆیان ئەنجام نەدات.

پێشتریش ئەم کێشە میتۆدییەم لە فیکری ئیسلامییدا لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە لە قاهیرە چاپ بووە ڕوونکردووەتەوە لەبارەی "تیۆری ئابووریی ئیسلام" و تێیدا باسی بابەتی ئابووریی ئیسلامی و بنەما بنەڕەتییەکانی و ئەو سیاسەتانەم کردووە کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) بۆ چەسپاندنی ئەو بنەمایانە لە دۆخی سەردەمی خۆی و توانای کات و ناسینی کاریگەری و مەبەستەکانی ئەو سیاسەتانە جێبەجێی کردووە، ئێمەش چۆن بتوانین وێنەی سیاسەتگەلێك بکێشین گونجاو بێت بە سەردەمی خۆمان و تواناکانی ئەم سەردەمەمان.

لەو توێژینەوەیەمدا گرنگترین هۆکارەکانی هەڵەتێگەیشتنم روونکردووەتەوە کە لە تێگەیشتنی مەبەستەکانی ئابووریی ئیسلامییدا دروست بووە، هۆکارەکانی لادانی جێبەجێکردنەکانی دواتریشی، کەئەویش تێکەڵکردنە لەنێوان بنەماکانی ئابووریی

نێوخـۆیی و پێودانگـەکانی لەگـەڵ بنـەما و پێودانگـەکانی ئـابووریی دەرەکـی، بۆیـە شتێکی سەیر نەبووە بیرێکی ئیسلامیی ڕۆشنگەری و ڕووناکی نموونەی ئیبن حـەزمی ئەندەلوسیی فەتوا بدات، بەوەی ئەو فەرموودەی باسی ئەوە دەکات پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت)، زەویی بە جولەکەی خەیبەر داوە بیکێڵن بەرامبەر بـە نیـوەی بەرهەم، ئەم فەرموودەیە هەموو ئەو فەرموودانەی نەسخ کردووەتەوە کە (مزارعـە)ی لە مەدینە بەحەرام داناوەو، پێغەمبەری خوا(درودی خـوای لێبێـت) بـە ڕیبـا (سـوو) وەسفی کردووە، ئەوەی بووەتە هۆی ئەوەی بەنەسخی بزانێت، ئەو دوایین کارەیە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) لەبابەت بەکرێدانی کشتوکاڵی(مزارعە) لەگەڵ جولەکە لە خەیبەر کردی، بەبێ ئەوەی ئیبن حەزم لـەوە بـەئاگا بێـت کـە ئـەوە تێکـەڵکردنی ڕەهەندی نێوخۆیی و ڕەهەندی دەرەکییە لە ئابووریدا.

بێگومان ئەو بنەماو پێودانگانەی لە ئابووریی دەرەکییـدا دەگیردرێنەبـەر، هـەمان بنەماو پێودانگی کارپێکراو نییە لە ئابووریی نێوخۆییدا، بۆیە تێکەڵکردنی میتۆدییانە لەنێوان ئەو دوو شتەدا دەبێتە هۆکاری هەڵەی ڕوانین و تێکەڵکردنی بیر[1].

ئەگەر لای خوێنـەران، بەتایبـەت ئەوانـەی خـاوەن ئـەزموون و شـارەزایی نـین لـە بەڕێوەچـوونی کاروبـاری کۆمـەڵگا و دەوڵـەتان و نەخشـەدانانی ئـابووری و بەڕێوەبردنیان، دەبێت سـەخت بێـت ئـەم جیاوازییـە وردانـە ئاگـاداربن و لایـان ڕوون نەبێت، ئەوا بیری فەلسەفی تیۆریی لەسەردەمی ئیبن حەزمدا و سروشتی مەعریفـە و تاکلایەنییەکەی وایانکردووە کەئەم عەقڵە پێگەیشتووە وا بزانێت یەك مامەڵـە لەتـەك غەیرە موسوڵمان, لەکیان و کۆمەڵگەیەکی جیاواز و دوژمنی کۆمـەڵگای موسـڵمانان، ڕۆڵەکانی داوا بکـەن کـە زەوی موسـوڵمانان بـەکار بهێـنن کـە دواتـر بەجێیـدەهێڵن،

[1]– أبو سليمان، العنـف وإدارة الصـراع السياسـي في الفكـر السياسـي الإسـلامي بـين المبـدأ والخيـار: رؤيـة إسلامية، مرجع سابق، هەروەها بڕوانە:

– أبو سليمان، عبد الحميد أحمد. نظرية الإسلام الإقتصادية: الفلسفة والوسائل المعاصرة، القـاهرة، مكتبـة الخانجي، ١٩٦٠م.

قورسه وا لێکدانەوەی بۆ بکرێت کەئەمە هۆکارە بۆ هەڵوەشاندنەوەی سیاسەتێکی جێگیری چەندان ساڵەی نێو کۆمەڵگای موسوڵمانان لە مەدینەدا، تاکە یەك کاری دۆخێکی جیاواز بێت و شتێکی حەرام حەلاڵ بکات و لەناکاوێکدا بەبێ هیچ پێشەکییەك سوو بکاتە حەلاڵ و شتێکی باش.

**فرە گوتاری بەپێی فرەیی دوێندراوەکان:**

ئەگەر بەوردییەوە بڕوانین، دەبینین کە گوتاری وەحی ئیسلامیی بەپێی هەمەجۆر و فرەیی دوێندراوان و، هەمەجۆریی ڕەهەندەکانی بوون و، هەمەجۆریی پێداویستییەکان، ئەویش هەمەجۆر بووە، بۆیە گوتاری گشتی و گوتاری گەردوونیی ئەزەلیی هەیە، هەروەها گوتاری کات و شوێنی جووڵەیی و گوتاری عەقڵی بیرکردنەوەیی، هەروەها گوتاری دەروونیی ویژدانیی ئامۆژگاریکار بۆ باوەڕداری هەیە، بەهەمان شێوە گوتاری هەڕەشە ئامێز بۆ خۆبەزلزانی سەرسەختی نکوڵیکار، هەروەها گوتاری بانگەوازی ڕێنیشاندەری ئاراستەکاری موژدەبەخش بۆ باوەڕداری کۆششکار، گوتاری پەروەردەیی مامۆستایانەی بەسۆز بۆ ئاراستەکردنی منداڵ و تازە پێگەیشتووان هەیە لەگەڵ گوتاری کاتی هەبوونی و گوتاری پێویست و کاتی پێویستی، گوتاری سیاسەت و فەرمانڕەوایی، گوتاری دواندنی خەڵکانی سادە و گوتاری دواندنی سەرکردە داناکان، گوتاریش هەیە بۆ دواندنی تێکڕای مرۆڤایەتی، گوتاریش هەیە گوتاری پێغەمبەرایەتییە.

هەموو گوتار و دوواندنێك سروشت و مەبەستی خۆی هەیە کە پێویستە لەپێش چاو بگیرێت، بۆ تێگەیشتنی ڕووداوەکانی دۆخەکە و کاریگەری و لێکدانەوەکانی خۆی، بۆیە تەماشاکردنی فرەیی دوواندن بەهۆی فرەیی کەسانی دوێندراوەوە بەوەی بابەتی ڕاست و درۆ، یان ناسیخ و مەنسوخە، تەنیا بەڵگەیەکە لەسەر سادەیی و لاوازیی فیکر.

لەبەر ئەوە ترسناكترین شتێك كە فیكر تێیدەكەوێت، سادەكردنەوەی گوتارە لە هێنانەدیی فیكر و بونیادنانی كۆمەڵگادا.

پێشتر باسمان لە یەك گوتار و دوواندن كرد، كە تێیدا ڕەهەندەكانی گوتار و دوواندنەكانی تێدا تێكەڵ بووبێت، بەو هۆیەوە وزەی بونیادنان و كاریگەریی بەفیڕۆدەچێت، چونكە ئەو گوتارە تۆقاندنە دەروونییە ئایینییەی تێدا هەیە كە لە سەردەمی دابڕان و گۆشەگیرییدا فیكری ئیسلامیی ڕەنگرێژكردبوو لەپاڵ ئەو تۆقاندنە ماددییە سیاسییەی كە سیاسەتی دەسەڵاتی ڕەنگڕێژ كردبوو, هەروەها بەهۆی دابڕانی نێوان فیكر و سیاسەت و نائامادەیی مومارەسەكردنی فیكر لەلایەك و نائامادەیی فیكری مومارەسەش لەلایەكی ترەوە بۆ ئەوە هۆكار بوون.

لە كەشی گۆشەگیری و دابڕاندا دەبوو فیكری ئیسلامیی بكەوێتە تێكەڵكردن لەنێوان گوتاری كاتی و شوێنی سەردەمی هاتنی وەحی، لەگەڵ گوتاری ئەزەلیی ئایینیی خواییەوە، واتا گۆڕاو و نەگۆڕ تێكەڵ بكات، هەر دەبوو – بەهۆی دەستەوەستانیی فیكرییەوە– گوتاری رێگری و هەڕەشە تێكەڵ بە وتاری ڕێنمایی و ڕێنیشاندان بكردبایە، دوواندنی بێباوەڕان تێكەڵ بە دوواندنی باوەڕداران بكردبایە، دەبوو گوتاری پێغەمبەریی و بانگەواز تێكەڵ بە گوتاری دەسەڵات و سیاسەت بكردبایە، تێكەڵكردنی گوتار و دوواندنی سەركردە و فەرمانڕەوایان بە دوواندنی خەڵكانی سەرەتایی و سادە، گوتاری هەبوونی بە وتاری پێویستی، گوتار و دوواندنی منداڵ تێكەڵ بە دوواندنی بەرپرسیارێتیی كەسی پێگەیشتوو بكرایە.

ئەو تێكەڵكردنە ئامرازێكی پێویستە كە دەستەوەستانیی فیكری و لاوازیی ڕوانینی زانستی و هەندەكییەتی لە میتۆدی دەقی زمانەوانیی هێنایە كایەوە، كە پەیوەندیی بە توێژینەوەی زانستی كۆمەڵایەتیی گشتگیری گەردوونییەوە لاواز بوو هەتا دەستەبژێری فیكریی پێگەی خۆیان بپارێزن، سەرەڕای بێدەسەڵاتییان، بۆ ئەوەی ڕۆڵی خۆیان ئەنجام بدەن كەبەلای كەمەوە بتوانن كۆمەڵگا لە هەرەسی تەواو و ئاژاوەی سەرتاپا بپارێزن.

**شوێنەوارە وێرانکارەکانی خراپ بەکارخستنی پیرۆزیی گوتار: باری دەروونیی کۆیلەکان:**

بەهۆی تێکەڵکردن لە دوواندنەکان و بەکارخستنی پیرۆزیی لە خزمەتیدا، توانرا گوتار و دوواندنی تۆقاندنی فیکریی زاڵ بێت، بۆ سەپاندنی چاودێرییەکی فیکری و بێدەنگکردنی زمانەکانو سەپاندنی چەقبەستن و، ملکەچکردنی دەروونەکان بۆ ئەو جۆرە بیرو ڕۆشنبیری و هەڵبژاردەیەی کە هەڵیگرتووە، بێگومان دەسەڵاتی سیاسیی زۆرداری بێتوانا سوودی لەو جۆرەگوتارو دوواندنەو شوێنەوارە دەروونییە وێرانکارەکانی وەرگرت، تاوەکو تێکڕای خەڵك ملکەچی دەسەڵات و ستەمکارییەکانی ببن، بەجۆرێك کە تێکڕای خەڵك "باری دەروونی کۆیلە"یان بۆ دروست بێت، کە ڕاهاتووە لەسەر ملکەچی بۆ گەورەکەی، وەهایان لێ بکات خۆ بدەنە بەر ستەمی گەورەکەیان و تەلبەندی بەندیخانەکەی بۆ بپارێزن و بە ئامادەنەبوونی جەلادەکانیان خەمبار بن. تەنانەت –دوای نەمانی سەردەمی داگیرکاری، لەنێو ئەو ئاژاوە و پەشێوییەی هەبوو– خەڵکانێکمان دەبینی بۆ ڕابردووی "سەر گەورە" داگیرکەرەکەیان بەداخ بوون، ئەوەشی دەیبینین گەورە زانایانی ئوممەت بەدەهۆڵی درۆی ڕاگەیاندنەکان دێتو بەشداری ناشتنی "سەر گەورە" جەلادەکانیان دەکەن و چاو پڕ بە فرمێسك و ئاخو ئۆف بۆ لەناوچوونیان هەڵدەکێشن.

لەراستیدا گوتاری تۆقاندنی دەروونی و داخستنی عەقڵ و خامۆشکردنی فیکر و نکۆڵیکردنی سەرپشکبوون و سەپاندنی بۆچوون و بەزۆر قەناعەت پێکردن، دەرگا و دەروازەیەکە ڕواڵەتەکەی سۆز و بەزەییە بەهۆی کالای پیرۆزیی و قسەی ڕەوانبێژانەی بێ کەڵك و پڕوپاگەندەی بەرژەوەندیی خەیاڵییانەوە ، بەڵام لە ناوەوە– بەچاوپۆشی لەو نیەتو هۆکارانەی پڕیان کردووە– لەکۆتاییدا کۆتکردنی عەقڵ و نکۆڵیکردنی مەعریفە و بەکۆیلەکردنی ویژدان و جادوویکردنە لە ڕۆح و هێشتنەوەیە لەسەر دواکەوتوویی.

گوتاری تەقلیدیی ئیسلامیی بەئیرهابی دەروونییەوە بۆ وەلانانی هەرەس و نەهێشتنی ئاژاوە و بەمەبەستی حوکمڕانی دەستەبژێری فەرمانڕەوا بۆ جەماوەری

ئوممــــەتو ملکەچـــکردنیان بـــۆ واقیـــع و دەســــەڵاتەکەی، گوتارەکـــە گـــەورە و پێگەیشتووانی بەئامانج وەرگرتووە و منداڵ و هەرزەکارەکانی پشتگوێخستووە و لـە هەموو کاتێکدا بە زمانی هەڕەشە و تۆقاندن قسە دەکات.

لـەگرنگترین ئامرازەکانیشـی تێکـەڵکردنی دووانـدنی بـاوەڕدارە لەگـەڵ دوانـدنی بێباوەڕ، تێکەڵکردنی حوکمی نەگۆڕە بە گۆڕاو، بەگەڕخستنی بـاڵایی پیرۆزیـی دەقـە تاعەقڵی موسوڵمان بنینی واقیع و یاسا گەردوونییەکان تێبپەڕێنێت، تاوەکو دەروون و عەقڵە موسوڵمانەکان شتە دژ و ناتەواوییەکان قبوڵ بکەن و خۆیان ڕادەستی هـەر شتێك بکەن کە "زیـان و سـوودی بۆیـان نییـە" لـە ئەفسـانە و شـتی پڕوپـووچ، بـەو هۆیەشـەوە —لـەنێو ئەوانـەی لەدەستچـوون— گرنگیـدان بـە دووانـدنی سـۆزدارانەی بەویژدانی پەروەدەیی منداڵ لەلایەن پێغەمبەرەوە لەدەستچوو، تێگەیشتن و پـەیبردن و ئەو مەبەستانەی هەیبوو ئامادەیی نەما، کە پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) پێیـان منداڵی پەروەردە دەکرد و ئیمان و ئازایەتی و گیانی جیهاد و دەستپێشـخەریی تیـادا دەچـاند، کـار بەوەگەیشـتووە گرنگیدانـەکانی ژیاننامـەی پێغەمبەرایـەتی[1] و دەقەکانیشی خەریکـە لـە کاروبـارە تایبەتـەکانی دەروون و یـاد و وەسـفی غەزاکانـدا کورت دەکرێتەوە.

---

[1] - بۆ مەبەستی پێگەیانـدن و فێرکردنـی منـداڵ و تـازە پێگەیشـتووان، پێویسـتە جـارێکی تـر ژیاننامـەی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێـت) بنووسرێتەوە و گرنگیـی بخرێتەسـەر خـودی پەیامەکـە و ئامـانج و میتۆدەکـانی، ئـەوەش لـەژێر تیشـکی واقیـع و توانـا و پێویسـتییەکانی کۆمـەڵگای موسـوڵمانان و ئـەو پێشهاتانەی ڕووبەڕووی دەبێتەوە، تاوەکو نمونەیەکی زیندوو بخەینە بەردەم هـەرزەکار و منـداڵان، مەککـە قۆنـاغی جێگیرکردنـی ڕێسـا و تێگەیشـتن و ئامـادەکردنی سـەرکردایەتییەکان و پـوختکردنی کانزاکانـە، مەدینـەش قۆنـاغی بونیادنـانی کۆمـەڵگا و ئوممـەت و دەزگاکانـە، ڕووداو و چەرمەسـەریگەلێکی تیـادا ڕوویداوە، شەڕ و جەنگەکانی تێدا ڕوویداوە، کـەوابوو ژیاننامـەی پێغەمبەرایـەتیی تـەنیا هێنانـەوەی باسـی کۆمەڵێ ململانێ و شەڕ نییـە، تـاوەکو وەك جـەنگاوەرێك دەربکـەوێت و ڕۆژهەڵاتناسـانیش وا کردوویانەتـە چەکێك بەدەست خۆیانەوە و قسە لەسەر ئەوە بکەن ئیسلام بە زەبری شمشێر بڵاوبووەتەوە، ئـا بـەوجۆرە پەیامەکە بکرێتە بابەتێکی پەراوێز و شەڕەکان بکرێنە بناغە نـەك ئـەوەی ڕووداوگـەلێکی پەراوێزیانـە بـن و بارودۆخ و دەرهاوێشتەکانی مێژوو ئەوانەیان هێنابێتە بوون.

**گوتاری پەروەردەیی و گوتاری یاسایی، سیستمی سزاکان وەك نموونەیەك:**

سیستمی سزادانی ئیسلامیی وەك نموونەیەك وەردەگرین بۆ هاوسەنگی گوتاری ئیسلامی و فرە ڕەهەندییەکەی و ئەرێنیی ئامانجەکانی لەیارمەتیدانی مرۆڤی موسوڵمان لەسەر بەڕێوەچوونی ژیان وەك تاك و وەك کۆمەڵ بە ئەرێنی و ئارامی و دڵنیایی، دەستگرتنی تاوەکو لە سنووری سروشتە مرۆییەی خۆیدا گەشە بکات و ببەخشێت و بەرانبەر بەرپرسیارێتییەکان بەئەمەك بێت و خێر و خۆشی و چاکە و شکۆی مەبەست بێت.

چونکە ئەم گوتارە لە سەردەمانی دواییدا بەتایبەت, زیاتر لەهەر گوتارێکی تر، لای دۆست و دوژمن وەك یەك بووە هۆی زۆر تێکەڵکردن و خراپ تێگەیشتن و لەبیرکردنی واتای دەقەکان، لەسەر بنچینەی تێگەیشتنی سروشتی مرۆیی و مەبەستەکانی شەریعەت لەئاراستەکردنیدا و مامەڵەکردنی بونیادنەرانە لەگەڵیدا بە ئامانجی بەدیهێنانی بەڕێوەچوونی ژیان بەشێوەیەکی چاك و کارا.

ئەو کەسەی لە سروشتی دەروونی مرۆڤ ڕادەمێنێت و لێکۆڵەر لەلایەنە شاراوەییەکانی، هەروەها ئەوانەش کە لە گوتاری سزاکان لە ئیسلامدا ڕادەمێنن، دەرك بەوتای راستەقینەی گوتار ئیسلامیی و هەمەجۆری و ئامانج لەهەموو جۆرەکانی دەکەن، لەنێویاندا گوتاری سزاکان، دەبینێت کە گوتار و دووانـدنی ئیسلامیی گوتاری ئارامی و دڵنیاکردنەوەیە، نەك گوتاری ترساندن و تۆقاندن و یاسا بخاتە بەردەست دەسەڵاتدار بۆ سەرکوتکردنی خەڵك و بڵاوکردنەوەی ترس لەنێویاندا و بەدوایانەوەبێت بۆ دەرخستنی ناتەواوی و هەڵەکانیان و لەدەروونیاندا هەستی کۆیلەیی دروست بکات، بێهودە نییە ئەوەی ئیسلام لەو گوتارەیدا گرنگی پێداوە، ئەمەش بەمەبەستی دابینکردنی دادپەروەری و دڵنیایی دەروونی خەڵکییە، بێگومان رەنگەکانی دیکەی گوتار لەپێشترە.

بۆیە لەخۆڕا نییە ئیسلام مەرجی کردووە دەبێت بۆ تۆمەتی تاوانی داوێنپیسی شایەت هەبێت، ئەگەر نەیتوانی بیسەلمێنێت ئەوا سزای ئەو کەسەی باسی کردووەو

بۆی نەسەلمێنراوە دەدرێت، چونکە سزادان لـەتاوانی داوێنپیسـیدا لەراسـتیدا سـزای ئاشـــکراکردنەکەیەتی زیـــاتر لـــە خـــودی داوێنپیســـییەکە، ئەمـــەش وەك تـــەواوی هاوشـێوەکانی لـە تاوانـەکانی تـری دەروون و شـەهوەتەکانی و سروشـتەکانی، کـە دەروونەکان هـیچ گرنتییـەکی بـەردەوام کۆنترۆڵکردنیـان نییـە، لەکۆتاییـدا کەسـەکە دەگەڕێتەوە بۆ پەروەردە و ویژدان، بەپێچەوانەی تاوانی خوێنرێژی و خواردنی مـاڵی خەڵك کەئەنجامدەر مەبەستی کارەکە و ڕێگرییەکەیەتی، ئا لەمەدا شەریعەت بەدوای تاوانبارانـدا دەچـێت، تـاوەکو خـەڵکیی لـە تـاوان و دەسـتدرێژیی دەسـتدرێژیکاران بپارێزرێن[1].

نەبوونی بیرکردنەوە و رامانی زانستییانەی ڕێکخەر لە یاسا سروشتییەکان و واقیع و ڕووداوەکانــدا بوونــە مایــەی تێکــەڵکردنی گوتارەکــان، هــەروەها بــووە هــۆی پشتگوێخستنی دوواندنی منـداڵێتی و پـەی نـەبردن بـە ڕەهەنـدە پەروەردەییـەکانی، ئەمـــەش واتـــای تێپەڕانـــدنی منـــداڵێتی و تێنەگەیشـــتن لێـــی و لەسروشـــتەکەیو پەرەسەندنی قۆناغەکانی و ناسین و شارەزابوونی ڕۆڵی لە پێگەیاندن و گۆڕانکارییـدا، پاشان تێنەگەیشتنی بەرنامە و گوتاری پێغەمبەر (درودی خوای لێبێـت)، بانگـەوازی بـۆ پێـداگریکردنی لەسـەر مافـەکانی منـداڵ و بەرنامـەی پەروەردەییەکـەی و جـۆری دوواندنەکەی و واتاکانی ئەو دوواندنە.

گوتاری تۆقاندنی دەروونی کەلە فیکری ئوممەتدا بڵاوبووەتەوە، خـەریکبوو جگـە لـە دووانـدنی سـزا و تۆقانـدنی منـداڵ هـیچ شـتێکی تـر لـە عەقڵییـەتی ئوممەتـدا نەهێڵێتـەوە، پاساویشـی بـۆ دەهێنایـەوە، دەیکـردە هانـدەر کـە زیادەڕەوییـەکانی دەستەوەستانی و سـەپاندن و داپڵۆسـین پێـوە پەیوەسـت بکـات، ئەمـەش لـەرێگای دەقێکەوە کەمەبەست لێی –ئەگەر صەحیحیش بێت– مامەڵەکردنە لەگەڵ حاڵەتێکی

---

[1] - بڕوانە: أبو سليمان، عبدالحميد. "الأمن والسلام الإجتماعي هدف نظـام العقوبـات الإسـلامي: تـأملات في نتائج دراسة اجتماعية لسكن الطلاب الجامعيين"، مجلة إسلامية المعرفة، العدد١٤، خريف ١٩٩٨م، ص١٦٧.
– أبو سليمان، عبدالحميد. الإصلاح الإسلامي المعاصر، القاهرة: دار السلام، ١٤٢٧هـ/٢٠٠٦م.

هەڵاوێردی دەگمەن، بۆ نموونە خاوەن منداڵێکی دە ساڵان ناچار دەبێت هەندێ سزای منداڵە دە ساڵانەییەکەی بدات گەر نوێژی نەکرد، ئەگەر هاتوو -سەرەڕای چاودێری خێزانەکەی بەترساندنو تۆقاندن- بەردەوام بوو لەسەر نوێژ نەکردن: ((منداڵی حەوت ساڵانتان فێری نوێژ بکەن، گەر لە دە ساڵییدا ئەنجامیان نەدا لێیان بدەن))[1]، ئەوە نازانن خودی ئەم فەرموودەیە ڕوونی دەکاتەوە کارەکە هەرچی بێت، نابێت ئەشکەنجەی جەستەیی منداڵ بکرێت، تاوەکو باش و خراپ و لایەنەکانی بەرپرسیارێتیی نەفامێت و نەگاتە دە ساڵی، ئەوەش لێدانێکی سووکە وەك زللەیەکی زیان نەگەیەنەر یان نا تۆقێنەر تاوەکو پیشانی بدەیت کارەکە گرنگە و جێی گاڵتە و بەسووك تەماشاکردن نییە، پاش بێئاکامی هەموو هۆکارە پەروەردەییە بەردەستە لەتوانادا بووەکان. کەجێی سەرسوڕمان دەبێت ئەگەر پەروەردەکار بەشێوازی جوان و دروست لەگەڵ مناڵەکەدا رەفتار بکات ناچاربێت پەنا بۆ هیچ جۆرێ لەجۆرەکانی لێدان و سووکایەتیی بەرانبەر منداڵەکە ببات.

لەسایەی زاڵبوونی ئەم دەقە تایبەتەدا -گەر دەقەکەی دروست بێت و بێژەکەی ڕێك و سەلمێندرابێت- لەم حاڵەتە تایبەتەدا، لە کەشی گوتاری تۆقێنەردا، چەمکی سزا بووە چەمکێکی بنەڕەتی گشتی بۆ پەروەردەکردن و ئامڕازێك کەزاڵبووە بەسەر تێگەیشتنی ئوممەت بۆ منداڵێتیو کەمکردنەوەی پایەیو بچوککردنەوەی کاروباریو فەرامۆشکردنی، دەروونی منداڵیش پڕکراوە لە تۆقاندنو سزا، هەتا بووەتە دەروازەیەکی گشتی بۆ تێگەیشتنی نەزۆکانەی مەعریفە، هەروەها بووە هۆی دیارنەمانی حەقیقەتێکی گەورەی حەقیقەتەکانی سەردەمی هاتنەخوارەوەی وەحی، ئەویش ئەوەیە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) باوك و باپیر و پەروەردکارێکی سەرکەوتوو بووە و هەرگیز لەژیانیدا لە منداڵێکی نەداوە، چونکە لە مامەڵەکردنی لەگەڵ منداڵدا زۆر بەسۆز و بەبەزەیی و ئارامگر بووە و ڕەچاوی حاڵی کردوون و

---

[1] - الترمذي، الجامع الصحيح "سنن الترمذي"، مرجع سابق، ج٢، ص٢٥٩، حديث رقم: ٤٠٧.

پێداویستییەکانیانی جێبەجێکردووە و پەی بە سروشتی ناخ و توانا و ئەو قۆناغەی تێیدابوون بردووە، بە ئەندازەی عەقڵ و پەیبردنیان ئەوانی دواندووە[1].

هەرگیز ئیسلام مەبەستی نەبووە دەروونی خەڵکیی بتۆقێنێت و بیانکاتە کۆیلە و "دەروونێکی کۆیلەییانەیان" تێدا دروست بکات، ئامانج لە سزاکانیش بۆ ترساندنی

---

[1] - بوخاریی گێڕاویەتییەوە لە ئەنەسەوە (خوا لێی ڕازیی بێت) وتوویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) جوانترین ڕەوشتی هەبووە زیاتر لە هەموو خەڵکێکی تر، برایەکم هەبوو پێیدەوترا: ئەبو عومەیر – دەڵێت: وابزانم تازە لە شیر بڕابووەوە– کە دەهات ئەیفەرموو: ئەی ئەبو عومەیر نوغەیر (نوغەیر باڵندەیەکە شێوەی لەچۆلەکە دەچێت) چی کرد؟ –ئەو برایەم یاریی لەگەڵ نوغەیر دەکرد–کاتی نوێژ بوو لە ماڵی ئێمەدا بوو فەرمانی دا حەسیرەکەی ژێری گسك بدرێت و پاشان هەڵسا و ئێمە لەدوایەوە ڕاوەستاین و پێشنوێژیی بۆ ئێمە کرد، بڕوانە:

– البخاري، صحيح البخاري، مرجع سابق، ج٥، ص٢٢٩١، حديث رقم:٥٨٥٠.

ئەحمەدیش لە موسنەدەکەیدا گێڕاویەتییەوە لە عەبدوڵڵەی کوڕی ئەلحاریثەوە وتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) عبدالله و عوبەیدوڵڵە و زۆرێك کوڕانی عەباسی ڕیز دەبەست و دەیفەرموو: هەر کەسێ زوو گەیشتە لای من ئەوە و ئەوەی پێ دەدەم. دەڵێت: ئەوانیش پێشبڕکێیان دەکرد زوو بگەنە لای و دەکەوتنە سەرپشت و سنگیدا و ئەویش ماچی دەکردن و باوەشی پێیاندا دەکرد، بڕوانە:

– الشيباني، أحمد بن حنبل، مسند الإمام أحمد بن حنبل، تحقيق: شعيب الأرناؤوط، بيروت: مؤسسة الرسالة، ط٢٠، ١٤٢٠هـ/ ١٩٩٩م، ج٣، ص٣٣٥، حديث رقم: ١٨٣٦.

ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا دەیگێڕێتەوە لە رافیعی کوڕی عەمری غەفارییەوە دەڵێت: من و تازە لاوێك بەردمان لە دار خورمای ئەنصارەکان دەگرت، لای پێغەمبەری خوا باسکرا کە لێرەدا تازە لاوێك بەرد دەگرێتە دارخورماکان، بردرامە لای پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) و فەرمووی: ئەی تازە لاو بۆ بەرد دەگریتە دارخورماکان؟ وتم: بۆ ئەوەی خورما بخۆم. ئەویش فەرمووی: لەو خورمایانەی کەوتوونەتە زەویی بخۆ و بەرد مەگرەرە دارخورماکان، پاشان دەستی بەسەر سەرمدا هێنا و فەرمووی: خوایەگیان سکی تێر بکە. بڕوانە: الشيباني، مسند الإمام أحمد بن حنبل، مرجع سابق، ج٣٣، ص٤٥٢، حديث رقم: ٢٠٣٤٣.

ترمیزییش لەسوونەنەکەیدا لە ئەنەسەوە دەیگێڕێتەوە دەڵێت: دە ساڵان بووم دەستم کردە خزمەتکردنی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) و بۆ جارێکیش ئۆفی لە دەستم نەکرد، بۆ شتێك ئەنجامم دابێت نەیفەرموو بۆ وەهات کرد و شتێکم نەکردبێت نەیفەرموو بۆ نەتکرد؟ پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) بە ڕەوشتترین خەڵك بوو. بڕوانە:

– الترمذي، الجامع الصحيح، مرجع سابق، ج٤، ص٣٦٨، حديث رقم: ٢٠١٥.

– الشيباني، مسند الإمام أحمد بن حنبل، مرجع سابق، ج٢١، ص٥٢١، حديث رقم: ١٣٦٧٥.

خەڵك نەبووە، بـەڵكو هۆكارێـك بـووە تـاوەكو خـەڵك و ئوممـەت هەسـت بـەوە بكـەن سەلامەت و پـارێزراون و مافیـان دەسـتەبەركراوە، پاڵپشـتیكردنی هێـزی چاكەكاریی بووە لە دەروونەدا، تا لەخراپەكاری و تاوان هەڵبێن.

تا گومان هەبێت سزاكان جێبەجێ ناكرێن، ئەمە بنەڕەتە، چونكە ئامانج لە سزا بۆ قەلاچۆكردنی تاوانە، نەك ئەوەی خودی سزاكە ئامانج بێت، بۆیە هاندان هەیە بۆ تۆڵە نەكردنەوەی كوژراو و پەنا بردن بۆ لێبووردەیی، لێبووردەییەكی سەربەستانە كاتێك ترسی تۆڵەسەندنەوە لەئارادا نەبێت، مێژووی پەیامداریی و خەلیفـە ڕاشـیدییەكانیش باشترین بەڵگەی ئەو ڕاستییەن، هەروەك تەوبەی دزێك قبوڵ دەكرێت كە لەسـەر ئـەو كـارەی پێـداگر نەمابێتـەوە. لەحاڵـەتی بڵاوكردنـەوەی خراپـەكاری لەسـەر زەوییـدا، دەكرێـت لـەبری سـزادانی دوور بخرێتـەوە، یـان بەنـد بكرێـت، ئـیتر نەگەڕێتـەوە و بەرنەدرێت تا دڵنیایی نەدات.

**گوتاری پەروەردەییانەی پێغەمبەر وەك نموونە:**

وەرن با ببینین پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) چۆن مامەڵەی لەگەڵ كچەزا بچووكەكەی حوسەینی كوڕی عـەلی (خـوا لێـی ڕازیـی بێـت) دا كـردووە، پێغەمبـەری پێشەوا و سەركردە، كـاتێ پێشـنوێژیی بـۆ موسـوڵمانان دەكـرد لـە مزگەوتـدا، ئـەو كچەزایەشی لەگەڵ خۆیدا بۆ مزگـەوت هێنـابوو كـە دەچـووە كڕنـۆش دەچـووە سـەر پشتی باپیری، لەهەستانەوەیدا دایدەنا، دواتـر هـاوەڵانی پرسـیاریان لێكـرد هۆكـاری چـی بـوو كڕنـوش بردنـت درێـژەی دەكێشـا؟ ئـەویش وەلامێكـی پەروەردەییانـەی بەهێزیان بە كورتترین و پوختترین دەربڕین وەڵامی دەداتەوە: ((كوڕەكـەم چـووبووە سەر پشتم، نەمویست پەلەی لێ بكەم، تاوەكو خۆی لێ دەبێتەوە))[١].

ئـــەوەی فیكـــری گۆشـــەگیریو دابـــڕان و پەراوێزخســـتنی منـــداڵ لـــەم ڕووداوە تێیگەیشتووە، تێگەیشـتنێكی سـادە و ڕووكەشـییانەیە، بەڵگـەو واتـای ئـەم ڕووداوە

[١]- النسائي، أحمد بن شعيب: المجتبى من السنن، تحقيق: عبد الفتـاح أبـو غـدة، حلـب: مكتـب المطبوعـات الإسلامية، ١٤٠٦هـ/ ١٩٨٦م، ج٢، ص٢٢٩، حديث رقم: ١١٤١.

ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) منداڵانی خۆشویستووە، چونکە خۆشویستنی بۆ کچەزاکەی، ئارەزووی ئەوەی پێ نادات بێ لەبەرچاوگرتنی ئەو خەڵکەی لە پشتەوەی نوێژ دەکەن سوجدەکەی درێژ بکاتەوە.

هەموو ئەوەی ئەو منداڵە لەو دۆخە تێیدەگات، دابەزینی باپیرە خۆشەویست و بەسۆزەکەیەتی بۆ سەر زەوی لەکاتی کڕنۆشبردن و ئەمیش بەخۆشییەوە خێرا بچێتە سەر پشتی بۆ یارییکردن.

دانایی و دەرکی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) بۆ سروشت و پەیبردنی جیهانی منداڵان و شێوازی مامەڵەکردنی سۆزدارانەی لەگەڵیاندا دەردەکەوێت، ئەمە دەرفەتێکی کردارییە و پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) وانەیەکی بەپێز فێری هاوەڵانی دەکات، بۆیە نەهات خێرا کچەزاکەی لەسەر پشتی خۆی دابەزێنێت، چونکە دواتر منداڵەکە ئەوەندە لە دۆخەکە دەزانێت کە باپیری ڕاوی ناوە و دووریخستووەتەوە، بەتایبەت باپیری لەدۆخێکدایە ناتوانێت قسەی لەگەڵ بکات و ئەوەی بۆ شیبکاتەوە.

ئەقرەعی کوڕی حابس کاتێك پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) دەبینێت حەسەنی کچەزای ماچ دەکات، بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) باسدەکات کە هیچ یەکێکی لە دە کوڕەکەی خۆی ماچ نەکردووە، پێغەمبەری خواش (درودی خوای لێبێت) پێی دەفەرمووێت((هەرکەسێ سۆز و بەزەیی نەنوێنێت، بەرانبەری سۆز و بەزەیی نانوێنرێت))[1]. وەها گومان دەبرێت لێرەدا تەنیا مەبەست بەزەیی خوا بێت بەرانبەر ئەو کەسەی بەبەزەییە، بەڵام مەبەست لایەنە دەروونییە پەروەردەییەکەشە، هەرکەسێ بەرانبەر منداڵ دڵڕەق بێت، کە چووە تەمەنەوە ئەو منداڵە بەرانبەری زبر و دڵڕەق دەبێت، نەخۆشییە دەروونییەکانیش بەهۆی نەزانی و دڵڕەقییەوە نەوە لە دوای نەوە بەمیرات وەریدەگرن.

---

[1] - البخاري، صحيح البخاري، مرجع سابق، ج٥، ص٢٢٣٥، حديث رقم: ٥٦٥١.

بـا گـویٚ لەپێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لێبێـت) بگـرین کـە تـازەلاوێکی وەك عبداللەی کوڕی عەباسی مامی دەدوێنێت و پێی دەفەرموویٚت: ((يا غـلام إنـي أعلمـك كلمات، احفظ الله يحفظك، احفظ الله تجده تجاهك، إذا سألت فاسأل الله، وإذا اسـتعنت فاستعن بالله، وأعلم أن الأمة لو اجتمعت على أن ينفعوك بشيء لم ينفعوك إلا بشيءٍ قد كتبه الله لك، ولو اجتمعوا على أن يضـروك بشـيء لم يضـروك إلا بشـيءٍ قـد كتبـه الله عليك، رفعت الأقلام وجفت الصحف))[١]، واتە: ((ئەی لاو باچەند وشەیەکت فێر بکـەم، سنوورەکانی خوا بپارێزە خوای گەورە دەتپارێزێت، ئەگـەر داواکارییـەکت هـەبوو لـە خوای گەورەی داوابکە، ئەگەر پشت پێبەستنت ویست پشت بە خوا ببەستە، بشـزانە گەر کۆمەڵێك کۆببنەوە بۆ ئەوەی سوودێکت پێبگەیەنن، نـاتوانن تـەنیا ئـەو سـوودە نەبێت کە خوا بۆ تۆی نوسـیوە، ئەگـەر کۆببنـەوە بـۆ ئـەوەی زیانێکـت پێبگەیـەنن، ناتوانن ئەوە نەبێت کـە خـوا لەسـەرتی نوسـیووە، قەڵەمـەکانی تۆمـارکردنی ئەجـەل هەڵگیراون و لاپەڕەکانیش وشك بوونەتەوە)).

لەم دوواندنەدا چی دەبینین؟ دوو واتـای پـەروەردەیی بنەڕەتییانـە دەبیـنین، کـە بناغەی هەموو پەروەردەیـەکی سـاغی مرۆڤـی سەربەسـتی بـاوەڕداری خواپەرسـت و خێرخواز و چاکەکارە.

یەکـــەمیان: دروســـتکردنی پەیوەندییـــەکی خۆشەویســـتی و دڵســـۆزی و پشتیوانییەکی دەروونییە لەنێوان ئەو تازە لاوە و پەروەردگاریدا، کە ئەو موسوڵمانە دەپارێزێت و چاودێریی دەکات.

دووەم: گەشەپێدانی گیانی ئازایەتی و پێهەڵگرتن لەسەر بناغـەی هەسـتکردن بە خۆشەویستی و قەناعەتی عـەقڵ و بەرپرسـیارێتیی ویـژدان و دەستپێشـخەریی بـۆ

[١] - الترمذي، الجامع الصحيح، مرجع سابق، ج٤، ص٦٦٧، حديث رقم ٢٥١٦.

جێنشینیکردن "وَإِنْ أَفْتَاكَ عنه النَّاسُ"[1] ئەگەرچی خەڵکییش لەبارەیەوە پرسیارت لێ بکەن.

دوواندنی پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت)، دوواندنێکی پەروەردەییانەی منداڵە کە هەر لەمنداڵییەوە بەخۆشەویستی و ڕێزەوە پـێ بگـات، بۆیـە بـەلای هـەر منداڵێکـدا تێپەڕ ببووایە سەلامی لێ دەکرد[2].

هەر بۆیە پیاوان و ژنانی پێگەیشتووی بەڕێز، ئـەوانیش ئـەو منداڵانـەن کەلـەکاتی منداڵییاندا جێگەی ڕێز و متمانەو پێزانین بوون، بۆیە گەر دەتەوێت پێگەیشـتوویەکی بەڕێز ببینیت، ئەوە منداڵ لەسەر ڕێز و شکۆ و متمانە و پێزانین پێبگەیەنە.

ئەمە سروشتی دوواندنی پێغەمبەر بوو بۆ پەروەردەکردنی منداڵ، تێیدا بانگـەواز دەکات گرنگی بە منداڵ بدرێت و سۆز و بەزەیی و خۆشەویستیی بۆ دەرببڕدرێت.

بگــرە گرنگیــدانی پێغەمبــەر (درودی خــوای لێبێــت) بــە منــداڵ لــەو کاتــەوە دەستپێدەکات کە چاوی نەکردووەتەوە، ئەویش لە جوان هەڵبژاردنی دایك و باوکێکی شـیاو و ڕەخسـاوە بـۆ جـوان پـەروەردەکردنی ئـەو منداڵـە: ((پیـاوانی چـاکەکار و ئافرەتانی چاکەکار بکەنە هاوسەری یـەکتر))[3]، ((ئافرەتـانی بـاش هەڵبـژێرن تـاوەکو

[1] - پێشەوا ئەحمەد بەسەندی خۆی لەوابصەی کوڕی مەعبیدە هاوەڵی پێغەمبەری خواوە (درودی خـوای لەسەر بێت) هێناویەتی دەڵێت: چوومە لای پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) دربـارەی چـاکەو خراپە پرسیاری لێ بکەم، فەرمووی: هاتووی سەبارەت بەچاکەو خراپە پرسیار بکـەیت؟ وتم: سـوێند بـەو زاتەی بەحەق رەوانەی کردوویت بۆ پرسیارکردن جگە لەوە نەهاتووم! فەرمووی: چاکە ئەوەیە دڵـت پێـی بکرێتەوە، خراپەش ئەوەیە دڵت پێی تەنگ ببێت، با خەڵکیش لەبارەیەوە فەتوایان بۆ دابیت". بڕوانە: الشيباني، مسند الإمام أحمد بن حنبل، مرجع سابق، ج٢٩، ص٥٢٣، حديث رقم: ١٧٩٩٩.

[2] - القشيري، صحيح مسلم، مرجع سابق، ج٤، ص١٩٢٩، حديث رقم: ٢٤٨٢.

[3] - الدارمي، عبد الله بن عبد الرحمن. سنن الدارمي، تحقيق: فواز زمرلـي وخالـد السـبع، بـيروت: دار الكتـاب العربي، ط١٠، ١٤٠٧هـ، حديث رقم: ٢٠٨٦.

تۆویان تێدا دابنێن....))[1] و ((کچانی تەمەن منداڵی بەسۆز مارە بکەن کە منداڵی زۆریان دەبێت))[2].

موسوڵمانان ئەو دوواندنە پەروەردەییە پێغەمبەرییە سۆزدارانەیان لە دوواندنی منداڵ لەدەستدا، لەجێگەیدا دوواندنی گاڵتەپێکردن و زبری و ترساندنیان دانا، گرنگییان نەدا بە لێکۆڵینەوەی منداڵێتی و گەشەپێدانی دۆزینەوەی وزەی دەروونی و جەستەییە شاراوەکان تێیدا، نەیانخستەکار بۆ هێنانەدیی گۆڕانکاری و هێنانەوەی وزە و توانا، بۆیە گەلانیان سەرشۆڕ بوو، سەرچاوەکانی وزە تێیاندا خامۆش بوو، هۆز و کۆیلە و کەسانی بێگانەو دوژمنانیان بۆ پاراستنی خۆیان پێش خست، تاوەکو بەوانە بەرگریی لە وڵاتوکانیان بکەن و —لەکۆتایی رێگاکەشدا— خۆیانو گەلەکانیان ببنە نێچێری چەکی سەربازانی خۆیان و ستەم و زۆرداریی دوژمنانیان.

---

[1] - القزويني، محمد بن يزيد. سنن ابن ماجة، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي، بيروت: دار الفكر،(د. ت.)،ج١، ص٦٣٣، حديث رقم:١٩٨٦.

[2] - السجستاني، سنن أبي داود، مرجع سابق، ج١، ص٦٢٥، حديث رقم: ٢٠٥٠.

پێشتر باسمان کرد کە هۆکارە کاراکانی دۆسیە و باسە گـەورەکان دەبێـت فـرە و هەمەجۆر بن، هەوڵەکانی چارەسەرکردنی کێشە گەورەکانیش دەبێت هەمەجۆربن، لە هەموو حاڵەتێکدا پەی بەوە ببەین کە هەموو هۆکـار و هـەوڵێك کـێش و ئەولەوییـەتی دەوەســتێتەوە ســەر سروشــتی هەڵوێســتەکە و دۆخــی کێشــە و پێشــهات و پەیوەندییـەکانی دەورووبـەری، بۆیـە ئـەوەی ئـەم تـەوەرە دەیخاتـەڕوو لـە دیـدگا و چارەسەر بۆ کاراکردنەوەی پرۆژەی چاکسازیی ئیسلامی، گرنگی ئەو هۆکارە زۆرانەی تـر هەڵناوەشـێنێتەوە کـە کاریگـەرییان هەیـە لـە کێشـە و تەنگـەژەی قـەوارەی ئـەم ئوممەتــە و کەمتەرخــەمیی لــە بەجێگەیاندنەکانیــدا، گرنگیــی ئــەو هــەوڵ و دەستپێکردنانەی کار و چاکسازییش هەڵناوەشێنێتەوە کـە کەلـە بـەرە جیاوازەکـانی سیاسەت و ئابووری و کۆمەڵایەتی و بانگخوازی و بەرگرییەوە ئەنجام دەدرێن، بەڵکو مەبەستی تەواوکردنی ئامڕازە مـەعریفی و فیکـری و ڕۆشـنبیری و پەروەردەییەکانـە، تـاوەکو بـەرەنگاریی بکرێـت و مامەڵـە لەگـەڵ هـەموو ئـەو هۆکارانـەدا بکرێـت کـە کاریگەریی دەکەنە ئەو هەڵوێست و دۆخە، بۆ ئەوەی تەواوی هەوڵە پێویستەکان ڕێك و کامڵ بکرێن بۆ بەدیهێنانی سەرکەوتن لە چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە و هێنانەوەی وزەی ئوممـەت و ڕۆڵــی شارســتانیی پێشـەنگانەی، بـە هــەموو وزە و ئازایەتییــەکی لەتوانادا بووەوە، هەرچەند چێژی زانست بە رووەکانی کەمتەرخەمییەوە گوژاڵك بێت، ئەوا تامی رەخنە لەخۆ گرتنیش تاڵ دەبێت.

ئەو هۆکارەی کە ئەم تەوەرە گرنگیی پێ دەدات، بابەتی منداڵێتییـە کـە تـاوەکو ئێستا ڕەهەندێکی گرنگە کە لـە فیکـری ئیسـلامیدا ئامـادەیی نییـە، ئـەوەی بووەتـە هۆکـاری ناکـارابوونی پـرۆژەی چاکسـازیی ئوممـەت و نـەجووڵانی وزە شـاراوەکانی گۆڕانکاریی تێیدا.

دابڕانی نێوان دەستەبژێری فیکری و سیاسی —ئەوەی بەو هۆیەوە لەدەستەوسانی دروست بووە— بووە هۆی گـەورە سـەروەری فیکرێکـی دەقیـی تیـۆریی، لەئەنجامـدا سەفسەتەییەکی قوتابخانەیی لە "ڕۆشنبیریی کەسانی تایبەت" دروست بـوو، لەگـەڵ

روکەشیی و سادەیی و ئەفسانەیی لە "ڕۆشنبیریی خەڵکە گشتییەکە" و دەقێکی دەرخەریی لە "پرۆگرامی فێربوون" و دەسەڵاتخوازییەکی خۆگەورەدانەری زۆردار لە "پرۆگرامی پەروەردە" و زۆردار و سەرکوتکار لە دەسەڵات و فەرمانڕەوایی و پارچەپارچە بوون و ململانێ لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و کەمتەرخەمی و دارمان لە بەجێگەیاندنی تاك و کۆمەڵگا و گەڕاوە بۆ دواوەو وێران بوون لە شارستانییەت و ئاوەدانکاریدا.

**یەکەم: ڕێگەی چاکسازی و ڕووبەڕووبوونەوەی پێشهاتەکان**

ئەگەرچی قەیرانی ئوممەت لەبناغەدا سیاسیی کۆمەڵایەتی بوو، لە ململانێی ئاراستە و توێژ و دەمارگیرییەکان سەرچاوەی گرتبوو، بەڵام گۆڕدرا بۆ کێشەیەکی فیکریی ڕۆشنبیریی شارستانیی، کە لەگەڵیدا دیدگا و ڕۆشنبیرییش شێوا و فیکری لەگەڵدا خامۆش بوویەوە، پاشان بووە کارەسات کاتێك گۆڕدرا بۆ کێشەیەکی دەروونیی ویژدانیی پەروەردەیی کە قووڵتر دەبێت و پشتاوپشتی دەگوێزرێتەوە، توانای ئوممەتی بۆ چاکسازی و نوێبوونەوەو وەرگرتنەوەی جڵەوی دەستپێشخەری و توانای ڕووبەڕووبوونەوەی پێشهاتەکان نەهێشتووە.

بۆ ئەوەی ئەو کێشەیە چارەسەر ببێت و چاکسازیی بێتەدی و ئوممەت بتوانێت تەنگەژەکان تێپەڕێنێت و ڕووبەڕووی پێشهاتەکان بێتەوە، دەبێت توێژینەوە بکەین و لێی بکۆڵینەوە، دەستبکەین بە هەڵوەشاندنەوەو شیکاری پێچەوانە بەئامانجی ناسینی کرۆکی پێشهاتەکان و ڕووەکانی کەمتەرخەمیی ئەو کار ئەنجامدانەی کە ئوممەت ڕووبەڕووی دەبێتەوە، تاوەکو ڕووەکانی گۆڕانکاری و چاکسازیی پێویست بناسین. گەڕان و توێژینەوەیەك ئوممەت پێی تواناداربێت لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو پێشهات و تەحەددایانە و وەرگرتنەوەی توانای باشگەیاندنی ئەرك و جێگرتنی ئایینی یەکتاپەرستی و جێنشینێتی و داد و کار و دەستبارگرتن و ئاساییش و ئاشتی، کە بەشێکن لە گەیاندنی ڕۆڵی لە هەڵسەنگاندن و بەخشینی شارستانیی مرۆییدا.

**هەڕەشەکان (تەحەددیەکان):**

بۆ ئەوەی هەوڵەکان کارا و چاکسازییەکان بەرهەمداربن، دەبێت ماهییەتی ئەو هەڕەشە گەورانە بزانین کە عەقڵی موسوڵمان و ئوممەتی موسوڵمان ڕووبەڕوویان دەبنەوە، تا ئەوەی ببێتە ڕێبەری ڕێنیشاندەر و ئاڕاستەکردنی کارەکانی گۆڕانکاری و چاکسازی، پێوەریش ئەنجامگەلێکی حەقیقیی زانستیی بێت، نەك تەنیا دووپاتکردنەوەی بانگەشەکان و هێنانەوەی خۆزگەکانی توانای زانستی و تەکنەلۆژی.

گەورەترین تەحەدی کە لەمڕۆدا جیهانی ئیسلامیی ڕووبەڕووی دەبێتەوە، دەبێت پێش هەر شتێکی تر ڕووبەڕووی ببینەوە و بەسەریدا زاڵبین، ئەوەیە مەرجی سەرکەوتن لەهەر بوارێکی دیکەشدا. ئەویش تەحەددی و پێشهاتی توانای زانستیی تەکنەلۆجیایە کە جیهانی ئیسلامیی ملکەچ پێکردووە و سەرکوتی کردووە، ئامڕاز و کەرەستەکانی عەولەمە[1] توانای زانستیی و تەکنەلۆجیای بێگانەی زیاتر کردووە، تاوەکو زیاتر زاڵبێت بەسەر تواناکانی ئەم ئوممەتە و سەرکوتکردن و بەکاربردن و پەراوێزخستنی ڕۆڵ و ڕۆشنبیرییەکەی و پارچەپارچەکردنی قەوارەکانی.

خاوەندارییکردنی توانای زانستیی تەکنەلۆجیایی بەوە نایەتەدی کەرەستە و ئامڕازەکان هاوردە بکەیت و گرۆی گەنجان بخزێنیتە ژوورەکانی خوێندنەوە، بەڵکو بەوە دێتەدی پەرەبدرێت بە عەقڵی زانستی و گەشەپێدانی توانای دەروونیی داهێنکاریی.

بێگومان هەموو کەرەستە و ئامڕازەکانمان هاوردەکرد، هەموو ئەوەی لێ هاتەبەر تەنیا بریتی بوو لە تەرخانکردنی گیانی بەکاربردن لای ڕۆڵەکانی ئوممەت و

---

[1] - پێویستە لەنێوان جیهانێتی و عەولەمەدا جیاوازیی بکەین، لە بۆچوونی ئێمەدا جیهانێتیی شێوازی سەلماندنێکی راستەقینەیە، لە بونیادە زمانەوانییەکەیدا واتای ئەو توانا و ئامڕازە زانستییانە دەدات کە مرۆڤایەتیی تواناندار دەکات لەپەیوەندی بەیەکەوە کردن و یەکترناسین و ئاڵوگۆڕکردن و هاوکاریی، هەرچی عەولەمەشە، ئەوە واتای هەڵکوتانەسەر و گەمارۆدان دەگەیەنێ، ئەو زاراوەیەیە کە ئەمڕۆ مەبەست پێی بەکارهێنانی توانا زانستییەکانە لەلایەن هێزە زاڵ و سەرکوتکەرەکانەوە بۆ زاڵبوونەسەر گەلانی لاواز و سەرکوتکردنیان و مامەڵەکردن بە تواناکانیان و خراپ بەکارهێنانی.

بەهەدەردانی دەرامەتـەکانی لـە کڕینـی ئـەو کەرەسـتە و ئامڕازانـە و، گردکردنـەوەی کۆمەڵێ خەڵکێکی ڕوپۆشکراوی تەکنیکی، کە نووسینگەکان پـڕ دەکـەن بـە بێکـاریی دەمامکـدار، چـونکە ئـەو کێشـەیە لەبنەڕەتـدا کێشـەیەکی فیکریـی ڕۆشـنبیریی پەروەردەییە، پێش ئەوەی دۆسیەیەکی ماددیی چەندێتیی بێ.

هـەر ئوممـەتێك بیـەوێت توانـای زانسـتیی تەکنـەلۆجیایی ئاوەدانکردنـەوەیی دەستبخات، دەبێت ببێتە خـاوەن فیکرێکـی مرۆیـی کۆمەڵایـەتیی زینـدوو، هـەروەها زانستگەلێکی کۆمەڵایەتیی مرۆیی زیندوو، پڕۆگرامگـەلێکی زانسـتیی گـەردوونیی کـە وەسـتابێتەوە سـەر بازووگـەلێکی مرۆیـی وریـا و ژیـر و پشـت ببەسـتێتە هیدایـەتی جـێگیری بـاوەڕ و بنـەمای ئامانجـدارێتیی یەکتاپەرسـتیی ڕەوشـتییانە و بـەهای دادپـەروەری و دەسـتباری و لەئەسـتۆگرتن و ئاشـتی، نـەك خـەمی زۆرکـردن و خۆبەگەورەدانان و دروستکردنی چەکی ماڵوێرانکەر و کاولکاریی ببێت.

ئوممەت بۆ ئەوەی بتوانێت ڕووبەڕووی پێشهاتی "زانست و تەکنەلۆجیا" ببێتەوە، دەبێت ڕووبەڕووی کێشە ڕۆشـنبیری و پەروەردەییـەکانی ببێتـەوە، تـاوەکو بتوانێـت مەرجەکانی پڕۆگرام و پەروەردەی پێویست بۆ سەرکەوتن فەراهەم بکات لە هـەبوونی توانای زانستیی تەکنەلۆژیدا.

### دووەم: کێشەی ڕۆشنبیریی، لابردنی شەڕە وەهمیەکان و ڕاستکردنەوەی چەمکەکانی ئیسلام، ئایینی عەقڵ و قەناعەتهێنان و زانست:

کێشـەی یەکـەم لـەم شـوێنەدا کێشـەی ڕۆشـنبیرییە، پێویسـتە ڕووبـەڕووی سەرچاوەکانی دروستبوون و ڕووەکانی ئەو کەمتەرخەمییە ببینـەوە، کـە ڕۆچـوونەتە بناغـەکانی عـەقڵی زانسـتی و پڕۆگرامـە گەردوونییـەکانیان شـێواندووە و وزە فیکرییەکانیان لاوازکردووە.

پـەیامی ئیسـلام عـەقڵ و ویـژدانی دووانـدووە و ڕێگـەی قـایلکردنی زانسـتیی گرتووەتەبەر و شەڕی نەزانی و شوێنکەوتنی کوێرانەی کردووە، دوواندنێکـە هـاوەڵان

لەبارەیــەوە پرسـیاریان کـردووە و مشـتومڕیان تێـدا کـردووە و لەسـەری وەسـتاون و بەتێگەیشتنەوە باوەڕیان پێهێناوە و قایلکارانە ملکەچبوون، نەك باوەڕهێنانی ترس و ملکەچبوونی زۆردارانە و تۆقین، بێگومان ئەوان ڕێنیشاندەرێکی کارا و تێکۆشـەرێکی بەهێزبوون. ڕێزگرتن لەعەقڵی مرۆڤ و ڕێزگرتنی قەناعـەتی ویـژدانی، ئـەو دوو تـاوێرە بەهێزو پتەوەن کە سەرەتای ئەم پەیامەی لەسەر بونیادنرا.

ئازادکردنی مرۆڤ و ویژدانی، ئامانجی ئیسلام و فتوحاتەکانی بوو: ﴿وَقُلِ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكُمْ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ﴾ [الكهف: ٢٩]، واتە: پێیان بڵێ: حەق هـەر ئەوەیە کە لەلایەن پەروەردگارتانـەوە بۆتـان ڕەوانـەکراوە، جـا ئـەوەی دەیـەوێت بـا باوەڕ بهێنێت و ئەوەی دەیەوێت با کافر و بێباوەڕ بێت.

هەروەها دەفەرموویت:﴿وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ وَلِيًّا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ نَصِيرًا﴾ [النساء: ٧٥]، واتە: (ئـەی ئیمانـداران) ئـەوە چـیتانە بۆچـی ناجـەنگن لـەپێناوی ڕەزامەنـدی خـوادا و ڕزگـارکردنی لاواز و چەوسـاوەکان، لـەو پیـاوان و ئافرەتـان و منداڵانــەی کـە دەڵـێن: پـەروەردگارا تـۆ ڕزگارمان بکە لەم شارەی کە خەڵکەکەی ستەمکارن و لەلایـەن خۆتـەوە پشـتیوان و یارمەتیدەرێکمان بۆ ساز بکە.

هەروەها دەفەرموویت:﴿وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾ [البقـرة: ١٩٠]، واتـە: بجـەنگن لـەپێناوی ڕەزامەنـدی خـودا دژی ئەوانەی کە دژتان دەجەنگن، نەکـەن دەسـتدرێژی بکـەن (دژی ژن و منـداڵ و مـاڵات و...هتد)، چونکە بەڕاستی خوا ئەو دەسدرێژکەرانەی خۆش ناوێت.

هەروەها فەرموویەتی:﴿فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾ [البقرة: ١٩٤]، واتە: ئەوەی کـە دەسـتدرێژی دەکاتە سەرتان، ئێوەش مافتان هەیە بەقەدەر دەست درێژییەکەی ئەو تۆڵەی خۆتان بکەنەوە و لە خوا بترسن و چاك بزانن کە بەڕاستی خوا یار و یاوەری پارێزکارانە.

**سزای هەڵگەڕانەوە پەیوەست نییە بە ئیمان یان قەناعەتەوە:**

هیچ کەسێك لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (درودی خوای لێبێت) لە هەڕەشەی مردن لە کەسێك لە ئایین هەڵگەڕابێتەوە نەترساوە و نەتۆقیوە، چونکە ئەوەیان زانیوە ئیمان بە قەناعەتەوە بوونی هەیە و قەناعەت بنچینەیەکە لەبنچینە و مەبەست و دەستپێکەکانی ئایین، نابێت جولەکە بۆ پیلان لەڕواڵەتدا وەهای دەربخەن دێنە نێو ئیسلامەوە، دواتر بۆ بەلاڕێدابردنی خەڵکیی لە ئیسلام دەربچن، ئەوە بابەتی پیلان و تەڵەکەیە نەك بابەتی ئیمان و قەناعەت: ﴿وَقَالَتْ طَائِفَةٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ آمِنُوا بِالَّذِي أُنْزِلَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَجْهَ النَّهَارِ وَاكْفُرُوا آخِرَهُ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ [آل عمران: ٧٢]، واتە: دەستەیەك لە خاوەن کتێبەکان (جووەکان) وتیان بە تاقمێکیان: ئێوە لەسەرەتای ڕۆژدا (بەدرۆوە) ئیمان و باوەڕ بهێنن بەو (قورئانەی) بۆ ئیمانداران ڕەوانەکراوە، بەڵام لەکۆتایی ڕۆژدا و دەمەو ئێوارە پەشیمان ببنەوە (تا دوودڵی و گومانیان تێدا دروست ببێت)، بۆ ئەوەی پاشگەزببنەوە.

بۆیە وەهایان نەدەبینی لە هەڕەشە کردن لە پیلاندەگێڕان وترساندیان، هەڵوەشاندنەوەی مافی مرۆڤ بێت لەبارەی قەناعەت و باوەڕییەوە، ڕێگەیان بەهیچ کەسێکی ئەهلی کیتاب و شارستانییەتەکان نەگرتووە و زۆریان لیێ کردبن و ناچاریان کردبن لە سیستەمی ژیان و بیروباوەڕیاندا دەربچن، ئەوەش بەهۆی زانین و شارەزاییانەوە بووە بەوەی هەرکەسێك بە قەناعەت و زانستەوە باوەڕی هێنابێت، ئەوە ئایینی یەکتاپەرستی و جێنشینێتی و خێر ویستیی ناگۆڕێتەوە بە ئەفسانەی هاوبەش پەیداکردن و بتپەرستی و نەفامیی ئیلحاد و ڕەتکردنەوە، چونکە ئەو عەقڵییەتە باوەڕی بە مرۆڤ و مافی لە بڕیاردانی چارەنووسی خۆی هێناوە.

ئەمە لەڕووی مرۆیی و شارستانییەوە بەسەر دۆخی ئەو هۆزە عەرەبە بتپەرستانەدا جێیەجێ نابێت، کە سیستمی کۆمەڵایەتییان لە دۆخێکی سەرەتاییدا

بووە[1]. دەستگرتنی هۆزە عەرەبەکان بە بنەمای "یان جەنگ یان ئیسلام" لەخۆیدا دەستگرتنی ئەو مرۆڤە سەرەتاییە بتپەرستانە بووە بەرو کۆمەڵگای شارستانییەت و پێگەیشتنی کۆمەلآیەتی و شکۆی مرۆیی، نەك ڕەتکردنەوەی بنەمای ئازادیی بیروباوەڕ.

## کۆنی نوێ لە پڕۆگرامدا: ئایینی و مەدەنی:

ئەم نموونەیە بەرەو کێشەیەکی بەشەکی و حەرفیی دەق و لاوازیی ڕێککردنی پرۆگرام لە پەیوەندییەکانی ئەولەوییەت و بنەماکان و سەرچاوەی دەستپێکردن بە ورد و درشت و ڕووداوەکان لە ڕۆشنبیریی ئوممەت و ڕۆڵی لەشێواندنی عەقڵی زانستیدا، چونکە لەڕاستییدا گەر بەڕاشکاوییەکی تەواو زانستییەوە ڕووبەڕووی ئەم کێشەیە نەبینەوە، ئەوا گفتوگۆ فیکرییەکە نەزۆك و بێبەرهەم دەمێنێتەوە و لە چەند بازنەیەکی بەتاڵدا دەسووڕێتەوە کە بەرانبەرکێ و دژیەکی و جەمسەرگردتن لەنێو ڕۆشنبیران و بیریارانی ئوممەتدا دروست دەکات، لەنێوان کلاسیك و هاوچەرخیدا، ئایینی و مەدەنی و سیکۆلاریدا، ئوممەت –لەنێو هەرای ململانێی ڕۆشنبیرانیدا– لە بێئاگایی و چەقبەستندا بەجێدەهێڵدرێت.

زۆربەی (کادرە) ئایینییەکان بەهۆی هێرشی ڕۆشنبیریی داگیرکارەوە و بەحوکمی لاوازیی توانای ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو پەلامارەوە هەستکردن بەترس بەسەردا زاڵبووە، بۆیە لەوتارەکانیاندا ترساندن و پەلاماری پێچەوانە بۆ سەر مەدەنی و عەلمانیی بووەتە باو، لەگەڵ وەسفکردنی سەرپێچیکاران بەدەرچوو لە ئایین و لادەر. ئەمە لەلایەك، هەروەها نەبوونی قەناعەتی کەسی مەدەنیی بە بابەتی ئایین و بەرنامەی فیکرە و گوتارەکانی، بووتە هۆی تۆقێنەریی گوتاری مەدەنی و عەلمانی و

---

[1]– أبو سليمان، عبدالحميد أحمد. النظرية الإسلامية للعلاقات الدولية: اتجاهات جديدة للفكر والمنهجية الإسلامية. ترجمة: ناصر أحمد المرشد البريك، الرياض: مطابع الفرزدق التجارية، (د. ت)، ص٢٠٢– ٢١١.

دوژمنکاربوونی و ناوزەدکردنی ئایین بەدواکەوتن و نەزانیی، چـونکە کوێرانـە لاسـایی ئەو ناکاتەوە.

ئەم پێکدادانە بووەتە هۆی راکێشـانێکی وێرانکـەری کەسـی مـەدەنی و عـەلمانیی بێئاگا لەناوەرۆکی ئایینی و شوناس و شارستنییەتەکەی خـۆی، وای لێبێـت بەرانبـەر ئایین و مێژوو هەڵوێستی دوژمنکارانە یان گوێپێنەدانی هەبێت، لەهەمانکاتدا کەسـی ئایینییش لەئاست ئـەوەی شارسـتانییەتی مرۆیـی چ مەعریفەیـەکی بـەدیهێناوە چـاو دادەخات، ئەوەش لە ترسی ئایین و کەلتوور و مێژووەکەی خۆی لە ڕۆحی شکسـت و خۆبەدەستەوەدان بۆ زانستە مرۆیی و عەقڵییە هاوردەکراوەکـان، بـەمجۆرە ئوممـەت ئیفلـیج بـووە و دابەشـبووە بەسـەر قوتابخانەیـەکی ئـایینیی حـەرفیی تەقلیـدی و لەبەرانبەریشدا قوتابخانەیەکی مەدەنی عەلمانی تەقلیدی حەرفی نـامۆ ، کـەناوەڕۆکی کەمتەرخەمییەکانیان و دژیەکیان —لەزۆر رووەوە— لەسەر ترس و بێتوانایی و نەزانی دامەزراوە.

پێویستە فتیلەی تیرۆری فیکریی لە گوتاری هەموو خـاوەن فیکـر و مەعریفـەکان داماڵرێن، دەبێت دەستەوسانی نەزانی لە لایەنەکانی فیکری هـەردوولای نـەیار بەیـەك نەهێڵـدرێت. ئـەوە ڕێگەیـە بـۆ کردنـەوەی دەرگـای وتووێـژ و کـاری فیکـری لـەو دۆسیەیانەی خراونەتە بەردەم ئوممەت و ئەو پێشهاتانەی بـەرەو ڕوویـان بووەتـەوە. ڕۆحی پێکەوەگونجان جێگەی پێکدادان بگرێتەوە لـەبونیادنانی پـڕۆژەی شارسـتانیی ئیسلامی ئوممەتدا، ئەو پڕۆژەیە کەلەسەر بیروباوەڕی یەکتاپەرستی و جێنشـینێتی و بـەهای دادگـەری و پێکـەوەیی و دەسـتبارگرتن و کەرەسـتەی زانسـت و عـەقڵ و گەیانـدنی بـاش و چـاك دامـەزراوە، کـە بـەها و بنەماگـەلێکی بـەرز و داواکاریـەکی ڕاسـتگۆیانەی هـەموو ڕۆڵەیـەکی دڵسـۆزی ئـەم ئوممەتەیـە، ئامـانجێکی بـەرزتر و گەورەترە لەبنەچەو ڕەچەڵەك.

داواکاریی (کادری) مەدەنیی موسوڵمان، لەڕووی بنـەماوە (مەبدەئـەوە) بریتییـە لەدەستخستنی توانای زانستیی گەردوونیی، هەڵوێستی (کادری) ئایینیی ئیسلامییش

لەگەڵ ئـەم داواکارییـەدا دژ نییـە، داواکـاری (کـادری) ئـایینیی ئیسـلامییش لـەڕووی بنەماوە ڕێنیشاندانی بەها مەزنەکانی ئیسلامە، (کادری) مەدەنیی ئیسلامییش لەگەڵ ئەم ئامانج و مەبەستە باڵایانـەدا دژ نییـە، بـەڵام کێشـە لـەوێوە دروسـت دەبێـت کـە هەردوولا لەسەر بنەمایەکی نامیتۆدیی وتووێژ دەکەن و لـە تێـڕوانین و باکگراونـدێکی فیکریـی کـورتبین و شـێواوەوە دەسـتپێدەکەن، کـە باغەیـەکی چـاك نییـە بـۆ تێگەیشتنێکی هاوبەش، یان گفتوگۆیەکی بونیادنەر.

پێویستە زەمینەسازیی بۆ گفتوگۆ بکرێت، پاشـان لەسـەر نـەگۆڕەکان و ئامـانج و مەبەستەکان ڕێکبکەون، لەگەڵ خستنەڕووی ئیشـکالییەتە بنەڕەتییـەکانی هەرلایـەك بەجۆرێك کە ڕێگە بدات بە گۆڕینەوەی بۆچوون و زانیاریی پەیوەسـت بـە بابەتـەکانی ناکۆکی و پەیبردن بە کرۆکیان‌و دۆزینـەوەی چارەسـەری گونجـاو بۆیـان، بەشـێوەیە کەزەمینــە و ئامــانجی هاوبــەش دروســتبێت کــە لەســەر بنــەمای نــەگۆڕ و ئامانجـە هاوبەشەکان بونیات نرابێت و بەگیانی یـەکتر قبـوڵکردن و بەردەوامیـدان بووتووێـژی بەرهەمدار و هاوکاریی خێردارانە لەگەڵ یەکتر لە یەکبوونێکی شارستانیی مرۆییدا.

ئاییـنـدارە ئیسـلامییەکان و کـۆی مەدەنییـە ڕۆشـنبیرەکان یەکـدەنگن لەسـەر بـاوەڕبوون بـەخوای گـەورە، بـەوەی تاکـە دروسـتکارە و لەسـەر هیدایـەتی وەحـی و مەبەستەکانی لە بەهای دادپەروەری و خێر و خۆشی و شکۆی مرۆڤ و بەرپرسیارێتیی کار، یەکدەنگیشن لەسەر گەڕان بەدوای هۆکارە گەردوونییەکان و واجیببـوونی هـەوڵ و تێکۆشان و گەیاندنی ڕێك و جوان و بەرپرسیارێتیی کار.

یەکدەنگ و کۆکن لەسەر ئەوەی، پێویستە خاوەن توانابن لە زانست و تەکنەلۆجیا و هۆکارەکـانی هێـزی مـاددی و مەعنـەوی و پێویسـتیی چاکسـازی و جووڵانـدنی وزە شاراوەکانی ئوممەت و پابەندبوون بە ڕەوشتە جوانەکانەوە.

بەڵام ئەم یەکدەنگییە لە خۆزگەوە نزیکترە کاتێ لایەنـەکان خۆیـان بـۆ وتووێـژ و بەیەکگەیشتن ئامادە ناکەن، تاوەکو لەسەر ئـەو زانسـت و مەعریفەیـەی هەرلایـەکیان هەیـەتی بـە خـاڵی هاوبـەش بگـەن، جـا ئـەوە لـەبواری ئـایین و کـەلتوور و مێـژووی

ئیسـلامییدا بێـت یـان لــە گۆڕەپـانی کـەلتووری مرۆیـی لـە زانسـتەکانی هۆکـارە کۆمەڵایەتییەکان و میتۆدەکانی ڕوانین و توێژینەوەی زانستیی تیایدا.

لەڕاسـتییدا ئوممـەتی ئیسـلامیی بەدەسـت عەلمانییـەتێکی سـەیرەوە گیرۆدەیـە کەحاڵـەتی فیکریـی تێیـدا بـۆ مـەدەنی و ئـایینیی وەك یـەك یەکسـانە، ئەمـەش لەئەنجامی پێداگریی هەردوو لایە لەسەر بێئاگایی ئەوی تر و بەرهەمی فیکر و توانـای ئەوی تر، ئەمەش گفتوگۆ گەیاندووەتە ناکۆکیو رقلێبوونی نەفامەکان و ململانێیـان، ئەمەش دەبێتە هۆی قووڵکردنەوەی ناکۆکییەکانی نێوانیان و داخستنی دەروازەکانی بەیەك گەیشتن، بۆیە ویژدانی ئوممەت نا ئامادە و ورە و تینیشی خامۆش دەبێت.

با لەبەدۆزینەوەی نەوەیەکی نوێی ئەو زانا و ڕۆشنبیرانەی کـە خۆیـان بەزانسـتی وەحی و شـایەتی و تێگەیشـتنی بەمەبەسـتەکانی ئـایین و بـەهاکانی و گەنجینـەکانی کـەلتوور و لێکۆڵینــەوە و پەنـد و وانــەکانی، بــە مەعریفــەی زانسـتەکانی مــرۆڤ و کۆمەڵناســی و ماددەکــان و میتۆدەکــانی هۆکــارە گەردوونییــە ئەزموونییــەکان دەڕازێننــەوە دەســتپێبکەین، بــا زانایــان و ڕۆشــنبیرانیش بەرنامــە و میتۆدیــان بەفراوانکردنی بازنەی مەعریفەی خۆیان و گرتنەبەری گفتوگۆ و هاوکـاریی بەرهەمـدار دەسـتپێبکەن. لەسـەر زانکـۆ و سـەنتەرەکانی توێژینـەوەی زاتسـتییە بەرنامـەو و ڕێنـوێنی بـەرەو سەرچـاوەکان پێشـکەش بکـەن و کەرەسـتە پێویسـتەکانی ڕۆشـنبیریکردنی موسـوڵمان لەلایەنـە مـەعریفی و ئایینییـە خواییـە گەردوونییـە مرۆییەکانییەوە پەرەپێبدەن.

لـەم بـوارەدا گۆڕەپـانی زانسـتیی هەوڵگـەلێکی گـرنگ و پێشـەنگانەی بـەخۆوە بینیـوە، کـە وەهـای کـردووە رەسـەنایەتی و ئیسـلامییەتی مەعریفـە و چاکسـازی میتۆدەکانی فیکر بابەتێکی خـراوەڕوو بێـت لەسـەر گۆڕەپـانی زانسـتیی ڕۆشـنبیریی لـەجیهانی ئیسـلامییدا، بـەجۆرێك کـە لەسـەر بنـەمای ئـەوە ئـەدەبیاتی یـەکبوونی ڕۆشـنبیری ئوممـەت و ئامانجـەکانی و بەرنامـەکانی فیکـری و شـێوازەکانی

پەروەردەكردنی تاوتوێ بكرێت، ئەم هەوڵانە پێویستە گەشەیان پێبدرێت و پەرەیان پێبدرێت.

پێویستە لایەنە ناكۆكەكان پێكەوە بە مەعریفەی مەبەستەكانی و بەهاكانی و وزەكانی زانستە گەردوونییەكان كۆببنەوەو لەگەڵ یەك دابنیشن، بەبێ هەبوونی توانای بەجێگەیاندنی چاكو توانای زانستیو تەكنەلۆجی چۆن ڕۆشنبیریی ئوممەت پاك بكرێتەوە لە فیكری جادووبازی و ئەفسانە و شتی پروپووچ، چۆن ڕووبەڕووی بڵاوبوونەوەی نەرێنیی و ملكەچی و لاوازیی ڕەهەندی گشتیی لە بونیادنانی كەسێتیی ڕۆڵەكانی ئوممەتدا ببنەوە.

**ئەو بابەتانەی مەدەنییەكان گرنگی پێدەدەن و تێبینییە میتۆدییەكانیان:**

لەگرنگترین ئەو بابەتانەی كە گرووپە ئایینییە تەقلیدی و مەدەنییە ڕۆژئاوا مەشرەبەكان بێ بنەما لەسەری جیاوازن، چەند بابەتێكن، وەك: ئایا پابەندبوونی مەدەنییەكان و فێرخوازانی مەعریفە مرۆییەكان بە (میتۆدی زانستی ڕێكارەگەردوونییەكان– المنهج العلمی السننی الكونی ) بەواتای نكوڵیكردن لەجیهانی پەنهان و بەڕێوەبردنی گەردوون لەلایەن خواوە بەگوێرەی حیكمەتەكانی دەگەیەنێت، بەجۆرێك كە لۆژیكی مرۆڤ و تێگەیشتنی ناتوانێ هەمەكییەكانی بگرێتەخۆ؟ ئایا پابەندبوونی عەقڵ و هۆكارێتی، ڕەتكردنەوەی غەیب و ئەو شتانە دەگرێتەوە كە پەیوەندییان بە توانا و قەدەرەكانی خوای گەورەوە هەیە لە هەڵسوڕاندنی گەردووندا؟ ئەم تێكەڵكردنە لای هەردوولا بەمجۆرە دروست دەبێت:

أ– كاتێك ئاییندارەكان باسی پاڕانەوە و پشتبەستن و خۆڕادەستكردن بەخوا و حیكمەتی شاراوەی خودای گەورە دەكەن، لە بەڕێوەبردنی كاروبارەكانی مەخلوقاتدا، دەق و نمونەی بۆ دەهێننەوە، ئەمە بەشێوەی گوتارێكی ئامۆژگاریی دەخەنەڕوو كە دابڕاوە لە وێنە گشتییەكەی و لە چوارچێوە مەعریفی و ڕەهەندە كاتی و شوێنەكەی، بێ ئەوەی هۆكارە گەردوونییەكانی مەخلوقات و شوێنەوارەكانی

لەڕووداوەکاندا لەبەرچاو بگرن، لەبەر ئەوەی تەواوی فیکر و بیرکردنەوەیان  گوێ بـە جووڵە و کار لەکۆمەڵگادا نادات، بۆیە کاریگەریی قسەکانیان لە گـوێی مەدەنییەکانـدا وەك بێهۆشی و گوێ نەدان بە واقیعی حاڵ دەردەکەوێت.

کەسە ئایینییـەکان کاتێـك ڕوو لـە گـەلانی ئوممـەت دەکـەن و هانیـان دەدەن بـۆ ئـــەوکارەی پێویســـتە –کوێرانـــە– ئـــەنجامی بـــدەن بـــۆ گـــۆڕینی حاڵیـــان و ڕووبەڕووبوونـەوەی پێشـهاتەکان ، هەنـدێکجاری تـریش قسـەکانیان وەك ڕاکێشـانی هەستی خەڵکێکی تێکشکاوە، تەنیا تەقاندنەوەی تێکشـکاندنەکانیانە بـێ تێگەیشـتن یـــان لەبەرچـــاوگرتنی واقیعـــی حـــاڵو توانـــای وزەکانیـــان، ئەمـــەش کێشـــە و چەرمەسەرییەکانیان بەدەر لەڕێنوێنی زیاتر دەتەقێنێتەوە و نەهامەتیـەکانیان زیـاتر دەبێتو قەوارەیان ماندووتر و وزەکانیشیان زۆرتر پەرش و بڵاو دەبێـت و هەوڵـەکانی بونیادنان و چاکسازییشیان بەفیڕۆدەچێت.

ب– ڕەخنــە و نــاڕەزایی مــەدەنی و عــەلمانی و ڕۆژئــاوا مەشــرەبەکان لــەگوێی ئاییندارەکاندا وەك ئەوەیە پرسیارەکانیان ڕەتکردنەوە بێت و شوێنکەوتەیی بێگانەی داگیرکـەری لـە ڕەتکردنـەوەی پیرۆزییـەکانی ئـایین و ئـەو دەقانـەی ئاییـندارەکان دەیخوێننەوە و نکوڵی جیهانی غـەیب و بـوونی توانـای خـوای گـەورەو چـاودێری بـۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەی مەخلوقاتەکانی تێدا بێت.

ئەگەر هەموو لایەنەکان بەشێوەیەکی گشتی– لە گۆشەی جیاوازەوە – لە ڕاستیدا یەکدەنگبن لەسەر ئـەو بنـەما و سەرچـاوە و دەسـتپێکانەی کـە باوەڕیـان  بـەخودا و هۆکارە گەردوونییەکانی هەبێت و بانگەواز بۆ بیرکردنەوە و کـارکردن بێـت: "اِحْـرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ وَاسْتَعِنْ بِاَللَّهِ وَلَا تَعْجَزْ"[١]، واتە: پێداگربە لەسەر هەر شتێك سوودت پێ بگەیەنێت و پشت بەخوا ببەستە و تەمبەڵ و دەستەوەستان مەبە. ئیدی چۆن دەبێت ئەم تێکەڵکردنە ڕوویدات لەکاتێکدا ئەم ئەندازە هاوبەشە لەنێوان ڕۆڵەکانی ئوممەتـدا هەیە، چاوگەکەی نەبوونی هۆشیارییە لەلایەکو ئیلحادو چەقبەستن لەلایەکی تر؟

[١]– القشيري، صحيح مسلم، مرجع سابق، ج٤، ص٢٠٥٢، حديث رقم: ٢٦٦٤

هۆکاری ئەم تێکەڵکردن و ئەم دەنگە جیاوازانە ئەوەیە کە قسەی بەڵگەدارو مونتەڵەقەکان لەئاییندا مانای زۆریان لەگێڕانەوەی تایبەت بەڕووداو و هەڵوێستی وەهادا تیا دەچێت کە لەمەودای نیو سەدەدا بڵاوبووەتەوە، کە ئەویش سەردەمی پێغەمبەرایەتی و خیلافەی ڕاشیدییە و گێڕانەوەکانیشی پشتی بە زنجیرەی کۆمەڵەیەکی زۆری گێڕەرەوان بەستووە، کە پلەیان جیاواز و هۆشیاری و تێگەیشتن، گۆشەنیگای تێڕوانین و سەلامەتی نییەتیشیان وەك یەك نەبووە، ئەمە بەمەودای دوو سەدە، بە جیاوازیی وڵات و سیفەت و حەزو لایەنگیریان و ئەوەی تووشیان بووە– ئەوەشی تووشی نەوەکانیان بووە– لە شەڕ و ململانێکان، ئەو بەرژەوەندی و گرووپ و دەمارگیری و بۆچوون و ئامانجانەی کەبەشبەشی کردوون، ئەمەش وای کردووە ئەرکی نووسینەوە و ڕێکخستن و لێکۆڵینەوە و بابەتیبوون و کاریگەرییە وشیاری و نا وشیارییەکان تیایدا سەختترین ئەرك بێت، پاش تێپەڕبوونی ئەو دەیە و سەدانە، کە سەرسام دەبیت لە ئاستی ئەو بوێرییەی کراوە لە دەمدرێژی بۆ سەر پایەی پەیامەکە بە شێواندن و درۆ هەڵبەستن و زیادکردن، کە وادەکات ڕێکخستنێکی تەواو و تۆکمە و تۆمارکردنی ورد سەخت بێت. ئەوەی گرنگە بۆ زانستخواز و هەڵگرانی زانست و ئەوانەی گرنگیدەرن بە بەڵگەداری دەقەکان، ئەوەیە تێبگەن کە ڕمان لەدەقەکان، بەتایبەت دەقەکانی فەرموودە و گرنگیدان پێی و لێکۆڵینەوە لە باس و شوێنەوارەکانی، تەنیا تایبەت نییە بەپسپۆڕانی زانستی گێڕانەوە و زانستی فیقه و یاسان، بەڵکو دوو توێژی تری خەڵك و گرنگیپێدانی تریان بۆ زیاد بووە:

توێژی یەکەم: توێژی تەواوی ئوممەتە –بەهۆی بڵاوبوونەوەی ڕۆشنبیریی و هۆشیارییان سەبارەت بەلایەنەکانی کاروباری ژیانیان و ئەوەی کاریگەری دەبێت لەسەر– کە بەشێوەی جیاواز بەروپێش دەچن و دەخوێننەوە و گرنگی دەدەن بەزۆرێك لە دەقەکان.

توێژی دووەم: توێژی خاوەن پسپۆڕییە زانستییەکانە لەتێکڕای کاروبارە جیاوازەکانی ژیانی ماددی و مرۆیی کۆمەڵایەتی، ئەوانەی کە لەسایەی شارەزایی و

زانست و تێگەیشتنیانەوە بۆ مەعریفە گەردوونییەکانیان بڕیار لەسەر دەقەکان دەدەن. بۆیە پشکنینی دەق لەسەر دەستی ئەوانە لەسەر بنەماگەلێکی زانستی گەردوونی دەبێت و تەنها لەسەر شێوەکاریی گێڕانەوە و حەرفیبوونی ڕشتەی گێڕانەوە ناوەستێت، بەڵکو پەلدەهاوێژێت بۆ دەقەکەو لە ناوەڕۆك و مەبەستەکانی دەکۆڵێتەوە و، دەیگێڕێتەوە بۆ بنچینەکانی و دۆخەکەی خۆی و ڕووەکانی حەق و لەتوانابوون تیایدا و، دەرخستنی ئەو بارودۆخ و هۆ و ئەگەرە شاراوانەی دەکرێ تیایاندا بێت.

گرنگیدانی کۆی خەڵکیی بەکاروباری ژیانی خۆیان و ئەوەی کاریگەریی هەیە لەسەری و گرنگیدانی زانا گەروونییەکانیش بە پشکنین و کنەکردنی فیکر، پێویستە ڕێزی لێبگیردرێت و گەشەی پێبدرێت، نەك بەبیانووی پسپۆڕیی بەرتەسك ڕەت بکرێتەوەو نکوڵی لێ بکرێت. چونکە چوارچێوەی خودی توێژینەوەی زانستیی و ئامڕازەکانی فراوانبووەو و گۆڕاوە، زۆربەی خوێندکارانی زانستە ئایینییەکان و کەلتووریش بێئاگان لێی و لەکەرەستە و ئامڕازەکانیشی.

**توانا نوێیەکان و میتۆدی گشتگیرانە لەبابەتەکانی ڕەخنەگرتن لەمەتن و سەنەد:**

ئەوەی لە فەرموودە و سوننەنی ئیعتیبار بۆکراو گێڕدرابێتنەوە، لە سنووری سەد هەزار فەرموودەدایە، زۆرێکیان بەزیادکردن، یان لێکەمکردن، یان جیاوازیی لەبێژەدا دووبارەبوونەتەوە. گێڕانەوەکان جیاواز و دژ و لەئاست متمانەی گێڕانەوەشدا هەموویان لەیەك ئاستدا نین، هەیانە سەحیحە، هەیانە لاوازە، هەندێکیان بە هەڵبەستراو دانراون. زۆرجار هەڵسەنگاندنی دەقێك لەنێوان خوێندکارانی زانستی فەرموودە و فەرموودەناساندا ئەوەندە جیاوازیی لەسەر هەیە دەگاتە جێی دۆشدامان و پرسیارکردن لەبارەی مەودای بابەتیبوونی میتۆدەکە و وردیی جێبەجێکردنی و، مەودای پێویستبوونی دووبارە چاوگێڕانەوە پێیداو، سوودبینین لە توانا زانستییەکانی سەردەم لە پەرەپێدانیدا.

ســەرەڕای ئــەوە، ســەدان هــەزار بــەناو فــەرموودە هــەن کــە ڕەتکراونەتــەوە و نەگێڕدراونەتــەوە، تەنانــەت پێشــەوا ئەحمــەد (بەڕەحمــەت بێــت) نزیکــەی پێنجســەد هەزار فەرموودەی خراوەتــە بەردەست، لــەو هــەمووە تــەنیا نزیکــەی پــەنجا هــەزاری گێڕاوەتەوە، کەزۆریان بەلاواز دانراون، ئەمە کــارێکی گــرنگ و بەئازاریشــە، ئــەو رادە زۆرەی فەرموودەی هەڵبەستراو و درۆینە ڕووندەکاتەوە کە کراریان پێ ناکرێت.

زانینی ئەم حەقیقەتە، ئەگەرچی تیشکیش دەخاتە ســەر رادەی ئــەو هەوڵــەی کــە زانایانی فەرموودە داویانە و ئەو ناڕەحەتییانەش کە ڕووبەڕووی بوونەتەوە، لەگەڵیــدا ئەو حاڵەتە دەروونی و مێشکی و سەختیی ئــەو ململانــێ و ڕەوتانــەش ڕووندەکاتــەوە کە تێکەڵ بە قەوارەی ئەم ئوممەتە بــوون و لــەدەربڕینی ئــایینی و چــەکی پیرۆزییــدا ئامرازێکی برەوپێدەری لێدانو سەرکەوتنیان دۆزیەوە، ڕێگــەی بەشــێواندن و هێنــانی گێڕانەوەی ئیسرائیلی و ئەفســانەکان و ئامــانج و نیــازە بیروبــاوەڕی و سیاســییەکانی تــری پێــدان، ڕێگەیــدا بەگێڕانــەوەی ئــەو ڕێــژە زۆرە کــە بــە ســوننەت و فــەرموودە ناسراون.

هەروەها گرنگــە تێبینیــی ئــەوەش بکــەین، زۆربــەی دەقــە گێڕدراوەکــان جگــە لــە دەیان فەرموودە و سوننەتی کرداریی –کە بەپێی سروشتی خۆیــان– کــۆی ئوممــەت بەردەوامیی پێداون و دوای کەوتوون، دەنا ئەوانی تر ناگەنە ئاســتی ئــەو تــەواتورەی کەلەگەڵیدا دەتوانرێت پێداگریی لەسەر راستی یەکێکیان بکرێــت، یــان ئەســتەم بێــت درۆ و هەڵــەیان تیایــدا بووبێــت، بــەڵکو زۆریــان تێناگــەین ئــاخۆ بۆچــی بــە ئاحــادیی گێڕدراونەتــەوە، لەکاتێکــدا –بــەهۆی گشــتێتی بابەتەکــەی و گرنگیەکــەی و فراوانــی بوارەکەیــەوە – پێویســتبوو بــە موتــەواتیریی بگێڕدرابایەتــەوە، بــەڵکو هەنــدێکی لــە جیاوازی و دژبوون بــەدەر نییــە–تەنانــەت هــی یــەك گێــڕەرەوەش– لەبێــژە و واتــادا جیاوازە، بەجۆرێك لە زۆربەی حاڵەتەکاندا عەقڵ قبوڵی ناکات.

لەراستیدا دونیانەویستی زانا گەورەکانی سەردەمی پەیامــداری و ســەرکردەکانیان لە گێڕانەوەی فەرموودە و پێداگربوون لەسەر بڵاونەکردنەوەو دەستاودەستپێکردنی،

بەهۆی ێگەیشتنیانەوە بووە لەمەترسیی تێنەگەیشتنی خەڵکی لەرەوشی ئـەو کـات و شـوێنەی کـەهاوکاتی ئـەو ڕووداوانـە بـووە، کەبـەبێ ئەوانـە سـەختە تێگەیشـتن لـە مەبەسـت و واتاکـان، بەتایبـەت لەگـەڵ گێڕانـەوەدا بەدەگمـەن ئـەو شـوێن و کـات و مەبەستەی پەیوەست بووە بەو ڕووداوەوە روونکراوەتەوە.

ئەوەی وایکرد دواییینەکان بەرەو گێڕانەوە ئاحادەکان بچـن و زۆر بـەکاریان بێـنن، بەصـەحیح و لاوازییـەوە –و بـەو رادە زۆرە لـە داڕوخـان– لـەپاڵ نیـازە سیاسـی و بیروباوەڕییەکانـدا، بـیری دەستەوەسـتانی و دابـڕان بـوو، بەمەبەسـتی پەردەپۆشـی دەستەوەسـتانیی فیکـری سـەرکوتکراو بـە پیرۆزییـەکان، ئـەم دیاردەیـەش لەگـەڵ دەستەوەستانیی فیکر و ڕوانین و کەم شارەزایی و ئەزموونیدا بە ئاراسـتەی پێچـەوانە هەڵاوسا، هەرچەند دەستەوەستانیی فیکریی و بێتوانـایی ئیجتیهـاد بـۆ بەداواچـوونی گۆڕانکارییەکان زیاد بکات، ئەوا خواستی دەقـیش لەسـەر حسـابی فیکـرو تێڕوانینـی مەبەستدارانە زیاد دەکات، ئەمەش بـواری بـۆ تەقلیـدی حـەرفیی دەڕەخسـێنێت، تـا وایلێدێت لای هەندێك وەرگرتنی دەقێکی لاواز لە وەرگرتنی بۆچوون باشتر بێت.

هەر ئەو ناکۆکیەی لەبارەی نووسینەوەی فـەرمودە سـەریهەڵداوە –بەنـەهیکردن یان ڕێگەدان– بەڵگەی جیاوازیی بۆچوونە لـەبارەی بنچـینەی سـەلامەتیی زۆرکردنـی گێڕانەوەی بێ دیرایە و تێگەیشتن، بەهۆی تێنەگەیشتن لەکات و شـوێن و بوارەکـانی ئـەو فەرموودانـە، ئـاخۆ فـەرموودەی بـواری گەیانـدنی پەیامەکەیـە:﴿وَأَطِيعُوا اللَّـهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَاحْذَرُوا فَإِنْ تَوَلَّيْتُمْ فَاعْلَمُوا أَنَّمَا عَلَى رَسُولِنَا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ﴾ [المائدة: ٩٢]، واتە: (ئەی ئیمانداران) فەرمانبەرداری خوا بن، فەرمانبەرداری پێغەمبەریش بن و وریابن و ئاگاداربن (نەکەن سەرپێچی لە فەرمان و ڕێنموویییەکانیان بکەن) جا ئەگەر پشـت هەڵکـەن و یـاخی بـن ئـەوە بـزانن بەڕاسـتی کـاری پێغەمبـەری ئێمـە تـەنها ڕاگەیاندنی ئاشکرا و ڕوونی پەیامەکەیە.

یـان فـەرموودە و ڕێنمـایی پەیوەسـت بـەڕۆڵی پێغەمبـەری خوایـە (درودی خـوای لێبێـت) لــە فــەرمانڕەواییکردن و بــەڕێوەبردنی دەوڵــەت و هاوڵاتیــان و بەرچــاو

ڕۆشنکردنی ئەوەی تایبەت بە خەڵك و کۆمەڵگا بێت، بەپێی حاڵ و باریان لەژێر ڕۆشنایی شەریعەتی خواییەوە ئیجتیهادی بۆ کردوون: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ﴾ [النساء: ٥٩]، واتە: فەرمانبەردار و گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر و فەرمانڕەواکان بکەن کە لە خودی خۆتانن (لەبیروباوەڕ و پابەندیدا). یان پەرستشێکە و قورئانی پیرۆز ورد و درشتی نەگێڕاوەتەوە، بۆیە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) لەچوارچێوەی سووننەتی کرداریدا ڕوونیکردووەتەوە، وەك ئەوەی لەقورئاندا لەسەر نوێژ و زەکات هاتووە؟: ﴿وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ [النور: ٥٦]، واتە: ئەی ئیمانداران: نوێژەکانتان لەکاتی خۆیدا بە چاکی ئەنجام بدەن و زەکاتی ماڵەکانتان بدەن و فەرمانبەرداری پێغەمبەریش بکەن، بەڵکو ڕەحمتان پێ بکرێت.

نوێژ و زەکات دوو پایەن لە پایەکانی ئایین، قورئانی پیرۆز ورد و درشتی ئەنجامدانیانی ڕوون نەکردووەتەوە، پێچەوانەی ڕۆژوو و حەج کە قورئان بنەڕەتییەکانی بابەتەکەی ڕوونکردووەتەوە و فەرموودەش بەهەمان شێوە، بەتایبەت فەرموودەی کرداریی کە سەرچاوەی بنەڕەتیی ئەنجامدانی نوێژ و زەکاتە. هەرچی فەرمایشت و کرداری پێغەمبەری خوایە (درودی خوای لێبێت) و پەیوەست بەکاروبارەکانی ژیان و داخوازییەکانی بژێوی بێت، ئەوە ئەم ئایەتە ڕوونیکردووەتەوە: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ﴾ [فصلت: ٦]، واتە: ئەی پێغەمبەر(درودی خوای لێبێت)، پێیان بڵێ: دڵنیابن کە من هەر بەشەرێکم وەك ئێوە[1].

---

[1] - پێشەوا موسلیم بە ڕشتەی خۆی گێڕاویەتەوە لە ڕافیعی کوڕی خەدیج کە وتوویەتی:پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) هاتە مەدینە، خەڵك نێر و مێی خورمایان دەکرد، پێغەمبەر فەرمووی: ((ئەوە چی دەکەن؟))، وتیان: پێشتریش ئەوەمان کردووە. فەرمووی: ((ڕەنگە ئەمەتان نەکردبایە بۆتان باشتربووایە)). ئەوانیش دەستیان هەڵگرت و نێرو مێی دارخورماکانیان نەکرد، بەری خورماکە پووکە دەرچوو. دەڵێت: ئەوەیان بۆ پێغەمبەر باسکرد، ئەویش فەرمووی: ((منیش مرۆڤێکم، ئەگەر لەبارەی ئایینەکەتانەوە فەرمانێکم پێتان کرد وەریبگرن، ئەگەر بەبۆچوونی خۆم شتێکم فەرمان پێتان کرد، بزانن منیش مرۆڤم))، بڕوانە: القشيري، صحيح مسلم، مرجع سابق، ج٤، ص١٨٣٥، رقم الحديث:٢٣٦٢.

هەروەها پێویستە هەڵوێستی خەلیفە ڕاشیدییەکان و گەورە هاوەڵان و پیاوانی ڕیزی یەکەم لەبەرچاو بگیرێت، هەیانە لەبارەی کەسێکەوە کەوێراویەتی فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت)و ڕێنوێنیەکانی کە مامەڵەی لەگەڵ ڕووداوەکاندا لەدۆخێکی تایبەت پێ کردووە بگێڕێتەوە، هەروەها پێداگرییان لەسەر مانەوە لەمەدینە تاوەکو تەنیا لەگەڵ ئەوانەدا بدوێن کە لەو سەردەمەدا ژیاون و دەتوانن شتە تێکەڵەکان لەیەك جیابکەنەوە.

هەروەها پێویستە لەوەی لەخودی پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لێبێت) هاتووە لەنەهیکردن و ڕێگەدان بەنووسینەوەی فەرمموودە تێبگەین، مەبەست لەو نەهی و ڕێگەدانە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەوەی ئوممەت لە ناتەواویی تووشی هاتووە و ئەو پێشهات و تەحەددیگەلەی ڕووبەڕووی بووەتەوە و ئەوەی هەڕەمەکییانە زۆرێك کەس دەقەکان خراپ بەکاردەهێنن و کردوویانەتە شوێنگەی ئەفسانە و مەبەست و هەوا و ئارەزوو سەرخستنی دوژمنایەتییەکان و ئامرازی سەرکوتکردنی ویژدانی ئوممەت و جڵەوکردنی عەقڵ و تۆقاندنی ویژدانی و ئامرازی جەنگ و ململانێکان و هاوکاری و ئامرازێك بۆ دەستی دوژمنان.

لەپاڵ ئیشکالییەتی گێڕانەوەدا، تێبینیی لاوازیی ڕەخنەی مەتنیش دەکەین، چونکە ڕەخنەی کارا لە وریایی و تێگەیشتنی زانستییانەی ڕەخنەگرەوە سەرچاوە دەگرێت، بەگوێرەی سروشتی بابەتەکە و شارەزایی تیایدا، ئەمەش بۆ زۆربەی توێژەرانی بواری گێڕانەوە فەراهەم نابێت، کە زۆرجار توێژینەوەکانیان تەنیا لایەنی دەربڕین و شێواز و ڕێسا دەرکەوتوەکان دەگرێتەوە، بەجۆرێك خەریکە ئەم گوتەیە: "لەڕێگەی قسەکەرەوە قسە دەناسرێت"، -لای زۆرێك- جێگەی: "قسەکەر بەقسەوە دەناسرێت"ی گرتووەتەوە، تاوەکو بینیمان – بەهۆی لاوازیی بەهرەی دیرایە و ڕەخنەوە- چۆن کەسانێك قسەیەك و پێچەوانەکەشی دەگێڕنەوە، بەجۆرێك زۆرجار لەگەڵ ڕۆحی شەریعەت و بنەماکانی عەقڵ و دیدگای زانستیی ساغ یەکناگرێتەوە و ناگونجێت.

لاوازیی بەهرەی ڕامان و ڕەخنە گەیشتووەتە ئاستی پشتگوێخستنی پێوانـەکردنی دروستیی مەتنی فەرموودەکان بەپێوەرەکانی قورئان کە فەرمایشتێکی کۆکـەرەوەی پیرۆزی موحکەمی بڕیاردەرەو، بەڵگەیەکی موتـەواتیرە: ﴿مَا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِنْ شَيْءٍ﴾ [الأنعام: ٣٨]، هەروەها دەفەرمووێت: ﴿الر كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِنْ لَدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ﴾ [هود: ١]، هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ جِئْنَاهُمْ بِكِتَابٍ فَصَّلْنَاهُ عَلَى عِلْمٍ هُدًى وَرَحْمَةً لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ [الاعراف: ٥٢].

بـەمجۆرە لـە سـەردەمانی بڵاوبوونـەوەی بـیری گۆشـەگیرییدا، پێگـەی قورئـانی پیرۆزیش گەڕایە دواوە، کە تێکڕاییەکەی بە ئاڕاستەکردنی گشتی و داماڵراو لە کات و شوێن دادەنرێت، تاوەکو ببێتە چاوگەی تێگەیشتن و ئاڕاستەکردن و ڕێنیشاندەریی –بـەجیاوازیی بـارودۆخ و شـوێن و کاتـەکان–، زۆرێـك لـە دەقـە ئاحادییـەکان شـوێنی گرتەوە، کـە ڕەهەنـدی کـات و شـوێنی تێدایـە، بـە صـەحیح و لاوازیـەوە، لـەپێناوی حەسـانەوەی عـەقڵ لـە نارەحـەتی بیرکردنـەوە و ڕوانـین و ئیجتیهـاد و ڕووبەڕووبوونەوەی گوڕانکاری و پێشهاتە نوێیەکان. ئەمە کاتێك ڕووندەبێتەوە کە ئەو بڕە کەمـەی دەقـەکانی سوننە کـە پێشـەوا موجتەهیـدەکان کردویانەتـە بەڵگـە، لـە پێشەوەی هەموویان ئەبو حەنیفەی نوعمان، بەراورد بکەین بەو بـڕە زۆرەی گـەورەی تێکڕای زانسخوازە بچووکەکانی –بێ زانست یان شارەزایی و یان پشکنین– پێ درێـژ دەبێتەوە.

زۆربـەی ئـەو دەقانـە، لـەو کاروبارانـەن کـە ڕێکخسـتن و لێکۆڵینـەوە و زانینـی حەقیقەتی ئەو پیاوانەشی گێڕاویانەتەوە سەخت و گرانە بۆ ئـەو کەسـانەی تۆماریـان کـردووە ئـەو کەسـانەیان نـەبینیوە و هاوسەردەمیشـیان نـەبوون، ئـەو پیاوانـەی سەنەدەکانیان بوون کە لە سەردەمی پێش ئەماندا ژیابوون و تەنیا بە بیستن قسەیان لەبارەیانەوە بیستووە، لەسەردەمێکدا کە پڕبووە بە هەوا و ئارەزوو و شەڕ و ئاژاوەو ئاشوب.

**نموونەکانی ڕەخنەی مەتن: غەیبناسی و پیسبوونی ڕۆشنبیری:**

لەم بوارە گرنگەدا کێشەیەك نییە گەر نموونە و پەندێك بهێنینەوە  کە بەڵگە بدات لەسەر ئیشکالییەتێك کە ڕووبەڕووی فیکری ئیسلامی و ڕۆشنبیریی ئیسلامیی بووەتەوە. ئێمە دەزانین مرۆڤی  موسوڵمان بە هێزی باوەڕی خۆی و هەوڵدەدات و کار دەکات، لای ئەو جێگەی جادووباز و فاڵگرەوە و ئەستێرناسی و خۆلگرتنەوە و ڕەشبینی و سیحر و ترسنۆکیی شوێنی نابێتەوە، جێگەی هیچ جۆرێك لە ئەفسانە و جادووبازیی لای ئەو جێگەی نابێتەوە[1]، لەگەڵ ئەوەشدا لە صەحیحی موسلیمدا دەبینین و دەگێڕدرێتەوە لە موعاویەی کوڕی ئەلحەکەمەوە دەڵێت: وتم ئەی پێغەمبەری خوا من تازە  موسوڵمان بووم و خوای گەورە وا ئیسلامی هێناوە، پیاوانێکمان تیادایە دەچێتە لای جادووگران. ئەویش فەرمووی: ((مەچنەلایان)). وتم: پیاوانێکمان تیادایە ڕەشبینن. فەرمووی: ((ئەوە شتانێکە لە سنگیانە دەیدۆزنەوە و هەیە و ڕێگرییان ناکات)). وتم: پیاوانێکمان تیادایە خۆڵدەگرنەوە. فەرمووی: ((پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرانی خوا خۆڵی دەگرتەوە و هەرچی کەسێ خۆلگرتنەوەی پێکای ئەوە ئەوەیە))[2]. ئەم دەقە واهاتووە، وەك ئەوەی پێغەمبەری خوا (درودی

---

[1] - ئەبو داوود لە سونەنەکەیدا بە ئیسنادی حەسەن لە قبیصەی کوڕی ئەلمەخاریق (خوا لێی ڕازیی بێت) دەگێڕێتەوە وتوویەتی: گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) دەیفەرموو: ((خۆلگرتنەوە و ڕەشبینیی بەشێکن لە (الجبت))). الجبت: سیحر و جادووگەری و بتپەرستنی هەر شتێکی بۆ غەیری خوا دەگرێتەوە.

السجستاني. سنن أبي داود، مرجع سابق، ج٢، ص٤٠٩، حديث رقم: ٣٩٠٧.

ئەلجەوهەریی لە الصحاح دا دەڵێت: "الجبت" وشەیەکە بەڵگە دەدات لەسەر بت و کاهین و ساحیر و هاوشێوەکانی تر"، بڕوانە: الصالح، صبحي. منهل الواردين شرح رياض الصالحين، إستانبول: (د. ن)، (د. ت)، ص٩١٣.

[2] - بۆ تێروتەسەلی بابەتەکە بڕوانە: الصاح. منهل الواردين شرح رياض الصالحين، مرجع سابق، ص٩١٤. بابەتی خۆلگرتنەوە شیدەکاتەوە و دەڵێت: مەبەست ئەوەیە خەتکێشان لەنێو خۆڵ کێشەی لەسەر نییە، ئەگەر زانستێکی گونجاو بەوە بێت کە بە سەحیحیی لە پێغەمبەرانەوە گوازراوەتەوە، بەتایبەت ئیدریس

خـوای لەسـەر بێـت) "هێـڵ" و ئـەوەی بـۆلای دەچـێت –ئـەوەی پرسـیارکار بـۆلای دەچێت– لەبانگەشەی ئاشـکراکردنی غـەیب کەئەمـەش پێچـەوانەی دەقـی راشـکاوی قورئانە.

ئەگـەر ئـەوە راسـت بێـت، ئـەم کـارە وادەخوازێـت سـەرمان سـوڕ بمێنێـت چـۆن پێغەمبــەری خــوا (درودی خــوای لێبێــت) کــە وەحــی بــۆ دێــت، ڕووی دروســتی خۆڵگرتنەوەی بۆ خەڵکی ڕوون نەکردبێتەوە تاوەکو سوود لێـوەربگرن و پێغەمبـەری خواش (درودی خوای لەسەر بێت) سوودی لێ وەربگرێت، لەم رووە سەرسوڕهێنەرەوە کە–بەگوێرەی دەقەکە– دەمانبـات بـۆ غـەیبزانیی، هـەتاوەکو بـەهۆی –بێئاگاییـان لەرووی دروستی هێڵی سەر خۆڵەوە– نەبنە نێچیری دەجالو جادووبازەکان. نمونـەی ئەمجۆرە دەقـە، بـەم تێگەیشـتنە لەکەسـێکی خـاوەن زانسـتی شـەرعیو پێگەیـەکی شـەرعی جـێ متمانـەوە دەربچـێت، پشـتیوانییەکی گـەورە پێشـکەش نیازخراپـەکان دەکـاتو دەروازەیــەکیان بــۆ دەکاتــەوەو شــوێنگەیەکیان بــۆ دابــین دەکــات بــۆ پێوەهەڵواسینی گومانەکانیان.

قورئــانی پــیرۆز –بێگومــان– بــەڕوونی ڕووی ڕاســتەقینەی ئــەم بابەتــەی ڕوونکردووەتەوە و دەفەرمووێت: ﴿قُلْ لَا أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ وَلَوْ كُنْتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لَاسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ [الاعراف: ١٨٨]، واتە: (ئەی محەمەد (درودی خوای لێبێـت) پێیـان بڵـێ: کـە مـن نـاتوانم هـیچ قـازانج، یـان زەرەرێـك بـەخۆم بگەیـەنم مەگـەر ویسـتی خـوای لەسەربێت، خۆ ئەگەر غەیب و شاراوەکانم بزانیایە ئەوە چاکەی زۆرم کـۆدەکردەوە و

---

(سەلامی خوای لەسەربێت)، بەڵام ئەگەر جادووبازی و کەسەکە جادووبازی فڕوفێڵبـاز بێـت، ئـەوە شـتێکی ڕەتکراوەیە.

بنچینەی خەتکێشان، ئەوەیە کەسێك لەسەر خۆڵ سێ هێڵ دەکێشێت، پاشان دەنکـە جۆیـەك یـان تۆوێـك فڕێ دەدات و دەڵێت: ئەوەو ئەوە دەبێت. ڕوونە پێغەمبەری خـوا (درودی خـوای لێبێـت) نـەهیکردووە لـە جـۆرە جادووبازییەکـەی، هەرچـی نـەرمیی نوانـدنی بێـت لەسـەر خەتکێشـان لەسـەر خـۆڵ، ئـەوە لەبـەر گەڕاندنەوەی بووە بۆ هەندێ لە پێغەمبەرانی خوا نموونەی ئیدریس (سەلامی خوای لەسەربێت).

هـيچ ناخۆشییەکیشـم تـووش نـەدەبوو مـن هـیچ شـتێك نـیم تـەنیا ترسـێنەرێك (بـۆ یاخییەکان) و مژدەدەریشم بۆ کەسانێك کە باوەڕدەهێنن.

هەروەها فەرموویەتی:﴿عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَدًا (٢٦) إِلَّا مَنِ ارْتَضَى مِنْ رَسُولٍ فَإِنَّهُ يَسْلُكُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ رَصَدًا﴾ [الجن: ٢٦–٢٧]، واتە: ئەو زاتە زانای نهێنی و شاراوەکانە، کەسیش لەنهێنی و شاراوەکانی ئاگادار ناکات، مەگەر بۆ پێغەمبەرێك خوا خۆی ڕازی بێت (بەوەی هەندێ نهێنی بزانێت)، ئـەو کاتـە فریشـتە دەکاتە پاسەوانی لـە بـەرو پشـتەوە (تـا پـەری و شـەیتانەکان نـەتوانن زەفـەری پـێ بەرن). هەروەها فەرموویەتی:﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى الْغَيْبِ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَجْتَبِي مِنْ رُسُلِهِ مَنْ يَشَاءُ﴾ [آل عمران: ١٧٩]، واتە: بێگومان خـوا جیهـانی شـاراوەتان نیشـان نادات (تا ئایندە بزانن)، بەڵکو خـوا لـە پێغەمبـەرەکانی کەسـانێك هەڵدەبـژێرێت کـە بیەوێت (تا لەهەندێك نهێنی ئاگاداربن بەو ڕادەیەی کە پێویستە).

ئەوەی بوخاریو موسلیم لە عائیشەوە (خوا لێـی ڕازیـی بێـت) گێڕاویانەتـەوە زۆر لەمـە جیـاواز نییـە، دەڵێـت: خـەڵکانێك لـەبارەی جادووبازانـەوە پرسـیاریان لـە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) کرد. وتیان: ئەی پێغەمبەری خـوا هەنـدێکجار لـەبارەی شـتانێکەوە قسـەمان بـۆ دەکـەن ڕاسـت دەردەچێت. پێغەمبـەری خـواش (درودی خوای لێبێت) فەرمووی: ((تِلْكَ الْكَلِمَةُ مِنَ الْحَقِّ يَخْطَفُهَا الْجِنِّيُّ فَيُقَرْقِرُهَا فِي أُذُنِ وَلِيِّهِ، فَيَخْلِطُونَ مَعَهَا مِئَةَ كَذْبَةٍ))، واتە: ((ئەوە وتەیەکی ڕاستە و جنۆکە دەیدزێت و ئەیخاتـە گـوێی دۆسـتەکەیەوە و سـەدان درۆی دیکـەی پێـوە دەلکێنێـت)). لەگێڕانەوەیـەکی بوخارییـدا لـە عائیشـەوە (خـوا لێـی ڕازیـی بێـت) کـە گـوێی لـە پێغەمبەری خوا بـووە (درودی خـوای لێبێـت) فەرموویـەتی: ((إِنَّ الْمَلَائِكَةَ تَنْزِلُ فِي الْعَنَانِ، وَهُوَ السَّحَابُ، فَتَذْكُرُ الْأَمْرَ قُضِيَ فِي السَّمَاءِ فَيَسْتَرِقُ الشَّيْطَانُ السَّمْعَ، فَيَسْتَمِعُهُ، فَتُوحِيهِ إِلَى الْكُهَّانِ فَيَكْذِبُونَ مَعَهَا مِائَةَ كِذْبَةٍ مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِهِمْ))، واتـە: ((فریشـتە لەسـەر هـەور دادەبـەزێت و فـەرمانێك بـاس دەکـات کـە لەئاسمانـەوە

بڕیاردراوه، شەیتان فەرمان و بابەتەکە دەدزێت و ئاڕاستەی جادووبازانی دەکات و ئەوانیش لەلایەن خۆیانەوە سەدان درۆی بۆ زیاد دەکەن)).

بەپێی ئەم فەرموودەیە، جادووبازان شتێك لە غەیب دەزانن، جنۆکە و شەیتانەکان گوێیان لێ دەبێت و بۆ جادووبازانی دەهێنن، پاشان چۆنیان بوێت درۆی پێوە دەلکێنن، قورئانی پیرۆزیش ئەوە یەکلادەکاتەوە کە تەنیا خوای گەورە غەیب دەزانێت و بڕیاری دەدات کە ئەم حاڵە گۆڕانکاریی بەسەردا نایەت، ئەو گوێگرتنە هەڵگیرا و نەما بەهاتنی کۆتا پەیامی ئاسمانی و گەیشتنی مرۆڤ بەقۆناغی پێگەیشتن (رشد) و ئەو بەرپرسیارێتییە تەواوەی کە پێیەوەی ئەمانەتی جێنشینێتی و بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی جیهانی هەڵدەگرێت، بۆیە ئیتر جگە لەخوای گەورە هیچ کەسێکی تر غەیب نازانێت: ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا﴾ [الجن: ١]، واتە: ئەی محەمەد (درودی خوای لێبێت) پێیان بڵێ: وەحی و نیگام پێڕاگەیەنراوە کە بەڕاستی دەستەیەك لە پەرییان گوێیان گرتووە بۆ خوێندنەوەی قورئان و جا کە تەواو بووە وتوویانە: بەڕاستی ئێمە خوێندنەوەیەکی سەرسوڕهێنەرمان بیست.

هەروەها دەفەرموێت﴿وَأَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاءَ فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا (٨) وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَنْ يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَابًا رَصَدًا (٩) وَأَنَّا لَا نَدْرِي أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَنْ فِي الْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا﴾ [الجن: ٨–١٠]، واتە: ئێمەش بەڕاستی بەرەو ئاسمان کشاین و هەست و هۆشمان خستەکار، سەرنجماندا کە پڕە لە پاسەوانی بەتوانا و بێشومار، نەیزەکیش بە هەموو لایەکدا دەکشا، (دیار بوو کە ڕووداوێکی گەورە ڕووی دابوو). ئێمە جاران لە هەندێك شوێنی ئاسماندا خۆمان حەشار دەدا بۆ گوێگرتن و دەنگوباس بیستن، بەڵام ئەوەی ئێستا بیەوێت گوێ بگرێت ڕاستەوخۆ نەیزەکێکی بۆ ئامادەیە و دەهاوێژرێت و لەناوی دەبات. جا بەڕاستی ئێمە نازانین ئایا نەخشەیەکی شەڕ و وێرانکاری کێشراوە بۆ دانیشتووانی

سەر زەوی، یاخود پەروەردگاریان دەیەوێت ڕێنموونیی و هیدایەتیان بدات بۆ دینداری و سەرفرازی.

کاتێ قورئان بەڕوونترین وێنە ڕوونیدەکاتەوە جیهانی دوای پەیامی قورئان، مرۆڤ تیایدا گەیشتووەتە قۆناغی فامیدەیی و تەواوی بەرپرسیارێتیی بڕیار و ئیرادەی خۆی هەڵدەگرێت، ئیتر لەسەردەمی قورئان و زانست و جیهانێتییدا کەسێکی تر جیهانەکەی بەڕێوە نابات و لەبارەیەوە پرسیاری لێ ناکرێت و ئیتر لەدوای پەیامی قورئان بواری هیچ هێزێکی دیکەی جیهانەکانی تر بوونی نییە دەستوەربداتە قەدەر و هۆکاری گەردوونیی خوای گەورە لەڕۆیشتنەڕێوەی ژیان و جیهانی مرۆڤ، بۆ هیچ کەسێك نییە تەماشای جیهانی پەنهانی مرۆڤ بکات بۆ کۆنترۆڵکردنی بەڕێوەڕۆیشتنی ژیانی مرۆڤەکان، بواری بۆسەدانان و گوێگرتن نەما، هەرکەسێ هەوڵی گوێگرتن بدات بەر نەیزەك و ئەستێرەی سووتێنەر دەکەوێت، ئەو ئەستێرە گڕاوییەی کە هەڵە ناکات و دەپێکێت، خوای گەورەش بەو کارە خێری مرۆڤی دەوێت و ڕێگریی دەکات لە زاڵبوونی جیهانەکانی تر بەسەر جیهانی ئەو و تەنگەژەخستنە بەردەمی لە هەڵگرتنی بەرپرسیارێتییەکانی، بۆیە شتێکی گران و سەخت نابینینەوە لە گێڕانەوەکەی سورەتی (الجن) بەشێوەی ڕابردوو (کنا)، هەرچی ئێستاشە (الآن)، ئەوە کارەکە گۆڕدراوە، لەبارەی جنۆکە و جیهانی جنۆکەوە بەگێڕانەوە هەواڵ بە پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) دراوە نەك بەبینین:﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَـيَّ﴾ [الجن: ١]، واتە: ئەی موحەممەد (درودی خوای لێبێت) پێیان بڵێ: وەحی و نیگام پێڕاگەیەنراوە.

ئەگەر نموونەی ئەم دەقانە ڕاست بن، ئاخۆ دەکرێت ئەمە تەئویل بکرێت بەوەی وتووێژگەلێکن و مەبەست پێی خودی کەسانێك بن، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) ویستبێتی زیانیان لەسەر لابدات، بەڵام بەشێواز و دەروازەگەلێك گونجاوبێت بەعەقڵ و توانای دەروونی و عەقڵییان، بەوەش دەقگەلێکی سروشت تایبەت بێت و لە پێویستییەکانی دوواندنی خەڵکی بێت و لەورەوەوە کەمترین زیان پێیان بگات؟

بوخاریی له عەلی (خوا لێی ڕازیی بێت) دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: " قسە بۆ خەڵكی بەوجۆرە بكەن كەدەیزانن، ئایا حەز دەكەن خوا و پێغەمبەرەكەی بەدرۆ بخرێنەوە؟". موسلیمیش لەئیبن مەسعودەوە (خوا لێی ڕازیی بێت) دەگێڕێتەوە: "گەر قسەیەكت بۆ قەومێك كرد و بەعەقڵییانەوە نەچوو (لەسەرووی تێگەیشتنیانەوە بوو)، ئەوا بۆ هەندێكیان مایەی فیتنە دەبێت". پێویستە نەك ڕەخنەی ڕشتە، بەڵكو دەبێت ڕەخنەی مەتنیش بگرین و تەئویل و بەرنامەی تەئویل كارپێبكەین، دەبێت قورئانی پیرۆز و مەبەست و تێگەیشتنەكانی، بڕیاردەری دەقەكانی تری جگە لەقورئان و ئیجتیهاد و لێكدانەوەكان بێت، بەوجۆرە لەسەر بنەمای ڕۆحی شەریعەت هەموو دەرگایەك دادەخەین كە هەڵە و شێواندنی لێوە دێت و ئەفسانە و پیسبوونی فیكری و ڕۆشنبیرییش گەمارۆ دەدرێت. بێگومان فەرموودە صەحیحەكانی پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) گەنجینەیەكی دەوڵەمەندە و پێویستمان بەزیادكردنی شتێك نییە دروستبووەنەكەی نەسەلمابێت، ئەوانەشی كە لەڕووی واتاوە دروست بێت و لەڕشتەدا نەسەلمابێت، تەنیا لەبواری دانایی و ئەسەردا قبوڵی دەكەین، بەڕوانین بۆ ئەوەی واتاكانی لەگەڵ ڕۆحی شەریعەتدا گونجاو و ڕێكە.

### جیهانی پێش پەیامی محەمەد و جیهانی دوای ئەو:

ئێمە لەكۆی وەحی و واقیعی ئەو قۆناغە مرۆییەی كە پێیدا تێپەڕدەبین، تێدەگەین جیهانی پێش پەیامی موحەممەد جیاوازە لە جیهانی دوای هاتنی ئەو پەیامە. كە جیهانی پێش پەیامی موحەممەد تایبەتمەند بووبێت بە ئەفسانە و خەیاڵ، ئەوە جیهانی دوای هاتنی پەیام تایبەتمەند بووە بە قورئان و زانست و سوننەن.

شتێكی بەسوودە گەر لێرەدا گفتوگۆی تێگەیشتنی هەندێ كەس بكەین لەبارەی هەندێ لەو ئایەتانەی قورئان پیرۆز لەبارەی ملكەچبوون و ژێرباربوونی شەیتانەكان

بۆ سولەیمان پێغەمبەر و لەبارەی هەردوو فریشتەکەی بابلەوە[1] هارت و ماروتەوە هاتووە، کە بۆ زۆرێك بووەتە چەکێك پاساوی فیکری ئەفسانەی پێبدرێت و خەڵکانی گشتی و سادە لەخشتەببردرێن و بخرێنە تەڵەی پڕوپاگەندەی فڕوفێڵباز و تەڵەکەبازانەوە.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَاتَّبَعُوا مَا تَتْلُو الشَّيَاطِينُ عَلَى مُلْكِ سُلَيْمَانَ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ وَلَكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُوا يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ وَمَا أُنْزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّى يَقُولَا إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ وَمَا هُمْ بِضَارِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنْفَعُهُمْ وَلَقَدْ عَلِمُوا لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ خَلَاقٍ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا بِهِ

---

[1] - موحەممەد بن یوسفی بەناوبانگ بە (أبي حيان الأندلسي الغرناطي) (٦٤٥– ٧٥٤ه) لەکتێبەکیدا (بحر المحيط) لەخوێندنەوەی (الملَكين)، دەڵێت: "کۆی زانایان جووڵەی فەتحەیان بەپیتی (ل)داوە، وەك دیارە دوو فریشتە بوون، وتراوە جبريل و ميكال بوون، وتراوە دوو فریشتەی تر بوون کە هاروت و ماروتن".
ئیبن عەباس و ئەلحەسەن و ئەبو ئەلئەسوەدی دوئەلی و زەحاك و ئیبن ئەبزا بە کەسرە خوێندوویانەتەوە (الملِكين)، ئیبن عەباس دەڵێت: "دوو پیاوی جادووباز بوونە لەبابلدا، فریشتەکان خەڵکیی فێری جادووبازیی و سیحر ناکەن. ئەلحەسەن دەڵێت: دوو پیاوی زبر و سەختی بابلی عێراق بوون". ئەبو ئەلئەسوەد وتوویەتی: "هاروت و ماروتن، ئەمە گونجاوە بە قسەی ئەلحەسەن". ئیبن ئەبزا دەڵێت: داوود و سولەیمانن (سەلامی خوا لەسەر ئەوان و پێغەمبەری خۆشمان بێت). وتراوە: "دوو شەیتان بوون". بەپێی قسەی ئیبن ئەبزا پیتی (ما) (نافية)یە (نەرێ) و بەپێی کۆی وتەکانی ئەو خوێندنەوانانە (ما) (موصولة)یە.
واتای دابەزاندن (الإنزال): هاوێشتنە دڵانەوەیە. ڕاڤەوانان لەخوێندنەوەی (الملَكين)دا چیرۆکگەلێکی سەیر و نامەعقوڵیان باسکردووە، کە پڕە بە تاوان و بێباوەڕی، بەوەی لەبابلدان و سزا دەدرێن و ئەوەش گونجاو بووە بەو ماوە مێژووییە و قبوڵکردنی زۆرێك ئەفسانە و ڕاوکردنی گێڕانەوە و باسی سەیر، هەمووی بەهۆی بڵاوبوونەوەی نەزانی و ئەفسانە و دەستەوەستانیی فیکرەوە ڕوویداوە. بەهەرحاڵ ئیبن حەیان بەوە کۆتاییهێناوە کە یەکدەنگ بێت لەگەڵ ئیبن عەباسدا (خوا لێی ڕازیی بێت) کە هەموو ئەو وڕینانەی بەو قسەیە کورت و پوخت کردووەتەوە دەڵێت: "هەموو ئەوانە دروست نین، فریشتەکان لەتاوان پارێزراون".
بڕوانە:
– أبو حيان، محمد بن يوسف. البحر المحيط، بيروت: دار الفكر، ١٩٩٢م، مج١، ص٥٢٨.

أَنْفُسَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ﴾ [البقرة: ١٠٢]، واتە: جا جووەکان (وازیان لەکتێبی خوا– تەورات– هێنا و) شوێنی ئەوە کەوتن کە شەیتانەکان دەیانخوێندەوە، دەربارەی دەسەلاَت و حکومەتی سولەیمان، (ئاشکرایە کە) هەرگیز سولەیمان کافر نەبووە، بەڵکو شەیتانەکان کافربوون و خەڵکیان فێری سیحر و جادوو دەکرد، هەروەها مەردومیان فێری ئەو دەکرد کە بۆ هاروت و ماروت دابەزی بوو (کە دوو فریشتە بوون) لە بابل (مەبەستیشیان تێگەیاندنی خەڵکی بوو لە سیحر و جادوو). ئەوانیش کەسیان فێری هیچ جۆرە شتێك نەکرد تا پێیان نەگوتایە: ئەم کارەی ئێمە بۆ تاقیکردنەوەیە و خۆت کافر مەکە (کەچی هەندێك هەر کۆڵیان نەدا ) لەو فریشتانەوە شتی وافێر دەبوون کە ژن و مێردی پێ لەیەك جوودا بکەن، (هەرچەندە) ئەو جادووگەرانە ناتوانن هیچ زیانێك بەکەس بگەیەنن، مەگەر ویستی خوای لەسەربێت، ئەو خەڵکە سەرگەردانە هەمیشە فێری شتێك دەبن کە زیانیان لێدەدا و سوودی نییە بۆیان، بێگومان دەشزانن ئەوەی کالاَی وای کڕی بێت و شتی وا فێربێت لەو دونیا هیچ بەهرەیەکی دەست ناکەوێت، (بەڕاستی) ئەو شتەی ئەوان خۆیانی پێ فرۆشتووە و کەوتوونەتە داویەوە شتێکی زۆر ناپەسەندە ئەگەر بزانن و تێبگەن (چونکە سیحر و جادوو چەواشەکارییە و کارێکی نادروستە).

گەر لەو ئایەتەی پێشوو وردبینەوە و رابمێنین، دەبینین باس لە هەندێ کاروبار و ڕووداو و مومارەسەی پێش هاتنی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) دەکەن. لەپێش ئەو پەیامە، مرۆڤایەتیی لەکرۆکی خۆیدا سەرەتایی و پەرتەوازە بوو بەسەر قەومگەلێکی گۆشەگیر و سنووردارێتیی زانست و مەعریفە، بەسەر ئەو ئوممەت و نەتەوانەدا پەیام و ئاڕاستەگەلێك هاتن و دەستیانگرتن ڕووە و پێشکەوتن و بالاَبوونی مرۆیی و گەیاندیانە قۆناغی موحەمەدییانەی زانستیی جیهانیی، بۆیە ڕووداوی دەرئاسا (خارق) یەکێك بوو لە پێویستییەکانی قۆناغی سەرەتایی و ئامڕاز و کەرەستەی پێغەمبەران بوو لەئاڕاستەکردنی ژیانی قەوم و هۆزەکانیان و لەو ڕێگەیەوە گەیشتنە دلّ و عەقڵیان، کە لەکۆی هەموویدا سادە و ساکاربوون و بۆ

دۆزینەوەی قەناعەتگەلێکی سنووردار لایان بەرانبەر پێغەمبەر و پێغەمبەران، ئەوەشە سورەتی (الجن) ڕوونیدەکاتەوە.

ئایەتی (١٠٢)ی سوورەتی (البقرة) کە پێشتر باسکرا، لەبارەی ژێربارbوونی شەیتانەکان لەکارکردن بۆ سولەیمان و ملکەچبوونی هێزە سروشتییەکان و ئەوانەی لە شوێنانی تری قورئاندا باسکراوە، هەمووی لە بابەت هاوکاریی خوایی و دەرئاسای پێغەمبەرایەتییەوەیە، بەبێ هەوڵی سولەیمان بۆ ڕێگەی ناڕەوا لە گەیشتن بە جیهانەکانی تر و بەتایبەت لەگەڵ شەیتانەکاندا، چونکە هەرکەسێ بەیەکێك لە شەیتانەکان وەسفبکرێت، مرۆڤ بن یان جنۆکە، دەبێت کەسێکی بێباوەڕی خۆبەلزانی ستەمکاری یاخی بێت بەرانبەر فەرمانی پەروەردگاری، بەوەی وەهای لێکردووە شیاو بەو نازناوەبێت.

هەرچی کاری هاروت و ماروتی دوو فریشتەکەی بابلە، ئەوەش پەیوەندیی بەپێش پەیامی موحەممەدەوە هەیە، لەبابەت دەرئاسا و پەیوەندیی مرۆڤی سەرەتایی بەجیهانەکانی ترەوە ڕاست بووبێت یان خەون و گومان، لەپلەبەندبوونی ڕووە و کەماڵی مرۆیی و سەربەخۆبوون و هەڵگرتنی تەواوی بەرپرسیارێتیی لەبەردەم گەیاندنی کاری خۆیدا لە چوارچێوەی بازنەی ململانێی نێوان ڕەوا و ناڕەوا، ڕووناکی و تاریکی، ئەمە لە دەروونی خۆی و جیهانەکەیدا، بۆیە گونجاو نییە لەو دەقە قورئانییە وەها تێبگەین کە خودی فریشتەکان خەڵکییان فێری خراپە و بێباوەڕیی کردبێت –تەنانەت گەر بۆ ئەو ماوەیەش بێت–، ئەوە شتێکە شیاو نییە بە فریشتە و هەستی ئیسلامیی پاك و ساغ قبوڵی ناکات.

سەرچاوەکان ئاماژەیان بەدروستبوونی خوێندنەوەی بە (الملَكين)داوە بەوەی دووانەی (مَلَك)ە و (ملائكة) کۆی ئەو وشەیەیە، بە کەسرەی پیتی لامیش (مَلِك)، کە (ملوك) کۆی ئەو وشەیەیە، لە بۆچوونی مندا ئەمەی دوایی تەواوترە، بەو واتایە بێ ئەوان لە شێوەی کاهینانی پەرستگا کۆنەکان بوون کە لەپێش شارستانییەتی یۆنان باو و بڵاوبوون و خۆیانیان تایبەتکردبوو بەو زانست و مەعاریفانەی کە لەبەرچاوی

خـەڵکی گشـتییدا بۆیـان بووبـووە سەرچـاوەی هێـز و گـەورەیی، لەشـێوەی ئـەوەی چیرۆکی گەورەمان موسا (سەلامی خوای لەسەربێت) لەگەڵ ساحیرانی فیرعەونـدا بـۆ ئێمەی دەگێڕێتەوە، ئەو ساحیرانەی کە بە فێڵی خۆیان گومانیان بۆ خەڵکی گشـتیی دروست دەکرد و چاو و هەستەکانیان هەڵدەخەڵەتاند.

دەکرێت ئەو پادشایانە کاهینە خواپەرستە چاکەکارەکان بووبن، هەرچی زانست و شارەزاییەکیان لا هەبووبێت لەوەی فێربـووبن و خـوای گـەورە خسـتبێتییە دڵیانـەوە بەخەڵکییان وتووەتەوە و وریاییان بە قوتابییـەکانی خۆیـان داوە گـەر ئـەو زانسـت و شـارەزاییانە خـراپ بـەکاربهێنرێن دەبنـە مایـەی ئـاژاوە و بـەلا و خراپـە و زیانیـان ئەنجامداوە و خەڵکیی لەڕێگەی ڕاست لادەدەن. شیاوە ئەم واتایە تێبگەین و شـیاوە بەپێگەی فریشتەکانی خوای گەورە.

شـتێکی بەسـوودە ئـەوە بـیری خوێنـەر بهێنینـەوە لـە فێڵـی جووڵـە و دەنـگ و کارەکانی شانۆ لە یاریی سێرك و ساحیرانی شانۆدا، هەروەها دیمەنە پیشاندراوەکانی سینەما، گەر دڵنیانەبووینانە ئەوە وێنەگەلێکی تـەنیا و تـاکن و بـەدوای یەکدا خێـرا دەهێنرێن و فێڵ لەچاو دەکەن، ئـەوە سـوێندمان دەخـوارد جووڵەگـەلێکی زینـدووی ڕاستەقینەن.

ئەمـە نموونەیەکـە جیـاوازیی بۆچـوون و دژیـەکیی فیکـری و پڕۆگرامـی لەسـەر دروستبووە، کە ئیشکال و مەترسیی و شوێنەواری زیانبەخشـی بـۆ سـەر عەقڵییـەتی ئوممـەت هەیـە، کارێکـە زۆر بەکـەمیی ڕوویـداوە خـاوەن پسـپۆڕییە زانسـتییە دیاریکراوەکـان دانیشـتبن و تاوتوویـان کردبێـت و کەلێنـەکانیان داخسـتبێت و لەبارەیەوە ڕێسای مامەڵەی فیکری و پەروەردەی ئیجابییـان داڕشـتبێت، بـۆ ئـەوەی لەکۆتاییـدا بیروبـاوەڕ و عـەقڵ و جـۆش و خرۆشـییەکان نالـەبار نـەبن و لـە ڕێنیشاندەرێتیی قورئانی پیرۆز و بەرپرسیارێتییەکانی جێنشینێتیی لانەدەن.

## پێویستی ڕاستکردنەوەی میتۆدیی و پاڵفتەکردنی ڕۆشنبیریی:

بەهۆی کەموکورتی بەرنامە و میتۆدمان، زۆربەی ئەو دەقانەی بەهۆی ناتەواوی و هۆکارێکی تر لەگێڕانەوە و مەتندا دروست نین، ئەوە لەبواری ڕەخنەی مەتن و بواری لێکۆڵینەوەی پیاواندا دروست دەردەکەون، کاتێك لەژێر ڕۆشنایی ڕەخنەی دەقدا لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکارانە دەکرێن، هەندێکیشیان دروست نابن، بەلأم لە دۆخی تایبەتیی خۆیدا کە لەمڕۆدا ئەو کەسەی تەماشای دەکات وەك ئەو کەسە نازانێت کە لەکاتی خۆیدا پێی گرنگیدەر بووە، بۆیە لە تێگەیشتنی ئەو دەقەدا بەهەڵەدا دەچێت و بەهۆیەوە ڕۆشنبیریی و عەقڵییەتی ئوممەت تێکدەدات و بەهۆی پیرۆزییەوە دەرگای ئەفسانە و جادووبازیی دەکاتەوە، کە بەرپرسیارێتیی جێنشینیی و عەقڵییەتی زانستی و وزەی دەروونیی تاکەکانی ئوممەت وێران دەکات.

ئامانج لەوەی ڕابوورد ئەوە نییە لە هەر بابەتێك لەوانەی باسمان کرد بەبۆچوونی یەکلاکراوەیی یەکلاییبکەینەوە و پێداگریی لەسەر بکەین، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە دەرگای وتووێژێکی زانستیی میتۆدییانەی سەنگین بکەینەوە، لەنێوان زانا و بیریاران کە ڕەخساو و شایەندراون بەمیتۆد و زانست و ڕۆشنبیرییەکی تەواوەوە و ئامانج و مەبەستەکانی پێ دەستنیشان بکرێت و کاروبارەکانی بخرێنەبەرباس لەژێر ڕۆشنایی ڕۆح و مەبەستی شەریعەت و واقیع و حاڵ و کێشەکانی ئوممەت و نەگۆڕ و گۆڕاوەکان لەخۆبگرێت و ڕووبەڕووی پێشهاتەکان ببێتەوە، ئا بەوجۆرە پەرۆشانە کاردەکەین بۆ ڕزگارکردنی پرۆگرامە فیکرییەکانمان و چاککردنی و سوودبینین لە ئامراز و تواناکان، پێیەوە ڕۆشنبیرییمان پوخت و پاڵفتە دەکەین و ڕێگە لەسەر ئەوانە دادەخەین کە کەرەستەی تەواویان پێ نییە و بەسەر دەروون نەخۆشەکان و خاوەن نیاز و مەبەستەکانیشدا دایدەخەین.

**سێیەم: کێشەی پەروەردەیی، بەرنامە و سەرچاوەی دەستپێکردن:**

ئەگەر نیازی کاری پەرۆشانە و دڵسۆزانەمان هەبێت لەپێناو هێنانەدیی توانادارییی ئوممەت بۆ چاکسازی و گۆڕانکاری و کارکردن لەسەر بەهێزکردنی پڕۆژەی چاکسازیی ئیسلامیی لەڕووی ئامانجە باڵاکانییەوە، ئەوە پێویستە کار بۆ چارەسەرکردنی کێشە پەروەردەییەکان بکەین.

بێگومان ئوممەت ژمارەیەکی زۆری بیریار و سەرکردەی چاکسازیخوازی تێدا هەڵکەوتووە، کەبە نووسین و تێکۆشان و سەرنجیان خستە سەر ئەو ناتەواوییانەی کە ئوممەت بەدەستیانەوە دەناڵێنێت، بەڵام تاوەکو ئەمڕۆش ئوممەت سەرکەوتوو نەبووە لەئەنجامدانی گۆڕانکاریی پێویست و ڕزگاربوون لەو ناتەواوی و دەرد و نەخۆشییانەی کە تاوەکو ئێستا پێیەوە دەناڵێنین.

ئێمە وای بۆ دەچین کە ئەو عەقڵە گەورانە وەك پێویست ڕەهەندی پەروەردەیی منداڵیان لەبەرچاو نەگرتووە، کە بناغەی گۆڕانکارییە، بۆیە تاوەکو ئاستێکی دوور، منداڵ و ڕەهەندی پەروەردەیی لە فیکر و سیاسەت و چالاکیی فیکری و کۆمەڵایەتیی ئوممەتدا لەپەراوێزدا مایەوە.

بەدارمانی فیکری پەروەردەیی –بەو سیفەتەی بەشێکە لە دارمانی فیکری گەردوونیی کۆمەڵایەتیی مرۆیی– بێ مەبەست دیدگای کۆمەڵایەتی گشتییش شێوا، بەهۆی تەشەنەکردنی دەرد و بەڵای سەرکوتکردنو زۆرداریی لە سیاسەت و فیکر و پەروەردەدا، لایەنە خراپ و ناڕێکییە کۆمەڵایەتییەکان جێگەی خۆیانیان تۆکمەکرد، چونکە بەبێ ڕۆشنبیری و فیکر، ڕاوێژ و دادپەروەری و توانا بوونیان نییە، هەروەها بەبێ پەروەردە و فێرکردن، گەشەپێدان و پەرەسەندن بوونیان نییە.

کۆمەڵگای زۆرداری و تیرۆر و تۆقاندن و چەوساندنەوە، کۆمەڵگای تاکڕەوی و دەسەڵاتکردنی بە زۆرە، کە ڕۆڵ و بەشداریی ئەوی تر ڕەتدەکاتەوە و تاکەکان ئەوانەی خوار خۆیان دەچەوسێننەوە و دەیکەنە کۆیلەی خۆیان، چونکە هەموو

تاکێك دەروونی کۆیلەیی هەیە و دەردەدار و تووشهاتووە بەدەردی ملکەچکردن بۆ ئەوەی لەخۆی بەهێزترە. لەهەمانکاتدا بەهۆی ئەو سەرشۆڕی و کزۆڵییەی تووشیهاتووە، گەر ببێتە خاوەن توانا، بەحوکمی نەریت دەبێتە جەللاد و ستەمکاری سەر ئەوانەی خوار خۆی کە لاوازترن. لەنێو کۆمەڵگای کۆیلەگەرییدا دەستبارگرتن و هاوکاریی بوونی نییە، بەڵکو تاکڕەوی و خۆپەرستی و هەڵپەکردنە، بۆ سوودبینین و ڕۆچوون لە شوێنکەوتن و ملکەچی و چەوساندنەوە، ئەمە لەزنجیرەیەکدا بەردەوامە و کۆتایی نایەت و لەشوێنێکدا ناوەستێت، تەنیا لای ئەو گەورە و زۆردارە بالآدەستە نەبێت کە کەسێکی گەورەی بێگانە ملکەچیی دەکات.

بۆیە لەکۆمەڵگایەکی دەروون کۆیلەیی و هەرەمیبوونی چەوساندنەوە و ستەم و فیکری سەرپەرشتی و چاودێری و تاکڕەوییدا، سروشتییە ڕیزبەندیی منداڵ لە خوارەوەی ئەولەوییەتەکاندا بێت، هەروەها قەبارە و ئەندازە کەم و بەها و شکۆ پەراوێزخراو بێت و بەکەرەستەی داهاتوو تۆوی پەرەسەندن و جێی ئومێد دانەنرێت.

ئەم بوونەوەرە (منداڵ) پێویستە هەمیشە داواکارییەکان بەجێبگەیەنێت و ملکەچ بێت، بۆی نییە پرسیار بکات یان پرسیارێکی لێ بکرێت، گفتوگۆ بکات یان گفتوگۆی لەگەڵدا بکرێت و گوێ ڕاناگیردرێت بۆ حەز و ئارەزووی منداڵێتیەکەی و دەبێت هیچ ناڕەزاییەکی نەبێت و شت لەمێشکدا کۆبکاتەوە و خۆی دەربخات و لاسایی بکاتەوە، لەکۆمەڵگای کۆیەلەگەرییدا ئەوە بەرنامە پەروەردەیی و چەمك و تێگەیشتنەکانە، هەرچی تۆقاندن و سزاشە لەڕووی تێگەیشتن و شێوازە بنەڕەتییەکانییەوە، هەندێکی ئاشکرا و هەندێکی تری شاراوەن و بوونیان هەیە.

**پێویستیی ڕەچاوکردنی پەیوەندیی نێوان مەعریفی و ویژدانی پەروەردەیی:**

لەگـەڵ ئـەمجۆرە میتـۆد و ئامڕازانـەی مەعریفـە و پـەروەردە و فێکردنـدا، بـواری دووانـدن و گوتـاری پێغەمبەرایـەتیی لـەبواری پـەروەردەدا بـوونی نییـە، کـە لەسـەر نەرمونیانی و سۆز و گرنگیدان و ڕێزگرتن و هاندان راوەستاوە، شـوێنێك بـوونی نییـە بۆ توێژینەوە زانستییە کۆمەڵایـەتی و پەروەردەییـەکانی منـداڵ و وزە و تواناکـانی و ڕۆڵی لە چاکسازی و گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی و شارستانیدا.

بۆیە دەبێت چاکسازیی فیکریی –بەهەموو ئەو ئامڕازە ڕۆشبیری و پەروەردەییـە ساغ و دروستەی هەیەتی– دەستبکات بە وەبەرهێنانی چڕ و ڕاستەوخۆی بواری ئـەو پەروەردەیەی کە لەمیانەیدا دووبـارە کەسـێتیی موسـوڵمان دادەڕێژرێتـەوە و ڕزگـار دەکرێت و تـاکێکی سـاغ بونیـاد دەنرێـت، کـە دەبێتـە تـاکێکی کـارا لەکۆمەڵەیـەکی یەکسانی بەهێزی سەقامگیر و هاوکار و هەماهەنگ لـەڕووی کۆمەڵایەتییـەوە، دەبێتـە لەخۆگری عەقڵێکی بیریاری ڕاماو لـەڕووی مەعریفـە و دەروونێکـی بـاوەڕداری ئـازادی چـاك و بـەڕێز –کـە لـەڕووی بونیـادی دەروونیـیو ویژدانییـەوە– خـاوەن ئازایـەتی و دەستپێشخەریی بێت.

تاوەکو بتوانرێت لایـەنی دەروونیـی و عـەقڵیی منـداڵی موسـوڵمان لەسـەر بناغـە گـەلێکی زانسـتیی پێشـکەوتوو دووبـارە بونیادبنرێتـەوە، ئـەو گۆڕانکارییـە ئیجابییـە ئەنجام بدرێت کە روحی ئیمان و یەکتاپەرستی و بەخشینی جێنشینێتیی دەیخوازێت، پێویستەلەنەگۆڕ و گۆڕاوەکانی بەرنامـەی پـەروەردەی منـداڵی موسـوڵمان تێبگـەین، لەبوارەکانیدا لێکۆڵینەوەی زانستی پەروەردەیی قووڵ و گەشەپێدراو بکەین، ئەوەش لـەژێر ڕۆشـنایی بابەتـە نـەگۆڕەکانی ئیسـلام، بـەجۆرێك میتـۆد و ئـامڕاز و هـەوڵ و گرنگیدانە پەروەردەییەکان وەلامدەرەوەبن لەگەڵ گەشەی مەعریفە و شـارەزاییەکان و سروشتی گۆڕاو و پێشهاتەکان و لەگەڵ هەر شتێ لەو ئامڕاز و توانا و وزەیانـەی بـۆ ئەو منداڵـە فەراهەمـدەکرێت، ئەمـە بـۆ گەشـەپێدانی سـیفەت و توانـا پێویسـتەکانی سەرکەوتن و پێشبڕکێکردن لەبواری توانا و بەخشیندا.

**داڕمانی فیکری پەروەرەدیی، پاشکۆی داڕمانی فیکری گەردوونییە:**

لەگەڵ نەمانی زانستە کۆمەلاّیەتییەکان و نەبوونی هۆشیاریی لەبارەی سروشتی میتۆدی پەروەردەیی پێغەمبەر، شتێکی سەیر و نامۆ نییە زانستە پەروەردەیی و لێکۆڵینەوەکانی لەمێژووی فیکری ئیسلامییدا ئامادەییان نەبێت.

وێنە دروستەکەی –کە ئەو حاڵەتە ڕوون دەکاتەوە کە ئوممەت پێیگەیشتووە و توانا و وزەکانی شیدەکاتەوە– لەفێرگە سەرەتاییەکانی خەڵکی ڕەش و رووت و نەداردا ڕەنگی دابوویەوە، کە بارگرانییەکانی خەرجیەکەشی لەسەر سەرشانی خەڵکە گشتییەکە و هەژارەکان بوو، دۆخی ئەو فێرگانە و ڕەوشی خراپی مامۆستاکانی و پرۆگرامە سەرەتاییەکانی فێرکردن تیایاندا کەچۆن بووە.

ئەوەی پاشەکشەی ئێمە و پێشکەوتنی کەسانی تر – لە هەندێ ڕووەوە– دەخاتە روو، ئەگەر بەوردییەوە بڕوانین، دەبینین گرنگیدانی بڕیاران و زانایان بە فێرکردنی تێکڕای ڕۆڵەکانی ئوممەت و پەروەردەکردنیان بریتی بووە لە بڕێکی دەگمەن لە ڕامانی ڕووت و، تێبینیی ڕەخنەگرانە لە بەرنامەکانی فێرکردن و، بارودۆخی قوتابخانەکان و شێواز و ئامراز و تواناکانیان و ڕۆشنبیریی مامۆستاکانیان و ئاستی نزمی تواناکانیان. هەڵەیە لەڕێگەی هەندێ ئامۆژگاریی کەسانی تایبەت و گەورە و ئەمیرەکانەوە واقیعی پەروەردە و فێرکردنی ئوممەت وێنا بکرێت کە ئاڕاستەی پەروەردەکاری منداڵەکانیانی دەکەن لەماڵەکانی خۆیاندا، یان لەهەندێ لەو ڕمانانەی هەندێ پیاوانی فیکر و زانست دەیکەن، هەموو ئەوانە هیچ پەیوەندییان بەواقیعی پەروەردە و فێرکردنی دواتری مێژووی ئوممەتەوە نییە.

تەشەنەکردنی ئەم لادانە سیاسیی و فیکرییانە لە ڕەفتاری سەرکردەکانی ئوممەتدا یارمەتیدەرە بۆ تێگەیشتنی بڵاوبوونەوەی دیاردەی فێرکردنی تایبەت و

بێگانە بۆ منداڵەکان، پاشان داڕمانی ڕۆشنبیریی تێکڕای ئوممەت و داڕمانی وزە و تواناکانیان لە وڵاتانی جیهانی ئیسلامییدا[1].

---

[1] - عەقڵییەتی خۆسەپاندن و خۆبەگەورە دانان: لەنێوان کەمینەیەك کە تەواوی تایبەتمەندی و ئیمتیازی هەیە و جیای دەکاتەوە لە ئوممەت و گشتییەکی ڕامکراو کە پشکی ئەو بریتییە لە بەکەمزانین و پشتگوێخستن و بەزاندنی پیرۆزییەکان، وەهای کردووە بەزاندنی مافەکانی مرۆڤ دیارترین ڕووەکانی دواکەوتنی جیهانی ئیسلامیی و لاوازکەری قەوارەکەی بێت، کە کاری ئاسانیی کردووە دزەی بکرێتە ناوەوە و کۆنترۆڵ بکرێت.

بڵاوبوونەوەی دیاردەی خزمەتکاری ماڵان و جۆری مامەڵەکردن لەگەڵیاندا کە لەجیهانی ئیسلامییدا بڵاوبووەتەوە، وێنەیەکی دیکەی ناشیرین و قێزەونی ئەو عەقڵییەتەیە، تائەوەی وەهای لێهاتووە لای ڕێژەیەکی زۆری خەڵك بەبێ هیچ هەستێکی لێپرسراوانەی ویژدان مافەکانی مرۆڤ لەشکۆو داهات و خۆشگوزەرانی و ڕوانینی لووتبەرزانەوە سەرچاوەی گرتووە، ڕووەو بوونەوەر ئاستگەلێکی نزم، تەنانەت هەندێکیان ئەو مرۆڤانە بە ڕەگەزگەلێکی تر دەبینین کە سوکایەتی پێکردن و زبرییان بەشیاو دەزانن، بۆیە ناکرێت تەنیا لەبەرئەوەی پێویستییەکی سەختیان بە توێژەکانی تر هەیە، تاوەکو لەژیاندا بمێننەوە بەو سوکایەتی و بەکەمزانینە مامەڵە بکرێن.

پێویستە لەو عەقڵییەت و مومارەسە و شێواندن و لادانانەی لەئیسلام ڕوویداوە ڕابمێنین و بگەڕێینەوە بۆ تێگەیشتنی ئیسلام لەبابەت برایەتیی مرۆیی و دادگەری و تێکۆشان و دەستباریکردن بۆ ئەوانی تر، لە خودی خۆمان و ڕۆشنبیری و کۆمەڵگاکەمان ئەمە بچەسپێنین و پێویستە لەبنچینەی پێگەیشتنی ڕۆڵەکانماندا لەڕووی بیروباوەڕی ویژدانییدا بە هێز و ئازایەتی و بوێرییەوە ڕووبەڕووی ئەو حاڵەتانە ببینەوە، تاوەکو ببینە ئوممەتێکی بەهێز و هەموو دەردێکی پەرتەوازەیی و لەبیرکردنی کۆی ئوممەت و سەرکزپێکردن و لاوازخستنیان نەهێڵین، پاشان لاوازیی ئوممەت و سەرکزپێکردنی خەڵکانی گشتی و تایبەتی ئوممەت و زاڵبوونی دوژمنانیشی نەهێڵین.

گەر بەبێ ترس و ڕاچەنینەوە خوێندنەوەی مێژووی سەردەمانی دواکەوتنی ئوممەتمان هەڵبژارد، ئەوە هەرگیز هاوکارمان نابێ لەپەیبردن بەدەردو مەینەتییەکانی قەوارەکەمان و ناسینی هۆکارەکانی ئەو لاوازی و لادانانەی کە خزاوەتە ئەم قەوارەیەوە.

**چوارەم: لەنێوان ڕابردوو و ئێستادا، بنەما و سەرچاوە پەروەردەییەکان:**

**پێشەنگ: بەرنامەی پەروەردەیی پێغەمبەر:**

تاوەکو واتای ئەوەی ئوممەت پێیگەیشتووە تێبگەین، پێویست بەسەرنجدان و ڕامانی بابەتیی میتۆدەییانەی ئەوەی کە پێی دەستپێکردووە هەیە، بەوەوە حەقیقەتی ئەو هەڵەیانە دەزانین کە تێیکەوتووین و ئەو هۆیانە دەناسینەوە کە بەم دواکەوتن و کشانەوەیەی گەیاندووین و پەند و ئامۆژگارییشی لێ وەردەگرین.

گەر گوتاری قورئان بناغەی فیکر و میتۆدی ژیانمان بێت، ئەوا بەرنامەی پێغەمبەریش لەپەروەردەدا پێویستە بناغەی دەستپێکمان بێت و لێیەوە سوننەتی کرداریی وەربگرین، هەروەها لە ژیاننامەی پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) و کۆی ڕێنماییەکانی و خەسڵەتەکانی کەسێتییەکەی و شێوازی مامەڵەی لەگەڵ خەڵکەکەی دەورووبەری، تێگەیشتنیشمان بۆ واتاکانی مەنتوقی قورئانی پیرۆز و بەهاو بنەما و مەبەستەکانی ڕێکبکەین، وەك ئەوەی لە وەسفەکانی پێغەمبەردا (درودی خوای لێبێت)، لەڕووی کەسێتی و ڕەوشت و پەیامەوە بەرچاو دەکەوێت.

قورئانی پیرۆز مەشخەڵانی کەسێتیی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت)ی بەسۆز و بەزەیی و دەروون جڵەوکردن و ڕەوشت جوانیی دیاریی کردووە: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ﴾ [الانبياء: ١٠٧]، واتە: (ئەی محەمەد (درودی خوای لێبێت) ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە بۆ ئەوە نەبێت کە ببێتە ڕەحمەت و بەرەکەت بۆ هەموو جیهانەکان (جیهانی ئادەمیزاد و گیاندار و ڕووەك و پەری و...هتد)).

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ [القلم:٤]، واتە: بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت و خوویەکی زۆر جوان و پەسەند و بێوێنە و مەزنیت.

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿وَلَوْ كُنْتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانْفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ﴾ [آل عمران: ١٥٩]، واتە: خۆ ئەگەر تووڕە و قسەڕەق و بێبەزەیی بوویتایە، ئەوا هەموو لە دەورت بڵاوەیان دەکرد.

موسـلیمیش گێڕاویەتییەوە لـە ئـیبن سـەعد ئـەویش لـە عائیشـەی دایکـی ئیماندارانـەوە (خـوا لێـی ڕازیـی بێـت) وتوویـەتی: "پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لێبێت) لەهیچ ئافرەتێك و خزمەتکارێکی نەداوە و لە هیچ شتێکی نەداوە و تەنیا ئەوە نەبێت کە لەپێناو خوای گەورە جیهادی کردووە...".

خاوەنانی هەردوو صەحیح گێڕاویانەنەوە لە ئەنەسەوە (خوا لێی ڕازیی بێت) وتوویەتی: "دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەری خوام کرد (درودی خوای لێبێت) (کە منداڵ بووە) هەرگیز ئۆفێکی لەدەستم نەکرد و بۆ هەر کارێك کردبێتم و هەر شتێك نەمکردبێت قسەی پێ نەگوتم".

لەگێڕانەوەیەکی تردا: "هەرگیز قسەیەکی ناخۆشی پێ نەگوتم و لێدانێکی نەکردم و بەڕوومدا ڕووی گرژ نەکرد و فەرمانی هەر کارێکی پێ کردبم و نەمکردبێت سزای نەداوم، گەر یەکێك لە بنەماڵەکەی گلەیی شتێکیان لێم کردبێت ئەو دەیفەرموو: وازی لێبهێنن گەر بیتوانیبایە ئەنجامی دەدا".

ترمیزیی دەیگێڕێتەوە لە ئەبو هورەیرەوە (خوا لێی ڕازیی بێت) وتوویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) فەرمووی: ((کامڵترینی نێو باوەڕداران لەڕووی ئیمانەوە، ئەوەتانە کە ڕەوشتی باشترینە و باشترینیشتان ئەوانەتانە کە بۆ ژنەکانی باشترینە)).

ئیبن ماجە و ئەلحاکم گێڕاویانەتەوە لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ((باشترینتان ئەوانەتانن کە بۆ ماڵ و منداڵی و کەسوکاری باشترینە، من لەهەمووتان باشترم بۆ کەسوکارەکەم)).

لە بوخاری و موسلیمدا لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازیی بێت) هاتووە وتوویەتی: "پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) لەنێوان دوو کاردا سەرپشك بکرابایە ئاسانترینی هەڵدەبژارد گەر تاوان نەبووایە، گەر تاوان بوایە دوورترین خەڵك دەبوو لە دوورکرتنەوە لێی، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) بۆ خودی خۆی تۆڵەی

لەهیچ کەسێك نەکردووەتەوە، تەنیا ئەوکاتە نەبێت کە پیرۆزییەکانی خوای گەورە بەزێندرابێت، ئەوکات بۆ خوای گەورە تۆڵەی دەکردەوە)).

شەیخان لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازیی بێت) دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: "خوای گەورە نەرم و لەسەرخۆیە و لە هەموو کارێکدا حەزی بە لەسەرخۆیی هەیە".

ترمیزیی تەخریجی کردووە لە ئەبو زەڕەوە (خوا لێی ڕازیی بێت) وتوویەتی: پیاوێك بەپێغەمبەری خوای وت (درودی خوای لێبێت): ئامۆژگارییم بکە. فەرمووی: ((اتَّقِ اللَّـهَ حَيْثُمَا كُنْتَ))، واتە: ((لەهەرکوێدابووی لەخوا بترسە. وتی: زیاتر ئامۆژگارییم بکە)). ئەویش فەرمووی: ((وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا))، واتە: ((گەر تاوانت کرد، ئەوە چاکەی بەدوادا بهێنە ئەو تاوانە دەسڕێتەوە)). وتی: زیاتر ئامۆژگارییم بکە. پێغەمبەریش فەرمووی: ((وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ))، واتە: ((بەڕەوشتی جوانەوە لەگەڵ خەڵکییدا هەڵسوکەوت بکە)).

ئەبو داوود و ترمیزیی گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ((الرَّاحِمُونَ يَرْحَمُهُمُ الرَّحْمَنُ، ارْحَمُوا أَهْلَ الْأَرْضِ يَرْحَمُكُمْ أَهْلُ السَّمَاءِ))، واتە: ((ئەوانەی خاوەن سۆز و بەزەیین خوای گەورە سۆزو بەزەیی بەرانبەریان هەیە، بەزەییتان بەخەڵکی زەوییدا بێتەوە بەوهۆیەوە خەڵکانی ئاسمان بەزەییان بەرانبەر ئێوە دەبێت)). ئیمام ئەحمەد لە ئەبو دەردائەوە گێڕاویەتییەوە وتوویەتی: "هەرگیز پێغەمبەری خوا(درودی خوای لێبێت)م نەبینیوە و لێم نەبیستووە قسە بکات بزەی لەسەر لێو نەبووبێت". ئیمام ئەحمەد ئیخراجی کردووە و حاکم و بەیهەقییش لە ئەبو هورەیرەوە (خوا لێی ڕازیی بێت) کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ((إِنَّمَا بُعِثْتُ لِأُتَمِّمَ مَكَارِمَ الْأَخْلَاقِ))، واتە: ((من تەنیا بۆ تەواوکردنی ڕەوشت جوانییەکان نێردراوم)).

ئاخۆ ئەو میتۆدە ئەخلاقییەی وتاری پەروەردەی پێغەمبەرایەتیی ئەو پێغەمبەرە بەسۆز و ڕەوشتبەرزە لەکوێدایە؟ نەگۆڕەکانی ئەو گوتارە و دەستپێکەکانی لەکوێن؟

**خۆشەویستی و قەناعەت هێنان و ئازایەتی، دەستپێکی گوتاری پەروەردەیی پێغەمبەر:**

لەراستیدا خۆشویستی و سۆز و یاریکردن و بەزەیی و نەرموونیانی و ڕێزگرتنی هەستەکان، ئەو بناغەیەن کە ڕێباز و گوتاری پەروەردەی پێغەمبەر بۆ پێگەیاندنی منالآن و بونیادنانی دەروون و قەوارەی ویژدانییان لێوەی سەرچاوە دەگرن. بەبێ پەیبردن بەو ڕەهەندە و گرنگییەکەی لە بونیادنانی قەوارەی دەروونیی و ویژدانیی منداڵدا، هەرگیز ناتوانین ڕووەکانی ناتەواویی پرۆژەی چاکسازی ئوممەت دەرك پێ بکەین و هۆکارەکانی بێتوانایی هێنانەدیی گرنگترین ئامانجە گەورەکانی و بونیادنانی نەوەگەلێکی بەتوانا ڕوونبکەینەوە، کەبتوانن بارگرانیی ئەو پێشهات و ئاستەنگانەی کە ئوممەت ڕووبەڕوویان دەبێتەوە لەئەستۆ بگرن.

بینیمان پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) چۆن قسە لەگەڵ ئیبن عەباسی منداڵدا دەکات و چۆن لەنێوان خۆی و ئەو منداڵەدا پەیوەندیی خۆشەویستی و سەردانیکردن و چاودێریی دروست دەکات و چۆن ئەوەی لەدەروونـدا بلاودەکاتەوە فێری ئازایەتی و متمانەبەخۆبوون بێت، چۆن کاتێك لەنوێژدا دەبێت ڕەچاوی دەروونی ئەو منداڵە دەکات کە چووەتەسەر پشتی و دەهێڵێت ماوەیەك یاریی بکات و بەخۆی لەسەری پشتی لاینابات.

بێگومان پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) پێداگربوو لەسەر ڕێزگرتنی منداڵ و هەست و سۆزی، کاتێك بەلای منداڵدا تێپەڕ بووە وەك سەلامکردن لە گەورە سەلامی لێکردوون و وەك گەورە لە ئەحواڵیانی پرسیووە و دڵدانەوەی کردوون و گرنگیی بەهەست و سۆزیانی داوە و لەمەجلیسەکەیدا و بوونی ئەوانی پشتگوێ نەخستووە، گاڵتەی لەگەڵداکردوون و ئامۆژگاریی کردووە ڕێز لە منالآن بگیردرێت و هاندانی کردووە لەنێوانیاندا دادپەروەرانە مامەڵە بکرێت[1].

---

[1] - لەسەهلی کوڕی ساعدی ئەلساعدییەوە (خوا لێی ڕازیی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) خواردنەوەیەکیان بۆ هێنا لێیخواردەوە، لەلای ڕاستی تازە لاوێك هەبوو (ئیبن عەباس)، لەلای

هەڵە دەکات ئەو کەسەی وەها گومان دەبات توندوتیژی و بەکارهێنانی دەست و زمان ئامرازی باشی پەروەردەیین، بەڵکو لەڕاستییدا ئەوە بەڵگەی بێتوانایی و ناتەواویی پەروەردەی دایکان و باوکان و تێکشکاندنی کەسێتیی منداڵ و شکاندنی ڕێزگرتنی لە خود و شکۆی دەروون و متمانەبەخۆبوونێتی.

چەندە سەختە لە نەریت و کەلتووری هەندێ گەلانمان تایبەتمەندیی یاسای جەنگڵستان و لاوازیی ڕۆح و ڕەوشتی ئیسلام دەبینین کە قبوڵکردنی دیاردەی لێدانی گەورە و بەهێزەکان نەك بەرانبەر منداڵ و بچووکەکان بەئاسان قبوڵ دەکرێت، بەڵکو

---

چەپیشییەوە پیاوانی گەورە، بۆیە بە تازەلاوەکەی فەرموو: ((مۆڵەتم دەدەیت بەوانی بدەم؟)) لاوەکە وتی: نە والله پشکی خۆم لە تۆ بەهیچ کەسێکی تر نادەم...بڕوانە:

– القشيري. صحيح مسلم، مرجع سابق، ج٣، ص١٦٠٤، حديث رقم:٢٠٣٠.

لە ئەبو هورەیرەوە (خوا لێی ڕازیی بێت) ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ((مَنْ قَالَ لِصَبِيٍّ: هَاكَ، ثُمَّ لَمْ يُعْطِهِ فَهِيَ كَذْبَةٌ))، واتە: ((گەر کەسێك بە منداڵێك بڵێت وەرە ئەمەت پێ دەدەم و پاشان پێی نەدات، ئەوە درۆیە)). بڕوانە:

– الشيباني، مسند الإمام أحمد بن حنبل، مرجع سابق، ج١٥، ص٥٢٠، حديث رقم:٩٨٣٦.

ئەوەی بەلای منەوە جێی ڕامان و سەرسامییە، ئەوەیە کە زۆرجار دایکانی ئەمریکییم بینیووە لە مامەڵەیان لەگەڵ منداڵەکانیاندا لە شوێنە گشتییەکان لە شەقامەکان و باخچە گشتییەکان و یاریگا و بازاڕەکان، کاتێك منداڵەکەی هەڵەیەکی کردووە، یان دایکەکە ویستوویەتی شتێکی بۆ ڕوونبکاتەوە، بەسەر سەرییەوە ڕانەوەستاوە و سەرزەنشت و ئامۆژگاریی بکات، بەڵکو لەسەر ئەژنۆ چەمیووەتەوە و سەری کەوتووەتە ئاستی ڕووی منداڵەکەی و ئینجا قسەی لەگەڵدا کردووە.

دیمەنی ئەو ژنەم لەبیرناچێت کە عەرەبانەکەی دەستی پڕکردبوو لەشتومەك، دوای ئەوەی پارەی شتەکانی دا ڕوویکردە دەرگای بازاڕگەکە تاوەکو بچێتە لای ئۆتۆمبێلەکەی و دەبوو شەقامەکەی بەردەمی ببڕێت، تاوەکو بچێتە گۆڕەپانی وەستانی ئۆتۆمبێلەکان، بەدەستێکی عەرەبانەکەی گرتبوو بەدەستێکی تریشی منداڵە بچووکەکەی، لای کردەوە بەلای منداڵەکەیدا ئایا دەیەوێت سەرکەوێتە عەرەبانەکە، یان بەپێی خۆی ڕێدەکات بۆ چوونەلای شوێنی وەستانی ئۆتۆمبێلەکان؟ منداڵەکە ڕۆیشتن بەپێی هەڵبژارد، بۆیە بەڕێکەوت، بەدەستێك عەرەبانەکەی پاڵدەدا و بەدەستەکەی تریشی منداڵەکەی هەڵگرتبوو هەرچەندە سەختیش بوو.
بۆیە لەم هەڵسوکەوتە پەروەردەییەدا شتێکی سەیر نابینین، ئەم منداڵە کاتێك ڕێز لێدەگیردرێت، کە پێدەگات و متمانە بەخۆی دەکات بە ئازایەتییەکی پەروەردەیی و بەرگریکردن لە مافەکانی خۆی پێدەگات و ڕێگە نادات کەس مافەکانی ببەزێنێت.

مافی ئەوەشیان پێدەدرێت لەپێگەیشتووانیش بدەن و شکۆی مرۆییـان بشـکێندرێت، ئەوەش بووەتە هێما و بەرجەستەیەکی وێرانکردنی بیروباوەڕ و شارسـتانییەت و ئـەو پەروەردەییەی کە تووشی ئوممەت هاتووە، ئەو ئوممەتەی کە پێغەمبەرەکەی تووڕە دەبـوو کـە بیبینایـە پیاوێـك دەسـتی لێـدانی لەخزمەتکارەکـەی بـەرز بکردایەتـەوە، بەتووڕەبوون لێی ڕازیی نەدەبوو هیچ شتێك نەدەبووە مایەی سـڕینەوەی ئـەو تاوانـە ئازادکردنی ئەو خزمەتکارە نەبێت[١]، بەڵکو نەفرەتی دەکرد لە هەرکەسێ بەبێ بـوونی هەر پێویستییەك ئازاری ئاژەڵێکی دابێت[٢]، ئەی چـی دەڵێیـت لـەبارەی توونـدوتیـژیی لەپەروەردەدا؟!

---

[١] - موسلیم لەئەبو عەلی سوەیدی کوڕی موقەڕینەوە (خوا لێی ڕازیی بێت) دەڵێت:"حەوت برا بووین و تەنیا یەك خزمەتکارمان هەبوو برا بچووکەکەمان زللەیەکی لەخزمەتکارەکە دا، پێغەمبەری خواش (درودی خـوای لێبێت) فەرمانی پێکردین بەئازادکردنی"..بڕوانە:

– القشيري. صحيح مسلم، مرجع سابق، ج٣، ص١٢٧٩، حديث رقم: ١٦٥٨.

موسلیم لە ئیبن مەسعودی ئەلبەدرییەوە (خوا لێی ڕازیی بێت) دەڵێـت: بەقامچـیی لەخزمـەتکارێکی خـۆمم دا، گـوێم لـە دەنگێـك بـوو لەپشـتەوەم وتـی: ((بزانـە ئـەی ئـەبو مەسـعود!)) لەتووڕەییـدا لەدەنگەکـە تێنەدەگەیشتم. کە لـێم نزیکبوویـەوە زانـیم ئـەوە پێغەمبـەری خوایـە (درودی خـوای لێبێـت) دەیفـەرموو: ((ئەی ئەبو مەسعود بزانە! ئەی ئەبو مەسعود بزانە!)). دەڵێت قامچییەکەم لەدەستم فـڕێ دا. فـەرمووی: ((ئـەی ئـەبو مەسـعود بزانـە! خـوای گـەورە بـەتواناترە بەسـەر تـۆوە زیـاتر لـە توانـای تـۆ بەسـەر ئـەم خزمەتکارە))، وتم: ئەی پێغەمبـەری خـوا وا لەبـەر خـوا ئـازادی دەکـەم. ئـەویش فـەرمووی: ((گـەر ئـەوە نەکەیت ئەوە دۆزەخ دەتووستێنێ)). بڕوانە:

– القشيري. صحيح مسلم، مرجع سابق، ج٣، ص١٢٨٠، حديث رقم: ١٦٥٩.

[٢] - شەیخان دەیگێڕنەوە لە ئـیبن عومـەرەوە (خـوا لێـی ڕازیـی بێـت) کـە پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لێبێت) فەرموویەتی: ((عُذِّبَت امْرَأَةٌ فِي هِرَّةٍ حَبَسَتْهَا حَتَّى مَاتَتْ، فَدَخَلَتِ فِيهَا النَّارَ، لَـا أَنْـتِ أَطْعَمْتِيهَـا، وَلَـا سَقِيتِيهَا إذ هي حَبَسْتِيهَا، وَلَا هي تركتها تأكل مِنْ خَشَاشِ الْأَرْضِ))، واتە: ((ئافرەتێك لەبەر پشیلەیەك سزا درا، پشیلەکەی بەندکردبوو تاوەکو مـرد و بـەو هۆیـەوە خرایـە دۆزەخـەوە، نـە خـواردنی بەپشـیلەکە دا و نەخواردنەوەیەك و بەرەڵاشی نەکرد لە ئاژەڵ و خشۆکی زەویی بخواردبایە)). بڕوانە:

– البخاري، صحيح البخاري، مرجع سابق، ج٢، ص٨٣٤، حديث رقم: ٢٢٣٦.

– القشيري، صحيح مسلم، مرجع سابق، ج٤، ص١٧٦٠، حديث رقم:٢٢٤٢.

**خۆشەویستیی هێز و پاڵنەرە، گڵی پەیوەندییە کاریگەرە بەرهەمدارەکانە:**

خۆشەویستیی متمانە و دڵئارامی و ئازایەتیی دروست دەکات، یەکێك لەتایبەتمەندییەکانی ئەو پەیوەندییەی لەسەر خۆشەویستیی دروست دەبێت، ئەوەیە ترسێکی ئیجابیی لای منداڵ دروست دەکات و دەترسێت و پێداگرانە کار دەکات بۆ بەدەستهێنانی رازیبوونی کەسی خۆشەویستراو: پەروەردگار و ئایین و پێغەمبەر و دایك و باوك و مامۆستاکەی و هەستی نەرێنیی ڕووی تێناکات لە ترسی سیلبی و تاڵی و بەربەرەکانێ و ئەو ڕەتکردنەوەیەی کە زبری و توندیی هۆکارە بۆی و ڕووی ناکەوێتە ئەوەی هەستی خۆشەویستی و ڕێزگرتن و متمانەبەخۆبوون و دادگەری و مامەڵەی بەخشندانە و ڕێز لەدەست بدات.

بەهۆی کەمیی گرنگیدانی کۆی ئوممەت بەخوێندنەوە و شارەزایی پەروەردەیی لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە بەهۆی کەمیی فەراهەمبوونی لەڕووی زانستی و پەروەردەیی و کۆمەڵایەتییەوەی لەڕوانگەی ئیسلامییەوە، دەبینین دایکان و باوکان زۆرجار تێکەڵ و پێکەڵ دەکەن لەنێوان چەمکەکانی خۆشەویستی و ئازادی و ڕێکخستن و وەك کاروبارگەلێکی دژ و پێکەوە نەگونجاو دێتە پێشچاویان، لەڕاستییشدا پێکەوە گونجاو و تەواوکەری یەکترن.

خۆشەویستیی نازپێدانی لەڕادەبەدەر نییە، ئەوە ناگەیەنێت بەدەم هەموو داخوازیی منداڵەکەوە بچیت و لە هەڵە و زیادەڕەوییەکانی چاو دابخەیت، بەڵکو

---

شەیخان لەئیبن عومەرەوە(خوا لەهەردووکیان رازیی بێ)گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەری خوا(درودی خوای لێبێت):"نەفرەتی کردووە لەهەرکەسێك بەمەبەست گیاندارێك رادەگرێت و بیکاتە نیشان". بڕوانە:

– القشيري، صحيح مسلم، مرجع سابق، ج٣، ص١٥٤٩، حديث رقم:١٩٥٨.

موسلیم گێڕاویەتییەوە لە ئیبن عەباسەوە (خوا لەهەروکیان ڕازیی بێت) گوێدرێژێکی بەلادا تێپەڕبوو لەسەر دەمووچاوی داخ هەبوو (خاڵ)، بۆیە فەرمووی: ((لَعَنَ اللهُ الَّذِي وَسَمَهُ))، واتە: ((نەفرەتی خوا لەو کەسەی خاڵی لەسەر کوتی))، بڕوانە:

– القشيري، صحيح مسلم، مرجع سابق، ج٣، ص١٦٧٣، حديث رقم:٢١١٧.

خۆشویستنی ڕاستەقینە کرۆکی ئەو پەیوەندییەیە کە لەنێوان منداڵ و پەروەردەکاردا دەربڕینیٚ دروست دەکات، لەبارەی هەستی خۆشویستن و گرنگیپێدان و چاودێریی ڕاستگۆیانەی ئەرێنی، کە ئامانج پێی بەرژەوەندیی ئەو منداڵە و فەراهەمکردنی هەموو ئامراز و شێوازە جیاوازەکانی خۆشگوزەرانی و چاودێری و گەشەپێدان و بەهێزکردنی توانا و بونیادنانی دەروونیی ئەو منداڵەیە، لەسەر بنەما گەلێکی ئیسلامیی ساغ و چاك، ئەوەش واتای هەوڵ و تێکۆشان دەدات بۆ تێگەیشتنی دەروونی ئەو منداڵە و ئەو قۆناغەی کە پێیدا تێپەڕ دەبێت و ناسینی ئەو شێوازە پەروەردەییانەش کە پێویستە لەپێش چاو بگیردرێن، لەکاتی مامەڵەکردن لەگەڵیدا، بەجۆرێك منداڵەکە پاڵبدات بۆ ڕەفتاری ساغ و لەبار.

**ئازادیی هێزە: سنوور و ڕێکخەرەکانی:**

بەهۆی نەشارەزایی و نەزانیی زۆرێك لە باوکان لەبارەی چەمکە پەروەردەییەکان و کەمتەرخەمیی زۆرێك ڕۆشنبیر و بیریار و پەروەردەکار لەگەیاندنی ڕۆڵی زانستیی بەرچاوی ڕوونکردنەوەیی خۆیان، تێگەیشتن لە ئازادیی لای ئەوانە واتا جڵەوبەرەڵاکردن بۆ ئەنجامدانی هەر کارێك حەز و نیازی هەبێت بیکات، بێگومان ئەوە تێگەیشتنێکی هەڵە و وەهمیە، لەکۆتاییدا کاری لەو جۆرە بەئاژاوە و خراپەکاری و هەڵوەشاندنەوە و هەرەسهێنان دەگات.

ئازادیی مرۆیی سنوور و ڕێسا و ڕێکخەرگەلێکی هەیە و لە سروشتی مرۆڤ و کۆمەڵگاکەیەوە سەرچاوە دەگرێت، دەبێت لێی تێبگەیت و ڕەچاوی سنوورەکانی بکرێت.

مرۆڤ و کۆمەڵگاکەی سیستمێکی ئاوێتەییە و ڕێسا و نەگۆڕ و ئەو سنوورانەی هەیە کە دەبێت ڕەچاو بکرێن، گەر لەبەرچاو نەگیردرێن ئەوا هەموو سیستمەکە هەرەس دەهێنێت. لەوەدا سیستمی کۆمەڵگای مرۆیی یەکسانە لەگەڵ سیستمی ناوەکی و

شانە و کەشکەشاندا (مەجەڕە)، واتای ئەوەش دەگەیەنێت کە لەوێدا لـە سـنوورێکی سروشتیی سیستمی کۆمەڵگای مرۆییدا بوارێك بۆ ئازادی و سەرپشکیی هەیە.

بۆ هیچ مرۆڤێك نییە مافی سەرپشکی و بەرپرسیارێتیی لـە مرۆڤێکـی تـر قەدەغـە بکـات، بـەڵام ئـەرکی کۆمەڵگایـە، تاکـەکانی بخاتـە بـەردەم بەرپرسـیارێتیی ئـەرك و بەرپرسیارێتییان، فێریان بکات و وشیاریان بکاتەوە، ڕێگەیان لەبەردەمدا بکاتەوە بۆ مومارەسـەی ئـازادیی ڕەوای خۆیـان، لەهەسـتان بەئـەرك و بەرپرسـیارێتییەکانیان و پابەندیان بکات بەمافەکانی کۆمەڵگا و سنووری سیسـتمەکەی و نـەگۆڕ و یاسـاکانی، وەك ئەوەی یاسـا و شـەریعەتی کۆمـەڵگا بـەپێی بنـەماکانی شـورا و دانـایی کۆمـەڵی ئوممەت بڕیاریان لەسـەر داوە، چـونکە کرۆکـی ئـازادیی توانـای ئەنجامـدانی ئـەرك و هەڵگرتنی بەرپرسیارێتییەکان و تواناداریيە لەسەر جڵـەوکردن و ناچـارکردنی دەروون بە ملکەچکردن بۆ حەق و هەڵسان بـە ئـەرکی جێنشـینێتی و ئاوەدانکردنـەوە بـەپێی ڕێگەی ڕاست و داد و چاکەکاری.

بۆیە لەشەریعەتی ئیسلامییدا ئازادیی ئـایین و بیروبـاوەڕ و فیکـر شـتێکی لـەخۆڕا نـەبووە، لـەخۆڕا نییـە کـە شـەریعەتو سـزاکان بـەدوای خەڵکییـەوە نـین لـەنهێنی و هەڵسـوکەوتی تایبـەتییان لـەوەی پەیوەسـتە بـە سروشـت و ئارەزوویانـەوە، ئـەوەی بەجێهێشـتووە بـۆ ویـژدان و پـەروەردەکردنی دەروون و پێداچـوونەوەی هەڵـە و خراپەکانیان، تەنیا لەسەر دەرخسـتنی تـاوان و ئـازاردانی ئـەوانی تـر لێپچـینەوەیان لەگەڵ دەکرێت، کاتێك خراپەکاریی ئاشکرا بکەن. شەریعەت سزای ئەوانە دەدات کـە بـەدوای عـەیب و ناتـەواویی خەڵکییـەوەن و نهێنییـەکانیان ئاشـکرا دەکـەن و دەیانترسێنن.

ئیسـلام لەگـەڵ هـەموو خـاوەن عەقڵـەکان یەکدەنگـە، لەسـەر ئـەوەی مەبەسـت بەئازادیی، واتا کردنەوەی بوار بۆ هەموو مرۆڤێك، تاوەکو بەپێی قەناعەتێك کە زیـان بە ئەوانی تر نادات، بەرژەوەندیی خۆی بەدیبهێنێت و مامەڵە بکات. واتا مەبەست لـە مومارەسـەی ئـازادی مرۆیـی، مەبەسـتێکی ئیجابییـە لـە سـنووری بەرژەوەندییـە

هاوبەشەکانی کۆمەڵگا، کە یاساکان بەپێی قەناعەتی کۆمەڵ و دیدگا کۆمەڵییەکەی لەسەر بنەماکانی شورای ئیسلامیی دانیپێدا دەنێن.

ئەوەی ئیسلام و کۆمەڵگاکانی جیهانی هاوچەرخ لەیەکتر جیادەکاتەوە، ئەوەیە تاکە ئایینێکە خاوەن پەیامێکی خوایی پارێزراوە و لە تۆڕێکی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی و لە مەودای ئێستا و دواتریدا نەگۆڕەکانی چاکسازیی و گشتییەکانی کۆمەڵگای مرۆیی بڕیار دەدات و دەچەسپێنێت، ئەوەش تەنیا لەلایەن خوای دروستکاری گەردوون و خاوەن زانستی گشتی و تەواوەوە بەدیدێت، بەو دروستکردن و داهێنانەی لەبوونەوەراندا ئەنجامی داوە، بەڵگەی بەڕاستخستنەوەشی، نیشانەکانی پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەر و ڕاستیی پەیامەکەیەتی بەدرێژایی هەموو کات و شوێنێك[1]: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ [فصلت: ٥٣]، واتە: ئێمە لەئایندەدا بەڵگە و نیشانەی سەرسوڕهێنەریان نیشان دەدەین، لە ئاسۆکانی بوونەوەردا و لە خودی خۆیشیاندا (بێگومان ئاشکرایە کە لەسەردەمی زانستیدا چەندە نهێنیەکانی بوونەوەر ئاشکرا بووە...زاناکان بەگشتی و زاناکانی ئەستێرەناسی سەرگەردانن لە وردەکاری و دامەزراوی و گەورەیی و فراوانی ئەم گەردوونە، هەروەها لە ئاڵۆزی جەستەیی و عەقڵیی و دەروونی ئادەمیزاد)، ئەمەش بۆ ئەوەی تا چەند بۆیان ڕوون بێت و دڵنیابن کە ئەم زاتە حەق و ڕاست و ڕەوایە، ئایا شایەتی پەروەردگارت بەس نیە کە بێگومان ئاگا و زانایە بە هەموو شتێك؟!

لەبەر ئەوەی هیچ چارەیەك لەوبەردەم ئەو ئوممەتانەدا نەبوو کە پەیامە شێوێندراوەکانیان سەرکزیکردوون، لەتێکەڵکردن و تێکچوونی توانای زانینی سنووری ئازادییەکانی سیستمی کۆمەڵگای مرۆیی، چونکە نەگۆڕیان نەبووە، هەروەها هەندەکییش توانای پەیبردنی هەمووەکی (کل)ی نییە و هەوڵەکانیش لەو بوارەدا

---

[1]- أبو سليمان، عبد الحميد أحمد."تأملات في ظاهرية ابن حزم وإعجاز الرسالة المحمدية"، مجلة التجديد، ماليزيا: الجامعة الإسلامية العالمية، السنة٢، العدد٣، ١٩٩٨م.

بێهودە کۆتاییهاتووە، ئەوروپاش بێتوانا بووە جێگرەوە بۆ ئەو میرات و نەریتانە دابنێ کە هی مەسیحییەت و ئیسلام بووە و دەستبەرداری بووەو هەموو مرۆڤێك هەوا و ئارەزووی بۆی بووەتە خواوەند و ڕوانین و قەناعەتپێکەریان بۆ تێکەڵ بووە و خراپەکارییان تێدا بڵاوبووەتەوە و خێزان هەڵوەشاوەتەوە و هێزی توندوتیژی و شەهوەت جڵەوی بۆ بەرەڵا بووە، هەموو مرۆڤێك بەپێی مەعریفە و ئارەزووی خۆی بڕیار دەدات چی وەربگرێت و چی وەرنەگرێت؟ بێ ئەوەی پێویستی بە زانیاری یان بەڵگە هەبێت، بەبێ ئەوەی توانای بەسەر مەعریفەیەکی متمانەدار بەسەرەنجامەکان یان لێپرسینەوەی شوێنەوارەکان دا بشکێت، ژیرەکانیش -لەپێش ئەوانی تر- وەهایان لێدێت، هەر ڕۆژەی بۆچوونیان هەیە، بەبێ هیچ ڕێڕوونییەك پێنج و شەش بە یەکدادەدەن.

ڕۆژئاواییەکان هەوڵیاندا چەمکی یاسای سروشتیی دەربخەن، بەڵام شکستیانهێنا، چونکە ئەوە دۆسیەیەکی گشتییە و تێڕوانینی هەندەکییانە دەرکی هەمووی ناکات، بۆیە تاوەکو ئێستا هەر ڕۆژە تیۆرێك دەهێنن و هەر ڕۆژە شتێك دەدۆزنەوە و لەهەر ڕۆژێکدا ڕێچکە و قوتابخانەیەك دەردەکەوێت. تەنیا شتی هەستپێکراویش بریتییە لە شوێنەواری خراپەکاری و توندوتیژی و تاوان و بێتوانایی لەناسینی نەگۆڕەکانی سیستمی کۆمەڵگای مرۆیی و سنووری پارێزگاریکردنی لەهەڵوەشاندنەوە و ئەو هەرەسەی کە زۆریی کەرەستە و ئامێر و چەکی سەخت و تفاقی زۆر لەو تیاچوون و هەرەسە نایانپارێزێت:﴿أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ كَانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا الْأَرْضَ وَعَمَرُوهَا أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَكِنْ كَانُوا أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ [الروم:٩]، واتە: ئایا بەسەر زەویدا نەگەڕاون، تا تەماشا بکەن و سەرنج بدەن چیمان بەسەر ئەو نەتەوانەی پێش ئەماندا هێناوە، لەمان زۆر بەهێزتر و بەدەسەڵات تر بوون، زەویان ژێرەوژوور دەکرد (واتە دەیانکێڵا بۆ کشتوکاڵ و کانزایان لێ دەردەهێنا) و ئاوەدانیان کردبۆوە زیاتر لەمان، پێغەمبەرەکانیشیان کاتی خۆی بەڵگەی زۆر و

ئاشکرایان بۆ هێنان؟ (بەڵام بێسوود بوو زۆربەیان بڕوایان نەکرد) جا وەنەبێت خوا ستەمی لێکردبن، بەڵکو هەر خۆیان ستەمیان لە خۆیان دەکرد.

ڕۆژئاوای ئەمڕۆ –بەپێی ئەو حاڵەتە کۆمەڵایەتی و ئەخلاقییەی تیایدایە– لەوپەڕی پێویستییدایە بە وەحی ئیسلامیی پارێزراو تاوەکو هاریکاری بێت لە ناسینی سنووری ئازادیی لەکۆمەڵگا و سنووری خۆی.

هەرچی ئوممەتی ئیسلامییە کە تاوەکو ئێستا پەیوەستە بە وەحی دابەزێنراو و بابەتە هەمەکیەکانیەوە، لەراستیدا چەقبەستنی فیکری و کەلتوورییەکەی و ئەوەی پێیگەیشتووە لە چەوساندنەوە و بەکۆیلەکردن و چەقبەستن زاڵە بەسەر چەمکی ڕاوێژ و ئازادیی لەکۆمەڵگاکانیدا،فیکری سەرپەرشتکاربوون و ملکەچیی دەروونی کۆیلەگەریی بۆ کردوەتە میرات، کە وەهای لێدەکات لەسەرەتاوە پێویستی بەرزگاربوون بێت لەڕووی فیکری و پەروەردەییەوە لەو فیکرە سەرکوتکارییە بەمیراتماوە، تاوەکو هەستی ئازادیی ڕاشیدی و ئازایەتیی ئەدەبیی پاڵنەرانە و دامەزراندنی کۆمەڵگای ڕاوێژ و دامەزراوەکانی بگێڕێتەوە، واتا گەلانی ئیسلامیی پێویستییان بەئازادیی ڕێکخستن و تۆکمەیی هەیە لە ڕووبەڕووبوونەوەی پێویستیی ڕۆژئاوا بۆ ڕێکخستنی ئازادی.

### کرۆکی سیستم و ڕێکخستن: نەریتگرتن و هەستی ڕێزداری و بەرپرسیارێتی:

سیستم و ڕێکخستن –لەڕووی پەروەردەییەوە– واتای زۆرکردن و سەرکزپێکردن و ترساندن و پاشکۆیەتی و گوێڕایەڵیی کوێرانە ناگەیەنن، بەڵکو بە پلەی یەکەم ڕاهێنانی دەروون و پەروەردەکردنێتی، لەسەر بەجێگەیاندنی مافەکان و هەڵگرتنی بەرپرسیارێتییەکان و دەستگرتن بەئیرادەی مرۆیی لەجڵەوکردنی دەروون و هێزەکانی و پاڵدانی ڕووەو ئەو ئاڕاستەیەی کە شیاو بە شکۆی مرۆڤایەتیی بێت.

لەو حاڵەتانەی کە وەها دەخوازن منداڵ سزایەکی جەستەیی بدرێت، ئەوا پێویستە لەچوارچێوەی بەرنامەیەکی چارەسەرییانەی پەروەردەییدا بێت لە مامەڵەکردن لەگەڵ

هۆکارەکانی حاڵەتەکە و لەوەی پەیوەستە بەژینگەی دەوروبەری منداڵەکە و ئەو هۆکارانەی بوونەتە هۆکاری ئەو حاڵەتە، چۆنیەتی مامەڵەی لێپرسراوانی پەروەردەیی پێشتری ئەو منداڵە.

لەحاڵەتی پێویستبوونی سزادانی جەستەییدا، پێویست دەکات سەرپەرشتیاری منداڵەکە (وەلی ئەمرەکەی) ئەنجامی بدات، ئەمەش دوای ئەوەی هەموو شێوازە ئەرێنییەکانمان بەکارهێنا: لەدوورگرتن و وشکی و لانەکردنەوە بەلایدا و پاشان تەمبێکردنی هەڕەشەییانە و بێبەشکردنی لەتایبەتمەندی و خۆشەویستی، ئەوەش گەر بەڕاست پێداگربین لەسەر سەلامەتیی دەروونی منداڵەکە و پارێزگاریکردنی شکۆ مرۆییەکەی.

لەبابەت سزای جەستەییدا دۆخی منداڵ لە دۆخی تازەپێگەیشتوو زۆر مەترسیدارترە، بچووککردنەوەی دۆخی منداڵ و لاوازدانانی شکۆداریی نییە، نابێت بەسووك بزانرێت و لەهەر هەڵەیەکی گەورە و بچووکدا سزای جەستەیی بدرێت، چونکە ئەو سزایانە لە قۆناغی پێکەوەنانی کەسێتیی منداڵدا شێوان و شوێنەوارگەلێکی خراپی وێرانکەر بەجێدەهێڵێت.

زاڵکردنی گرنگیپێدانی مەعریفیی بەئاخنینی لەسەری منداڵی تازەپێگەیشتوودا بەزانیاری و دەرخستنی، لەپاڵ گرنگیدانی کەم بەلایەنی دەروونی و ویژدانی، لاوازیی تێبینیکردنی شوێنەوارەکانی مەعریفەی دەروونی و ویژدانییەکانلەپێکهێنانی عەقڵییەتی تازەپێگەیشتوو لەڕووی دەروون و ڕەوشتیان، وەك بەو کەسەیە ئاوی سازگار بکات بەسەر کۆگای سووتەمەنییدا، بەو کارە جووڵە پەکدەخات و وزە لەنێو دەبات و هیچ سوودێك ناگەیەنێت.

بۆیە خۆشەویستیی ئەو گڵ و خاکەیە، کە پەیوەندییە کاریگەرە بەرهەمدارەکان تیایدا گەشە دەکەن، بەهۆیەوە دۆستایەتی و متمانە و خووپێوەگرتنی نێوان تازە پێگەیشتوو و پەروەردەکار دروست دەبێت.

بەئەندازەی پێداگریی پەروەردەکار لەسەر سوودی منداڵەکە و پەیوەندی بوون لەگەڵی و خۆشەویستیی بۆی و هاندان و ڕێزگرتن لەهەوڵ و تێکۆشانی، بەئەندازەی ئەوەی منداڵ پەیوەندیی بە پەروەردەکار و متمانەی و پێداگربوونیەوە هەیە، لەسەر ڕازیکردن و بەدەستهێنانی متمانەی، وەها دەکات منداڵ خاکێکی بەپیت بێت بۆ چاندن، ئەوەش ئەرکی پەروەردەکاری لێزان ئاسان دەکات بۆ گرتنی دەستی منداڵەکە و سەرخستنی بە پەیژەی تواناکانی ڕووەو باشتر و بەرزتر و شیاوتر.

## قۆناغە بنەڕەتییەکانی گەشەی منداڵ و سەرچاوەکانی مامەڵەکردن لەگەڵیدا:

پەروەردەکاری لێزان، پێش هەموو شتێك هەوڵی ناسینی سیفەت و توانا عەقڵی و دەروونی و ویژدانی و جەستەییەکانی منداڵ دەدات، تاوەکو دەستیبگرێت و لەو قۆناغەدا گەشە بەتواناکانی بدات و عەقڵییەتی پێکەوەبنێت و بونیادی دەروونی و ویژدانیی بۆ دروست بکات، لەپێناو چاندنی باشترین بەها و تەقاندنەوەی بەرزترین وزە لە سنووری تایبەتمەندیی منداڵ و توانا بیری و دەروونی و جەستەییەکانی، بەجۆرێك لە دەرەوەی توانای، ئەرکی نەخاتەسەر، هەروەك نەهێڵێت وزەکانیشی بەخۆڕایی بەفیڕۆبچن.

سروشتی منداڵی تەمەن خوار حەوت ساڵ بەوجۆرەیە کە بەدەم دووبارەکردنەوە و ڕاهاتنەوە بچێت، ئەو قۆناغەش تایبەتمەندە بەپێکهێنانی سادەترین شارەزایی و دووبارەکردنەوەی، تایبەتمەندە بە لاوازیی توانای وردبینیکردن و بەدواداچوون و بیرهێنانەوە، بۆیە گونجان و گفتوگۆ و یاریی لەگەڵداکردن و ئارامگرتن و دووبارەکردنەوە بناغەی پەروەردەی ئەو قۆناغەن.

گرنگە لەو قۆناغەدا منداڵ وابەستە بێت بە پەروەردەکارەکەی و خۆشەویستی و متمانەی پێ هەبێت، دەبێت پەروەردەکار هەنگاوەکانی جێگیربێت و بزانێت چی شتێك لەو منداڵە داواکراوە، تاوەکو لەبارەی منداڵەکەوە هەستی ئارامیی بێتەدی و هەلی نەریتگرتن و ڕاهاتنی بۆ بڕەخسێت، ئەوەش کاتێك دەبێت کە ئاڕاستەکانی

پەروەرەکار دژ و پێچەوانە بەیەکتر نەبێتەوە و ڕیسی ڕاهێنانەکانی نەپچڕێت، تاوەکو منداڵەکە ڕابێت و بزانێت چی شتێکی لێ ویستراوە.

پاشان قۆناغی ناسینەوەی باش و خراپ (التمیز) دێت لەنەمەنی نزیکەی حەوت ساڵییدا، ئەمەش پێویستی بە کەشێکی پەیوەندی خۆشەویستی و متمانە و دۆستایەتیی هەستپێکراو و گوزارشتکردن لێی بە ئامرازگەلێکی جیاواز. لەو قۆناغەدا پەروەردەکار زۆر ئارامگرانە بەردەوام دەبێت لە بەدواداچوون و ڕاهێنانی منداڵەکە لەسەر نەریت و شێوازە دروست و ڕەوشتە جوانەکان، لە مامەڵەکردن لەگەڵ دەورووبەری لەگەڵ گەورە و بچووك و ئاڕاستەکردنی ڕووەو ڕاهاتن لەگەڵ ئەوانی تر و بەشداریکردن و ڕێزگرتنی مافی ئەوانی تر و هاوکاریکردن لەگەڵیان و هەوڵدان بۆ بەجێهێنانی ئەرکەکان و بەستنەوەی هەست و دەستکەوتە ئیجابییەکانی، بەرادەی هێنانەدیی ئەو ئامانجانە لەڕەفتار و پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەوانی تردا.

لەگەڵ گەیشتنی منداڵەکە بەقۆناغی دە ساڵان -بە رادەی جیاواز- قۆناغی پێگەیشتنی جەستەیی و دەروونیی لا دروست دەبێت، ئەوکات پێویستە پەروەردەکار منداڵەکە ڕابهێنێت لەسەر هەڵگرتنی ئەرك و بەرپرسیارێتییەکان و گەڕانی ئیجابییانە بۆ پێشبڕکێ و جیاکردنەوەی ئیجابی و کردنەوەی ئاسۆی زانیارییەکان لەبەردەم خۆیدا، بۆ گەڕان بەدوای مەعریفە و تامەزرۆبوون بەدۆزینەوە و دەستهێنان و داهێنان و حەزکردن لە جیاکردنەوە و هەڵگرتنی مەترسییەکان، جا بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجانە، پێویستە هەموو ئامراز و کەرەستە توێژینەوەکراوەکان فەراهەم بهێنرێن، لەهەمانکاتدا پێداگریی بکرێت لەسەر ئەوەی منداڵ نەخرێتە مەترسیی و تێکشکاندنەوە. بۆیە خۆشەویستیی لە قۆناغی منداڵییدا، کۆڵەکەی پەروەردەی ساغ و سەرکەوتووانەیە، لەگەڵ دانانی پشکی شێر بۆ ڕاهێنان و ڕێکخستنی میتۆدی پەروەردەیی.

هەرچی قۆناغی هەرزەکارییە، ئەوە حەزی مەعریفە و قەناعەتخوازی و حەزی سەربەخۆبوون و ڕێگەگرتنەبەر بەگیانی دۆزینەوە و بەرزبوونەوە بەسەر دەروونی ئەو

منداڵەدا بەهێز دەبێت. لەوکاتەی کە ڕووبەڕووی گۆڕانکاریگەلێکی جەستەیی و دەروونی و ویژدانیی دەبێتەوە، کە پێشینەیەکی شارەزایی و مەعریفیی نییە لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییانەدا، وەهای لێدەکات شێواو بێت لەڕووی دەروونی و پەیوەندییەکانی و بەربەرەکانێی هەستەکان، بۆیە پاڵیدەنێن بۆ داخران و زاڵبوونی هەستی شەرم و خەجاڵەتیی بەسەریدا، یان بەپێچەوانەوە پاڵیدەنێن بۆ یاخیبوون و پێکدادان و لەدەست دەرچوون. لەڕێگەی پەیوەندیبوون لەگەڵی و سنگفراوانی و بواری هەستی سەربەخۆیی و دەستهات و دۆزینەوە و مەعریفەخوازی و چاودێری و فەراهەمکردنی کەشوهەوای پاك و بەدواداچوونی سۆزدارانە و ئاڕاستەکردنی ناسك و تێکەڵیی ساغەوە، دەکرێت ئەنجامگەلێکی ئیجابیی بەدەستبێت و بەهۆیەوە کرانەوە ڕووبدات و کۆنترۆڵی وزە و هێزە تەقێندراوەکان بکرێت لە قەوارەی ئەو منداڵەدا.

لەگەڵ پێگەیشتنی گەنج و وزە و حەز و بوێرییکردن لەڕەفتاری هەوراز و نشێوییەکانی ژیان، ئەوا متمانە و هاندان و ئەرك خستنەسەر کۆڵی گەنجان، ئەو شتەیە کە گەنج پێویستی پێ هەیە، تاوەکو شارەزاییەکانی پێکەوەبنێت و ڕێگەی ژیان بگرێتەبەر: وەك ئەندامێکی بەتوانای بەسوود و مرۆڤێکی داهێنەری تایبەتمەند بەدەستپێشخەری و وزەی ویژدانی و توانای هەڵگرتنی بەرپرسیارێتییەکان بەهێز و دەستپاکییەکی شیاو بە موسوڵمانی جێنشینکراو.

ڕەگەزی قەناعەتپێکردن و هاندان و ڕێزگرتن و بوارکردنەوە بۆ دەستپێشخەری و داهێنان و هەڵگرتنی بەرپرسیارێتییەکان، بناغەکانی لایەنی دەستەجەمعین لەبونیادنانی کەسێتیی ئیجابییدا. گەر پەروەردەکاران لەو قۆناغانەدا بەگرنگیپێدان و چاودێرییەوە مامەڵەیان لەگەڵ دەروونی منداڵ و گەنجان کرد، ئەوە سەرکەوتوو بوون لەبونیادنانی بازووەکانی هێز و توانا و دەستپاکی و بازووی چاك و چاکسازییان دروستکردووە، ئەگەرنا بەبێ ئەوە بوارێك بوونی نابێت بۆ لەدایکبوونی نەوەی هەڵگری پەیام و شوێنێك بوونی نابێت بۆ کۆمەڵگای بەهێز و دەستبازبۆ یەککگر و ڕاوێژ و شکۆ.

**سیفەتەکانی پەروەردەکاری سەرکەوتوو:**

پەروەردەکار گەر بیەوێت لەئەرکەکەیدا سەرکەوتوو بێت، ئەوا پێویستە خۆی پڕچەك بکات و بەرگی مەعریفە و خۆشەویستی و ڕێزگرتن بپۆشێت و خۆی پڕچەك بکات بە دادگەری و ئارامگرتن و تێکۆشان، ئەوە ئەو بناغانەن کە دەبێت بوونی هەبێت، لەپەروەردەکردنی عەقڵ و دەروونەکان و ئامادە بکرێن بۆ هەڵگرتنی بەرپرسیارێتییەکان، ئەوانەن کە لە هەموو ئوممەت و خاکێکدا کانزای دەروونەکان پێکدەهێنن: ((تجدون النَّاسَ مَعَادِن:خِيَارُهُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُهُمْ فِي الْإِسْلَامِ إِذَا فَقُهُوا))[١]، واتە: ((دەبینن خەڵکیی وەك کانزان: باشترینیان لەسەردەمی نەفامییدا باشترینیانە لەئیسلامدا گەر موسوڵمان بووبن و تێگەیشتبن)).

بۆیە پەروەردەی دروست و کانزای بەنرخ و بونیادنانی دەروونیی بەهێز، لەگەڵ سەرچاوەی سروشت و خۆڕسکی مرۆڤدا مامەڵە دەکات بەبێ ڕوانینە ئەوەی ئەم مرۆڤە لەسەردەمی نەفامیی و ئیسلامدا چۆن بووە.

ئیسلام و تێگەیشتن لە مەبەستە باڵاکانی، ئەو وزەیە ئاراستە دەکات و دەیخاتەکار ڕووەو خێر و خۆشی، بەڵام گەر بونیادنانی دەروونیی و ئەو وزە ویژدانییە ئامادە نەبن، ئەوا زانست و تێگەیشتن هیچ سوودێکیان نابێت لەپاڵدان بۆ کار و تێکۆشان مەگەر زۆر بەکەمیی نەبێت.

زانست و مەعریفە دوو شتی پێویستن بۆ سەرکەوتنی پەروەردەکار و پەروەردە، بەبێ زانست و شارەزایی بەدەروونی منداڵ و قۆناغەکانی پێگەیشتنی، ئەوا سۆز و خۆشەویستیی هیچ سوودێك ناگەیەنێت، بەڵکو ڕەنگە ئەو سۆز و خراپ پەروەردەکردنە هۆی لەدەستچوونی ئەو منداڵە بن، بۆیە دەستەوەستان و خۆپەرست و نەرجسیی پەروەردە دەبێت و ناتوانێت پەیوەندیگەلێکی ڕێك لەگەڵ کەسانی تردا دروست بکات، وەك دەڵێن: "دوژمنێکی ژیر باشترە لە هاوڕێیەکی نەزان". چەندە

---

[١]– البخاري. صحيح البخاري، مرجع سابق، ج٣، ص١٢٨٨، حديث رقم:٣٣٠٤، هەروەها بڕوانە: الشيباني، مسند الإمام أحمد بن حنبل، مرجع سابق، ج١٦، ص٤٦١، حديث رقم: ١٠٧٩١.

ورچی نەزان هەبووە بەهەموو خۆشەویستی و دۆستایەتییەکی بۆ هاوڕێکەی تاوەکو مێشێکی لەسەر سەری هاوڕێ خەوتووەکەی لابدات، نەوەك خەوەکەی لێ تێکبدات، بەمشتێ هاوڕێکەی خۆی کوشتووە.

دادگەریش ئەو بناغە پتەو و بەهێزەیە کە خۆشەویستی و ڕێز و کارایی ئاڕاستەکردنی نێوان منداڵ و پەروەردەکارەکەی لەسەر دەوەستێتەوە، چونکە دادگەریی سەنگی مەحەکی ڕاستیی هەستی پەروەردەکارە بەرانبەر منداڵ. منداڵ ناتوانێت گوێ بەدەربڕینی خۆشەویستی و دیمەنی ڕێزلێنان بدات، تاوەکو لە پەروەردەکارەکەیدا هەستی دادپەروەری و لایەنگیری نەکردن و جیاوازیی نەکردنی نێوان ئەو و منداڵێکی تر و کۆمەڵێکی تر نەبینێت.

ئارامگرتن و پەروەردە دوانەیەکی لەیەك دانەبڕاون، چونکە دەستەوەستانی و کەمتەرخەمی و ئەزموون و هەڵە و حەزی ئاگاداربوون و ئەزموونکردن، لە سیفەتەکانی منداڵین و دەبێت بەگیانێکی ئیجابییەوە لەلایەن پەروەردەکارەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، ئەوە ئەو نرخەیە کە پێویستە پەروەردەکار بیدات، تاوەکو منداڵەکە پێبگات، ئەوەش بە دووبارەکردنەوەی هەوڵەکانی و فێربوون لەهەڵەکان و دۆزینەوەی وزەی خۆی و دەوروبەری. بەبێ نەرموونیانی و ئارامگرتن، خۆشەویستیی بەرهەمی نابێت، تەنیا ئاڕاستەکردن سوود ناگەیەنێت، هیچ نەریتێك سەقامگیر نابێت و هیچ ڕەفتارێك ڕاست و دروست نابێت و هیچ توانایەك گەشە ناکات بەبێ نەرموونیانی و ئارامگرتن.

بەبێ تێکۆشان و پێداگریی لەسەر چاودێریکردنی منداڵ و فەراهەمکردنی پێداویستییەکانی، ئەوە خۆشەویستی و ڕێزلێنان و داد بوونی نابێت، بەخۆشەویستی و هەوڵ و ئارامگرتنەوە بەهەشت کەوتووەتە ژێر پێی دایکانەوە[1] و بەو دوانە دایکان و باوکان مەقامی چاکەکاری و جوان هاودەمییکردنیان بەدەستهێناوە[1].

---

[1] - گێڕدراوەتەوە لە فەرموودەیەکی موعاویەی کوڕی جاهیمەوە کە هاتووەتە لای پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) و وتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا دەمەوێت بەشداری جیهاد بم، هاتووم ڕاوێژت پێ بکەم و

هەڵبژاردنی مامۆستای باش بۆ منداڵان و ڕێزلێنانیان، بەگرنگترین ئەرکێکی باوکان و کۆمەڵگا دادەنرێت. ئەو ئوممەتانەی کە جوان پەروەردەی دایکان دەکەن و پێگەیان بەرز دادەنێن و مامۆستاکانیان تایبەتمەندە، ئەوا وەچە و پیاوانیشیان تایبەتمەند دەبێت. ئەو ئوممەتانەش کە پێگەی ژنانیان تیادا سووك و کەمە و پەروەردەکردنیان نزمە، جۆری مامۆستا و پێگەکانیشیان نزمە و لە نرخیان کەم دەکرێتەوە، ئەوە ڕۆشنبیریی و ڕەوشت و توانای ڕۆڵەکانیشی نزم دەبێت. باوکان و ئوممەتان هیچ وەبەرهێنانێك ئەنجام نادەن گرنگتر و گەورەتربێت لە وەبەرهێنانیان لە بواری پەروەردە و فێرکردندا.

پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) لەماڵی خۆی و لە مزگەوت و وتار و ئاڕاستە و ڕێنیشاندان و ڕێنمایی و هاوەڵێتیکردنیدا نموونە و پێشەنگ بوو بۆیە لەپێشتر و شیاوترە بە موسوڵمانان لەوانەکانی ڕێباز و گوتاری پەروەردەیی پێغەمبەرێتیی تێبگەن لەبابەت ئافرەت و منداڵ، تاوەکو لەسەر نرخ و بەرزیی و هێزی ئیمان و تێکۆشانی کاری چاك و پوختەکردن، نەوەکانی موسوڵمانان بونیاد بنرێنەوە.

---

پرسی تۆ وەربگرم؟ پێغەمبەریش فەرمووی: ((ئایە دایکت هەیە؟ وتی: بەڵێ. ئەویش فەرمووی: دەستی پێوە بگرە و خزمەتی بکە، بێگومان بەهەشت لەژێر پێیەکانیدایە)). هەروەها بڕوانە:

– النسائي. المجتبى من السنن، مرجع سابق، ج٦، ص١١، حديث رقم: ٣١٠٤، والحاكم في المستدرك، وصححه واوفقه الذهبي، وأقره المنذري.

[1] - ئەلشەیخان گێڕاویانەتەوە کە پیاوێك هاتووە بۆلای پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) و وتوویەتی: ((ئەی پێغەمبەری خوا چی کەسێك لەپێشترە چاکەی لەگەڵدا بکەم؟ فەرموویەتی: دایکت. وتوویەتی: پاشان کێ؟ فەرموویەتی: دایکت. وتوویەتی: پاشان کێ؟ فەرموویەتی: دایکت. وتوویەتی: پاشان کێ؟ فەرموویەتی: باوکت.)). بڕوانە:

– البخاري، صحيح البخاري، مرجع سابق، ج٥، ص٢٢٢٧، حديث رقم: ٥٦٢٦.

– القشيري، صحيح مسلم، مرجع سابق، ج٤، ص١٩٧٤، حديث رقم: ٢٥٤٨.

**یەکەم: نهێنییەکانی شەریعەت لە بونیادنانی خێزاندا: بنەما و بەرنامە:**

گەر ئامانجەکانی بەرزەکانی پەروەردەی ئیسلامی بریتی بێت لە بونیادنانی (بڕواداری ڕاستگۆ) و (جێنشینی چاودێر) و (بەهێزی ئەمین). ئەوا ئەم ئامانجانە بە وزەی قەناعەتی ئیمان و هەستکردن بە بەرپرسیارێتی جێنشینی و بوێری دڵ و بەرزیی ڕاستگۆیی و ئەمانەت و ئەداکردنی جوان و وردەکارییکردن لە کاردا نەبێت نایەنەدی. ئەمانەش نیشانەگەلێکن کە لە منداڵیدا بونیاد دەنرێت و لە بناغەی پێکهاتنی ویژدانییانەی مرۆڤدا پێکدێت، لەبەر ئەوە خێزان و سەلامەتی پەیوەندی خێزانی، بریتییە لە بناغەی بنەڕەتی بەرنامەی پەروەردەیی پێغەمبەر بۆ منداڵ و ئامانجی گوتارەکەی. لەو سۆنگەیەوە کە خێزان یەکەمین و بایەخدارترین باوەشە بۆ منداڵ، لەڕووی دەروونی و ماددییەوە، چونکە کاتێ لەدایك دەبێتتوانای بەدەستهێنانی پێویستییەکانی و پاراستنی خۆی بەبێ چاودێری خێزان نییە کە پێداویستییە ماددیی و سایکۆلۆژییەکانی بۆ دەستەبەر دەکات و چاودێریی منداڵێتییەکەی دەکات، لەبەر ئەوە بونیادنانی خێزان و جۆری پەیوەندییەکانی لە گرنگترینی ئەو ڕەهەندە پەروەردەییە مرۆییانەیە، کە جۆری بونیادنانی کارەکتەری مرۆیی لەسەر بەندە.

ئیسلام و قورئانی پیرۆز و پێغەمبەری ئیسلامیش گەورەترین بایەخیان بە خێزان و پەیوەندییەکانی داوە و بە کرۆکی بنەڕەتی پێکهێنانی تاك و کۆمەڵگا هەژماریان کردووە، لەبەر ئەوە ئاشنابوون بە دیدی ئیسلامی لە بونیادنانی خێزان و پەیوەندییەکانی تاکەکانی کارێکی گرنگە، تا بتوانین پایەکانی لەسەر ئەو بناغە دروستانە دابمەزرێنین، کە شوێنێکی دروستی پەروەردەیی بۆ بونیادنانی منداڵی موسوڵمان مەیسەر بکات و هەندێك لەوە لاببەین کە پێوەی لکاوە لە چەند لادانێك کە نەریتەکان داویانەتە دەمی و هەلومەرج و لێڵی بینین و دۆگمابوونی فیکریش هاوکاریان بوون، بەتایبەتیش لەم قۆناغەدا کە موسوڵمانانی پێدا تێپەڕدەبن و ئەو تەحەددایانەش کە لەمرۆدا ڕووبەڕوویان دەبینەوە.

خوای پاك و مەزن دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ (٢١)﴾(الروم:٢١)، ﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا (٧٤)﴾ (الفرقان: ٧٤)، ﴿ وَإِذْ قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ وَهُوَ يَعِظُهُ يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ (١٣) وَوَصَّيْنَا الْإِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ (١٤)﴾ (القمان: ١٣-١٤)، ﴿ وَوَصَّيْنَا الْإِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ إِحْسَانًا حَمَلَتْهُ أُمُّهُ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا حَتَّى إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِي إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ الْمُسْلِمِينَ (١٥)﴾ (الاحقاف: ١٥)، ﴿وَقَضَى رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِنْدَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُلْ لَهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا (٢٣) وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُلْ رَبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا (٢٤)﴾ (الاسراء: ٢٣-٢٤).

پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: ((ان من اكمل المؤمنين ايمانا احسنهم خلقا وألطفهم بأهله))[1]، واتە: ئەو بڕوادارەتان ئیمانەکەی تەواوە کەرەوشتی زۆرباش بێتو بەسۆزتر بێت بۆ کەسوکاری.

لەفەرموودەیەکی دیکەدا هاتووە، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: ((خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لأَهْلِهِ، وَأَنَا خَيْرُكُمْ لأَهْلِي))[2]، واتە: باشترین کەستان ئەوەتانە بۆ کەسوکاری چاك بێت و منیش باشترینتانم بۆ کەسو کارم.

---

[1] - رواه احمد، بڕوانە: الشيباني، مسند الامام احمد بن حنبل، مرجع سابق، ج٤٠، ص٢٤٢، حديث رقم: ٢٤٢٠٤.

[2] - رواه ابن ماجة في سننه والترمذي في جامعه، بڕوانە:

- القزويني، سنن ابن ماجة، مرجع سابق، ج١، ص٦٣٦، حديث رقم: ١٩٧٧.

- الترمذي، الجامع الصحيح، مرجع سابق، ج٥، ص٧٠٩، حديث رقم: ٣٨٩٥.

موسليم لەئەبوهورەیرەوە (خوا لێی رازی بێت) گێڕاویەتیەوە، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: "تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لِأَرْبَعٍ: لِمَالِهَا ولِحَسَبِهَا ولِجَمَالِهَا ولِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ"[١]. واتە:"لەبەر چوار مەبەست ئافرەت دەخوازرێت: بۆ ماڵ و سامانەکەی، لەبەر بنەماڵەکەی، لەبەر جوانیەکەی، لەبەر دینداریيەکەی، جا تۆ ئافرەتی دیندار بهێنە، تا دەست پڕ بەرەکەت بیت".

سەعیدی کوڕی مەنصور لەپێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: "إذا جاءكم من ترضون دينه وأمانته فزوجوه، إلا تفعلوا تكن في الارض فتنة وفساد كبير"[٢]. واتە: ئەگەر داخوازیکار هات لەئاینو ئەمانەتپارێزی رازی بوو ئەوا ئافرەتەکانیان لێ مارە بکەن، ئەگەر وانەکەن ئاشوبو خراپەی گەورە لەسەر زەویدا بڵاو دەبێتەوە.

ئەحمەدو ئەبو داودو نەسائیو گێڕاویانەتەوە، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: "تزوجوا الودود الولود فإني مكاثر بكم الامم يوم القيامة"[٣]، واتە: ئافرەتی نەرمونیان کەمناڵی زۆر ببێت بهێنن چونکە لەرۆژی قیامەتدا ئومەتەکەمتان پێ زۆر ئەکەم.

بوخاریو موسلیم لەئیبن عومەرەوە (خوا لێی رازی بێت) گێڕاویانەتەوە وتوویەتی: گوێم لەپێغەمبەر خوا (درودی خوای لەسەر بێت) بوو دەیفەرموو: " كُلُّكُمْ

---

[١] - رواه البخاري ومسلم عن ابي هريرة(رضي الله عنه) ، بڕوانە:

– البخاري، صحيح البخاري، مرجع سابق، ج٥، ص١٩٥٨، حديث رقم: ٤٨٠٢.

– القشيري، صحيح مسلم، مرجع سابق، ج٢، ص٦٢٥، حديث رقم: ٢٠٥٠.

[٢] - رواه سعيد بن منصور في سننه عن ابن هرمز الصنعاني (رضي الله عنه)، بڕوانە:

– البزاز، سعيد بن منصور، سنن سعيد بن منصور، تحقيق: حبيب الرحمن الاعظمي، بيروت: دار الكتب العلمية، ط١، ١٩٨٥م،، ج١، ص٨٣، حديث رقم: ٥٩٠.

[٣] - رواه ابو داود فی سننه، بڕوانە:

– السجستاني، سنن ابي داود، مرجع سابق، ج١، ص٦٢٥، حديث رقم: ٢٠٥٠.

رَاعٍ وكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِه، فَالإمام رَاعٍ، و مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِه، والرَّجُلُ في اهله رَاعٍ وهُوَ مَسْئُولٌ عَنْ رعيته، والْمَرْأَةُ في بين زوجها رَاعِيَةٌ ، وهِيَ مَسْئُولَةٌ عَنْ رعيتها، والْخادم عفي مَالِ سَيِّدِهِ رَاعٍ وهُوَ مَسْئُولٌ عَنْ رعيتهُ"، واته: ئاگاداربن كه هەمووتان چاودێر و شوانن، هەموشتان بەرپرسیارن لەژێر دەستەكانتان، كاربەدەستی خەڵكی شوانەو بەرپرسیارە لە ژێر دەستەكانی، پیاویش شوانی ماڵ و خێزانەكەیەتی و بەرپرسە لێیان، ئافرەتیش شوانی ماڵی مێردەكەی و منداڵەكانیەتی و بەرپرسیشە لێیان، خزمەتكاریش شوانە بەسەر ماڵی گەورەكەیەو بەرپرسە لێی.

دەڵێت ئەوانەم لەپێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) گوێ لێ بوو، وا دەزانم پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) فەرمووشی: "والرجل فى مال ابيه راع ومسؤل عن رعيته أَلَا فَكُلُّكُمْ رَاعٍ وكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِه"[1]، واته: پیاو لەماڵی باوكیدا چاودێرەو بەرپرسە لەوەی لەژێر چاودێریدایە، هەمووتان چاودێرنو بەرپرسن لەوەی لەژێر چاودێریتانایە.

ئەم بایەخدانەی ئیسلا بە خێزان، كە یەكەم ئامێز و گرنگترینە لە بونیادنانی مرۆڤدا، هیچ سەیر نییە، چونكە مرۆڤ ڕێزدارترینی دروستكراوان و جێنشینە لە زەویدا، لەبەر ئەوە پێویستی بە پەروەردەكردن و ئامادەكردنە، منداڵێتی دەروونی و جەستەیشی درێژخایەنە، بەڵكو درێژترین جۆری قۆناغی منداڵییەتییە لە بوونەوەرە زیندووەكاندا، كە نزیكەی بیست ساڵ دەخایەنێت بەر لەوەی هێشتا خۆی بگرێت و بونیادە دەروونی و جەستەییەكەی پێبگات، لەم ماوەیەشدا لەژێر چەندین جۆر لە چاودێریی و سەرپەرشتی و پەروەردە و ڕاستكردنەوە و ئاڕاستەكردن و فێركردن و ڕاهێناندا دەبێت.

---

[1] - رواه البخاری ومسلم عن ابن عمر (رضي الله عنه)، بڕوانە:

– البخاري، صحيح البخاري، مرجع سابق، ج٢، ص٩٠٢، حديث رقم: ٢٤١٩.

– القشيري، صحيح مسلم، مرجع سابق، ج٣، ص١٤٥٩، حديث رقم: ١٨٢٩.

لەبەر ئـەم هۆكارانـە تێدەگـەین بۆچـی شـەریعەتی ئیسـلامی ئـەم هـەموو بایەخـە زۆرەی بــە بونیادنــانی خێــزان داوە، بۆچــی بونیادنــان و ڕێنمــایی و ئاڕاســتەكردنی بەگوێرەی ئەوەیـە كـەفیترەت و پەیوەندییـە مرۆییـەكان لـە دایكایـەتی و باوكایـەتی دەیخوازێــت، هــەروەها بۆچــی خێزانــی ئیســلامی لەســەر ئــەو بنــەما فیترەیــی (خۆڕسكانە)یانە لە دەروونی مرۆییدا دامەزراوە كە سیمای جێگیرییـان هەیـە، لەبـەر ئەوە تەشریعی ئیسلامی بە تێروتەسەلی باسی كردووە، بە جۆرێك كـە بڕیـار لەسـەر بنـــەما جێگیرەكـــانی بونیادەكـــەی دەدات و ئـــەو پەیوەندییانـــەی تاكەكانیشـــی دیاریدەكات، كە لەسەر جێگیرەكانی ئەم بونیادە خۆڕسكە وەستاون.

لەبــەر ئــەوە نــاتوانین لــە یاســای ئیســلام بــۆ خێــزان تێبگــەین و ئاشــنای حیكمەتەكەشی نابین ئەگەر لـە لایەنـە خۆڕسـكە سـوننەنییەكان: (الجوانـب الفطريـة السـننية)ی پێكهاتەكـەی حـاڵی نـەبین، كـە ئەركەكـەی لـە بەرامبـەر ئەندامـەكانی و سروشــتی ڕۆڵــی تــەواوكاریان دیــاری دەكــەن. لەراســتیدا فەرامۆشــكردنی لایــەنی لێكۆڵینــەوەكانی یاســا فیترەتییــەكان لــەپێكهێنانی خێــزان و بەدەمــەوەهاتنی خواستەكانی دەتوانن ئەو كەموكووڕییـە ڕاڤـە بكـەن كـە زۆرێك لـە یاسـا ئیسـلامییە هاوچەرخەكان پێـوەی گـیرۆدەن، لـە بەدواداچـوونی گۆڕانكارییـەكان و تێبینیكردنـی ڕادەی كاریگەرییان لـەو شـێوازەی كـە تاكـەكانی خێـزان ڕۆڵـی خۆیـانی تێدا بـەجێ دەگەیەنن.

درك نەكردن بەپرەنسیپی ئیسلامی لە كـامڵبوونی تاكـەكانی ڕەگـەزی مرۆییـدا بـە گشتی و، ڕۆڵی ئەندامانی خێزان بەشێوەیەكی تایبەت، دەبێتە مایەی تێنەگەیشتن لە بونیـادی خێزانـی موسـوڵمان و، دركنـەكردنی ئـەو ڕۆڵانـەی هـەموو ئەنـدامێك تێیـدا دەیبیـنن، لەبـەر ئـەوە ئـەو كەسـە هەڵـە دەكـات كـە باسـی هاوشـێوەیی لـە ڕۆڵـی لایەنـەكانی پەیوەنـدی خێزانییـدا، چـونكە ئـەوە دەسـتپێكێكی هەڵەیـە لـە ڕووی حەقیقــەتی فیترییــەوەو، شێواندنیشــە بــۆ وەزیفــەی خێــزان و، ستەمیشــە لــە پێویستییەكانی لایەنەكانی پەیوەندییەكە و مافەكانیان.

ئـەو گونجـان و تەواوكارییـەی كـەهاوكاری و چـاودێری و خۆشەویسـتی و بـەزەیی لەنێوان دایك و باوكدا دێنەدی –نێر یـان مـێ بێـت– ئـەو دوو بناغەیـەن كـە خێزانـی مرۆییان لەسەر بونیاد دەنرێت، گەر پەیوەندی تەواوكاری و هاوكاری و خۆشەویسـتی و بەزەییش لەنێوان دایك و باوكدا نەبوو، ئەوا بنەماكانی پەیوەندی دایـك و باوكـەكان بە ڕۆڵەكانیانەوە تێكدەچێت، چونكە ئەوەی هـیچ شـك نـەبات هیچـیش نابەخشـێت، منداڵیش لە ئاشتی و ئاسایش و چاودێریی و پەروەردەی پێویستی بونیادی دەروونی و مەعریفیی دروستی خۆی بەهرەمەند نابێت كاتێك نەبێت كە هەموو تاكێك لەخێزاندا پێویستی خۆی بەدەست بهێنێـت و بـەگوێرەی توانـای خۆیشـی ڕۆڵـی خـۆی ئـەنجام بدات، ئەمەش كەش و هەوایەكی دەروونی دروست بۆ تاكەكانی خێـزانو منالـەكانیان فەراهەم دەهێنێت كە هەست بە ئاسایش بكەن، گەشە بەوزە و تواناكانیشیان بدەن.

لاوازیــی جەســتەی ژن و ناســكییە ســۆزدارییەكەی، بــەراورد بــە پیــاو، لەگــەڵ وابەستەبوونی منداڵ لەڕووی ماددی و دەروونییەوە بەئلفرەتەوە، ئەمە وا لـەو ژنـە و منداڵەكەشی دەكات پێویستیان بە چاودێریی و پشتگیری بێت. لەبەرامبەر ئەمەشدا و وەك قەرەبوویەك، لاوازی پیـاو لـە بەرامبـەر سێكسـدا بـوونی هەیـە، بـەراورد بـە ژن، چونكە ژن لە زاڵبوونیدا بەسەر ئارەزووەكانیـدا، پارێزگـاری لـە خـۆی و منداڵەكەشـی دەكات، بەوەش خوا جڵەوی بڕیـاری سێكسـی ئەقڵانیبوونەكـەی داوەتـە دەسـت ژن، هەر بۆیە لە پەیوەندییدا بە پیاوەوە، ئامادەبوونی پیاو یان ڕواڵەتی كاریگەری لەسەر بڕیارە ئەقڵانییەكەی نابێت، بەڵكو ژن بـەردەوام توانـای بڕیـاردانی خـۆی بـەگوێرەی ئیرادەی خۆی و ئەوەی بەرژەوەندی خۆی تێدا دەبینێتەوە دەتوانێت بدات.

لەبـەر ئـەم ڕاسـتییانە لـە بـوونی ژن و پیـاودا، بـۆ ئـەو بەرژەوەندییانەشـیان كـە تێیدایـە، شــەریعەت پەیوەنــدی هاوســەرگیری و ڕەچــەڵەكی لەســەر بناغەیــەك لــە تایبەتمەندێتی داناوە، بەوەش ئینتمای منداڵ بۆ پیاو دێتەدی، وەلائی پیاویش بۆ ژن و منداڵ لەسەر بناغەی ئەم ڕێكخستنە حەكیمانەیەش پیاو –بەو توانایەی كاركردن و خۆڕاگرتنەی لەبەردەم سەختییەكاندا كە خوا پێی بەخشـیوە– بەرپرسـیارێتییەكانی

مێینــە و منـداڵ هەڵـدەگرێت، لەسـەر بنـەمای ئـەم تایبەتمەندێتییـە و ئـەم ئینتمـا و دڵسۆزیی و وەلائەش، پەیوەنـدی نێـوان ژن و پیـاو دامـەزراوە، لەسـەر بناغەیـەك لـە خۆشەویســتی و بــەزەیی، تــا خێــزان ببێتــە ئــامێزی خۆشەویســتی و ئاســایش بــۆ ڕۆڵەکانی.

هێز و توانای پیاو و خۆڕاگریی و خاڵیبوونی لەسەرقاڵیی دایکایـەتی مێینـەیی، لـە پەیوەندی خێزاندا، هێزێکی رەخساوە بۆ دابینکردنی پێویسـتییەکانی ژن و منـداڵ و چاودێریکردنیان. نەرمی و سۆزی ژنیش حەسانەوە و ڕەحمەت و ئارامگەیە بۆ منداڵی لاواز و پیاوی شەکەت، لەبەر ئەوە مەسرەف و خەرجی لەخێزاندا بە پیاو سپێردراوە، ژن بە ویستی خۆی نەبێت کار ناکات، بەگوێرەی حاڵی خۆی و وزە و تواناکەی و ئـەو قۆناغەی پێیدا گوزەر دەکات و سروشتی ئەو کارەی بۆی ڕەخساوە، هەر ستەمێکیش لەگەڵیدا لەو بارەیەوە یان فێڵکردن لە مافەکانی، فێڵ و ستەمن بۆ ئەو و مافی ئـەو لـە یاریدەدان و لە چاکەکارییدا.

ئەم فیترەتەش چەمکی ئیسلامی لەبارەی ڕادەی عەورەتی پیاو و عـەورەتی ژن و حیکمەتەکەیەوە ڕاڤە دەکات، کە ستەم نییە لە ژن، بەڵکو چـاودێری و پاراسـتنە بـۆ هەردوو لایەنەکەی خێزان، عەورەتی پیاو سنووردار (کەمە) بۆ ئاسانکاریی کـارکردنی پیاو بەبێ بوونی ترس لە فیتنەی ژن، یان کەمتەرخەمیکردن لە مافەکانی دایکایـەتی لە خێزاندا، بەڵام کە عەورەتی ژن جوانییەکانی جەستەی و داپۆشینیان دەگرێتـەوە، ئـەوا بـۆ پاراسـتنیەتی لـە سـنوور بەزانـدنی پیـاوان و دوژمنکارییـان بـۆ سـەر ڕۆڵـی دایکایەتییەکەی، کە لەهەمان کاتدا مایەی پاراستنی پیاویشە لە فیتنە و زیانگەیاندن بە خێزانەکەی و ئەو مافانەی کەلەسەریەتی.

ئەم ئامانجە باڵایانـە لەمەبەسـتە ویسـتراوەکانی جیـاوازی نێـوان عـەورەتی ژن و عــەورەتی پیــاوە، لــە فیترەتــی هەریەکێکیانــەوە سەرچــاوە دەگرێــت و بــە دەم خواستەکانیانەوە دەچێت، بەهۆی سروشتی پەیوەست بە ڕۆڵی هەریەکەشـیان. هـەر لەوانە حیکمەتی ڕێگرتن لە فرەیی بۆ ژنیش، چونکە خێزان دادەڕمێنێت و وەچـە ون

دەکـات و ڕۆڵـی باوکایـەتی دەسـڕێتەوە، ژن تـەنیا بەیـەکجار دووگیـان دەبێـت و دووگیانبوونەکەشی لەیەك پیاوە بەتەنها. بەڵام حیکمەتی ڕێگەدان بە فرەیی ژنـی بـۆ پیاو لەبەرئەوەیە کە نەسەب نەفی ناکات و خێزانیش ناڕووخێنێت، بـەڵکو خێزانـەکان فرە دەکات، لەگەڵ ئەوەدا فرە ژنـی بـۆ پیـاوان بـەبێ پێویسـتبوون لـە پاڵنـەرەکانی خۆشەویستی و سازان و دڵسۆزی خێزان نییـە، بـەڵکو لەگـەڵ خۆیـدا مەترسـییەکانی دڵپیسـی و کینـە لـەنێوان ژنـان و ڕۆڵـەکانیان هەڵـدەگرێت، لێـرەوە پیـاو –بـە هـیچ شێوەیەك– لە ڕووی دەروونی و خێزانییەوە لە قازانجیدا نابێت، مەگەر ئەو فرەییە بۆ پێویسـتییەکی ڕاسـتەقینە بێـت، کـە پەیوەنـدی بـە ژیـانی تـاك یـان قـەوارەی موسوڵمانانەوە هەبێت.

خێـزان بەمـە لەسـەر خۆشەویسـتی و ڕەحمـەت بونیـاد دەنرێـت، لـە هەسـت و نەسـتەکاندا لەسـەر خۆشەویسـتی دەبێـت، لـە تـەکلیف و داواکارییەکانیشـدا لەسـەر ڕەحمەت دادەمەزرێت، ئیتر خێزان داوایەکی بەزۆر و ناچارییانە لە ژنەکەی ناکات کـە لەتوانایدا نەبێت، نە ژنیش ئەوەی لە مێردەکەی دەوێت کە لە وزەیدا نییە، وەك چۆن حەق نییە هیچ کەسێکیش لە هاوسەرەکان ناچاربکرێن بەبێ حـەز و ئـیرادەی خۆیـان بمێننەوە، لەبەر ئەوە ئیسلام ڕێگەی بە تەڵاق داوە بۆ پیاو و خـولعیش بـۆ ژن، گـەر ناکۆکی کەوتە بەینیان، لەو سۆنگەیەوە کە نەمانی خۆشەویستی و ڕەحمەت لـەنێوان ژن و مێرددا زیانی لە جیابوونەوە زیاترە بۆ سـەر دەروونـی خۆیـان و ڕۆڵەکانیشـیان. هـەروەها لەدەسـتدانی یـەکێك لـە دایـك و بـاوك لـە قۆنـاغێکی دیـاریکراودا لـە ژیـانی منداڵدا، ئاسانترە لەوەی لەگەڵ دایك و باوکێکدا بژی کـە لـە ململانـێ و ڕق و کینـە و زبری و ناکۆکیدابن.

لەبەر ئەوە ئیسـلام گرنگـی پێـداوە، قورئـانیش بـە وردی ئامۆژگارییـان دەکـات و هۆشیاری دەدات ژن و مێرد سەبارەت بەسروشتی پەیوەندی نێوانیانو مافـو ئـەرکی هەریەکێکیشیان، بەخۆشەویسـتیو ڕەزامەنـدیو دەسـتبار بۆیەکگرتنیشـەوە ئـازادی هەڵسوکەوتکرن لەخۆیان و ماڵ و موڵکیان بـەبێ هـیچ کێشـەیەك پێـداون، بـەجۆرێك

کەتاوان و فێڵ و کەمتەرخەمی لە ئەرکەکاندا تێدا نەبێت، هەروەها فێریکردوون و ڕێنمایی کردوون بۆ ڕێگاکانی چارەسەری ناکۆکییەکان و تێپەڕاندنی لادانەکان بەر لە پەنابردنە بەر جیابوونەوە و ڕماندنی خێزان و ئازاردانی منداڵ بە تەڵاق، یان خولع، حیکمەتی لەیەکتر ڕازیبوونیش –بەوەی خولعەکە زیاتر نەبێت لەوەی مێرد پێشکەشی ژنی دەکات لە مارەیی – تا ماڵ نەبێتە هۆی داواکردنی تەڵاق یان خولع لەلایەن ژنەوە، یان کەسێك کاریگەری لەسەر ژنەکە هەبێت لە کەسانی نزیك بۆ جیابوونەوە و ڕماندنی خێزان، ئەو ژنە ئەوە بۆ پیاوەکە دەگەڕێنێتەوە کە پێشکەشی کردووە، لەو کاتەدا جیابوونەوە نابێتە هۆکارێك بۆ دەستکەوتێك. بەڵام لە حاڵەتی تەڵاقدانی ژن لەلایەن پیاوەوە هیچ خەڵاتێکی ماددی بۆ پیاوەکە نابێت، بەڵکو لە ڕووی ماددییەوە سزا دەدرێت، بەهۆی پێدانی مارەیی و لەخۆگرتنی مەسرەف (نەفەقە)، سەرەڕای ئەوەش کە دوای ئەوە بەرپرسیارێتییەکانی دواتری پێکەوەنانی خێزانێکی نوێی دەکەوێتە ئەستۆ.

لەراستیدا خێزان لە سیستمی ئیسلامیدا بریتییە لەو دەزگا کۆمەڵایەتییە بنەڕەتییەی هۆکارە بنەڕەتییەکانی بوون بۆ مرۆڤ دەستەبەر دەکات، ئیسلام سیستمێکی تایبەتی بۆ داناوە کە لەگەڵ ئەرکەکەیدا گونجاو بێت، بەهەر ئەندامێکیش ئەرك و پێگەیەکی سپاردووە، کە لەگەڵ ئەو ڕۆڵ و پێویستییەیدا بگونجێت، کە لەسەر خۆشەویستی و ڕەحمەت و ڕێزی ئاڵوگۆڕکراو بونیاددەنرێت.

## ڕۆڵی تاك لەنێوان خێزان و کۆمەڵگادا:

تێکەڵاوکردنی ڕۆڵی تاکەکان، وەك ئەندام لەخێزاندا، لەگەڵ ڕۆڵیاندا لە کۆمەڵگا و دەزگایەکانی دیکەدا، بوونە مایەی زۆرێك لە بەدحاڵیبوون و ناکۆکی نێوان ڕۆڵەکان و بەزایەدانی وزەکان و دەستدرێژیکردن بۆ سەرمافەکان.

پێگەی باوك و شوێن و سەنتەرەکەی لە خێزاندا، پێگە و شوێن و مەڵبەندی دایك لەخێزاندا، پێگەی کوڕو شوێنی لەخێزاندا، هیچ یەکێکیان پەیوەندییان بە پێگەی

ئەوانی تر و شوێنی لە دامەزراوەکانی دیکەی کۆمەڵگادا نییە. بۆ نموونە پەیوەندی باوکایەتی بە کوڕەوە لەخێزاندا پەیوەستە بە باوکایەتیی و شوێنییەوە لە دەروونـدا کەتا چەندە خۆشەویست و ڕێزدارە. لەکاتێکدا کە شوێنی هەریەکێك لە ئەندامانی خێزان لە کۆمەڵگاشدا پەیوەستە بەتوانا و وزەکانیەوە کەلەوانەیە تواناکانی کوڕ لەسەروی تواناکانی باوکی یان دایکییەوە بێت.

بەهەمان شێوە پێگەی ژن یان کچ و توانا و وزەکانیان لە دامەزراوەکانی کۆمەڵگادا بەبەراورد بە پێگەی ئەوانی دی، باوك یان دایك، یاخود برا یان خوشك، پەیوەستە بەتواناو وزەی هەریەکەیان، تێکەڵکاری لەم بابەتەدا سەردەکێشێت بۆ بەدحاڵیبوون و بەهەدەردانی وزەکانیان و ناکۆکی ڕۆڵیان (الادوار) و دەستدرێژیکردنە سەر مافەکان و لەرزۆککردنی ئارامیی خێزان و سەلامەتی بەجێگەیاندنی ئەرکەکانی.

لەراستیدا پێگەی مێرد لەخێزاندا پەیوەستە بە شوناسی خێزان و ئینتمای ئەندامانی و چەسپاندنی وەلائەکەی بۆی و دەستەبەرکردنی هەستی ئاسایش و ئارامی بۆی و بۆ تاکەکانی دیکەیشی. وەلائی پیاو و ئینتماکەی بۆ خێزان و ژن و منداڵەکان لە جەوهەردا وەستاوە لەسەر ڕادەی وەلائی ژن و دڵسۆزی بۆ پەیوەندی لەگەڵ پیاوەکەی و، بڕی ئەو هەست بە ئاسایش و متمانەیەی پیاوەکە لە پەیوەندییەکەیدا لەگەڵی پێی دەبەخشێت و ئەو باوکایەتییەی بۆ مناڵەکانی دەکات، هەروا بە ڕادەی ئەو ڕۆڵی کۆنترۆڵکردنەی پێی دراوە لە بەڕێوبردنی پەیوەندی لەگەڵ لایەنەکانی دەرەوەی پەیوەندییە هاوسەریە خێزانییەکان، ئەم کارە لە پەیوەستی ڕۆڵەکان و وەلائی باوك بۆیان و، متمانەی منداڵەکان بە ئینتمای باوکەوە بۆیان و ئاوێتەبوون لەگەڵیاندا ڕەنگدەداتەوە.

هەروەها گرنگە کە درك بە سروشتی ژن بەشێوەیەکی گشتی – لە زۆربەی قۆناغە بەرهەمهێنەرەکانی ژیانیشیدا– بکەین کە جیاوازە لە سروشتی پیاو، هەندێك لە هەلاوێردەکانیش (الاستثناءات) لەوە ناگۆڕن. بۆ نموونە ژن بەوە جیادەکرێتەوە کە ئەرك و خولیا و تواناکانی دوانەیین، لەو ڕووەوە کە بەقەدەر ئەوەی توانای کارکردن

و بەرهەمهێنانی هەیە و خولیای داهێنان هەیە تێیدا و شیاوە بۆیان، هێندەش بەستراوەتەوە بە دایکایەتی و ئەرکەکانی و خواستەکانی (هێلانە و بەچکەکان).

لەکاتێکدا کە پیاو ڕۆڵ و توانا و بایەخەکەی یەکلایەنانەیە، کە لەجەوهەردا بەکارکردن و بەرهەمهێنانەوە پەیوەستە. ئەوا دەبێت ئەو پەیوەستییە هەموو مەرجێکی بۆ دەستەبەربکرێت تا بتوانێت تواناکانی بۆ کارکردنی بخاتەگەڕ لەپێناو خزمەتکردن بە ژن و منداڵ و پێویستییەکانیان و بەشداریکردنیان لە بەری بەرهەمهێنانەکەی و دەستەبەرکردنی کات و هەوڵی پێویست بۆ دایك تا بایەخ بە بچکۆلەکان بدات، تا دەگەنە قۆناغی پێگەیشتن، لە ژینگەیەکدا کە چاودێری و سەرپەرشتی و ئاڕاستەکردن و پەروەردەی دروست تێیدا ڕەخساوە. ئەوەیە بناغە و دەستپێك، هەر هەمواركردنێكیش لە ڕەوتی ئەدای هەریەكێكیاندا دەبێت بەبێ زیانگەیاندن بە ئەرك و بەرپرسیارێتییە بنەڕەتییەكانی هەریەكێكی تریان بەئەنجام بگات.

لەبەر ئەوە هیچ بوارێك بۆ جیاكاریی و باڵابوونو ململانێ لەنێوان ڕۆڵی پیاوەتی و ژنێتیدا بوونی نییە، لەو سۆنگەیەوە كە هەریەكێكیان لەو دوو لایەنە خاوەنی ڕۆڵی خۆیانن لە بونیادنانی خێزان و كۆمەڵگادا. ژن لە بونیادنانی كۆمەڵگای موسوڵماندا – بە پلەی یەكەم– دایك و دایكایەتییە كە بریتییە لە بناغەی خێزان و شوێنی وەستانی بونیادنانەكەی و هێلانەی ئاساییش و سۆزەكەی، كە شایستەترە بە هاوكاری و چاكە و پارێزگاریی، لەهەمان كاتدا شایستەترە بە هێزی پیاو و وزە و بەخششەكەی بۆ پاراستنی هێلانەكە و چاودێرییەكەی و شەونخونی بۆ ئاسوودەبوونی.

هەموو یاساكانی ئیسلام تەنها بۆ ئەم ئامانج و مەبەستە هەوڵ دەدەن، هەر تێگەیشتنێكیش بۆ ڕۆڵی پیاو و ژن لە كۆمەڵگای موسوڵماندا كە ناكۆك بێت بەوە، لادانە لە ئامانجەكانی ئیسلام و لە فیترەتی دروست، ئیدی بە ئاڕاستەی خۆرئاوا بێت، بۆ شەكەتكردنی ژن و ناچاركردنی بە كاركردن و بازرگانیكردن پێوەی لە ڕووی سێكسییەوە و كردنی بە ئامرازێكی بێتاقەتی و گاڵتەیەكی نزمی تاوانكارانە، یان بە

ئاڕاستەی ملکەچبوون بێت بۆ دابونەریت لـە هەنـدێك ولاّتـانی جیهـانی ئیسـلامی، بـە هەراسانکردن و شپرزەکردن و تەنگ پێهەڵچنینی و پشتگوێخستنی، لەجیاتی فێرکردن و ڕووناکبیرکردن و بەشداریکردن لە ئەرکە قورسەکەیدا و ئامادەکردنی بە ئەنجامدانی ئەرکی خۆی لە چاودێریکردنی خێزاندا و باشپێگەیاندنی ڕۆڵەکانی و دەستەبەرکردنی ڕێگاکانی چاودێریکردنی مێرد و وەبەرهێنانی وزە زۆرەکەی بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵگا.

لەراستیدا دوورخستنەوەی ژنـی موسـوڵمان لەبەشـداری کـەلتووریی و ئـایینیی و کۆمەلاّیەتی ئیسلامی، کـە -لـە زۆر ڕووەوە- لاوازی پـەروەردەکردنی ڕۆڵـەکان ڕاڤـە دەکات، لەگەڵ لاوازی ڕۆڵی ژنی موسوڵمان لە کایـەی کۆمەلاّیەتیـدا، بـە بـەراورد بـە ژنی هیندۆسی بۆ نموونە، گەرچی ژنی هیندۆسی مافەکانیشی زەوتکـراون و تەنانـەت بە بەشێکی کەمیش لەو مافانە بەهرەمەنـد نابێـت کـە ئیسـلام بـۆ ژنـی موسـوڵمانی دەستەبەرکردووە، ئەوەندە هەیە کە جیاوازییەکە لێرەدا ئەوەیـە کـە ژنـی هیندۆسـی چەند ڕۆڵێکی کارای هەیە و خـاوەنی ئامادەگییـە لـە چـالاکی ئـایینیی و کۆمەلاّیـەتی هیندۆسـیانەدا. لێـرەدا ئـەوەم دێتـەوە یـاد کـە لـە شـێخ محەمـەد غـەزالیم بیسـتبوو (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) سەبارەت بە یادەوەرییەکانی لەبارەی منداڵی و گوندەوە، لەوە دەدوێت کـە چـۆن ژنـی لەهـەموو شـوێنێکدا لـە گونـد بـەدیکردووە لەمزگەوتـدا نەبێت.

چەند سەرسام دەبم کە دەبینم زۆربەی مزگەوتـەکانی موسـوڵمانان لـە زۆرێـك لـە ولاّتەکانیاندا شوێنی بۆ ژنان تێـدا نییـە، گـەر شوێنیشـی هـەبێت لـە دوای بەربەسـت (ستر) ڕێگر و دیوارگەلێکەوە کە سەختە ئامادەبوون و بەشداری دەروونـی لەگەڵیـدا، ناشزانم - لەکاتێکدا کە ژنان لەوپەڕی داپۆشراویی و پاکیی و پەرستشی خۆیانـدان- ئەو کەسە لە چی دەترسێت کە ڕیزەکانی کۆمەڵەکانیان دەخاتـە پشـتی بەربەسـت و ڕێگرەکانـەوە، لەکاتێکـدا کـە کۆمەڵـەکان دوای کـەمێك لـە شـوێنی پەرسـتش و بێگەردییـەوە بـەرەو بازارەکـان و کارەکـان بەڕێدەکـەون بـە ژن و پیـاوەوە؟! ئایـا هـۆگری دەروونییـان لـە کۆبوونـەوەی پاکخوانـەی ڕۆحـی لەمزگەوتـدا نابێتـە مایـەی

هـــۆگری دەروونیـــان لـــە مامەڵـــەکردنی پـــاك و پەروەردەکراوانـــەدا لـــە دەرەوەی مزگەوتیشـدا؟ لـەجیاتی ئـەوەی ڕیزەکانیـان لـەڕووی دەروونـی و ماددیشـەوە لـەناو مزگەوتدا ون و نائامادەبن؟!

هەروەها چەند سەیریشە کە لە زۆرێك لە مزگەوتـەکانی موسـوڵمانانـدا کـار بگاتـە ئەوەی ڕێگـە بـە ژن نـەدرێت بـە ئامـادەبوونی لـە نوێـژی جومعـە و دوو وتارەکەیـدا، جێگایەکی گونجاویشی بۆ ئامادە نەکرێت، وەك ئـەوەی وتارەکـە و ئامادەبوونەکـە و بیرهێنانـەوە و خسـتنەڕووی کاروبـاری موسـوڵمانان هـیچ پەیوەندییـەکی بـە ژنـەوە نەبێت، وەك بڵێیت لە کۆمـەڵگادا هـیچ ڕۆڵ و کـارێکی نـەبێت. قەدەغـەکردنی ژن لـە ئامـادەبوونی نوێـژی جومعـە و جەماعەتـدا بەدحاڵیبوونـە لـە ڕێگەپێـدان (رخصـە)ی ناچارنەکردنی ژن بە ئامادەبوون لە نوێـژە بەکۆمەڵـەکان، لـەو ڕووەوە کـە سروشـتی ئەرکەکەی لە چاودێریکردنی خێزاندا وادەکات کە نەتوانێت کاتی ئەداکردنی نوێژەکان ڕێکبخات، چونکە ناکرێت دایك یان ئەو کەسەی لە شوێنی ئەودایە، شیرپێدانی منداڵە بچـکۆلەکەی یـان چـاودێریکردنی دوابخـات، یـان جێهێشـتنی بـەبێ چـاودێری یـان چاوەڕوانی گەڕانەوەی لە قوتابخانەکەی و بەوشێوەیە، لەبەر ئـەوە ژن ناچـارنەکراوە بۆ نوێژی بەکۆمەڵ، بەتایبەتیش لە جەماعەتەکانی شەوان و تاریکە شەوەکاندا. بەڵام گەر هیچ شتێك لەوانە سەرقاڵی نەکرد و نەبووە ڕێگر لە ئامـادەبوون لـە جەماعەتـدا، نوێژی جومعەو وتارەکەش بەتایبەت، ئەوا پیاو و ژن ئەندامن لە کۆمەڵگادا، هەموویان بەرپرسن وەك یەك، چـونکە فەرمانەکـە فـەرمانی ئاسـانکردن و (اباحە)یـە، نـەك هـی قەدەغەکردن و فەرامۆشـکردن، ((فـلا تمنعـوا امـاء الله مسـاجد الله)) [1] واتـە: ((ڕێگـە لەکارەکەرانی خودا مەگرن بۆ مزگەوتەکانی خوا)).

---

[1].البخاري. صحيح البخاري، مرجع سابق،ج١، ص٣٠٥، حديث رقم: ٨٥٨. هەروەها بڕوانە: القشيري، صحيح مسلم، مرجع سابق، ج١، ص٣٢٦، حديث رقم: ٤٤٢. "لاتمنعوا النساء حظوظهن من المساجد".

**دایکایەتی و کارکردن لە سیستمی کۆمەڵگای هاوچەرخی موسوڵماندا:**

لە مەترسیدارترینی ئەوەی موسوڵمانان لەمڕۆدا پێوەی گیرۆدە بوون، لە شکستە ژیارییە ماددییەکاندا بەرامبەر خۆرئاوادا، شوێنکەوتەیی ڕۆژئاوایە لەهەموو شتێکدا بست بەبست، بەبێ بوونی هۆشیاری لەبارەی تایبەتمەندی ئەوان و و ئێمە و، مەبەستەکانی شەریعەتی ئەوان و شەریعەتی ئێمە.

هێنانە دەرەوەی ژن بۆ کارکردن، بە هەمان ئەو مەرجانەوە کە بۆ پیاو داواکراون، بەهەمان ئەو خواست و ڕێکخستنانەش کە خۆرئاوا بەهۆیانەوە مامەڵە لەگەڵ ژندا دەکات، بۆتە مایەی هەڵوەشاندنەوەی خێزان و شەکەتکردنی ژن و زیادەڕەویکردن لە خستنەڕوویدا و بازرگانی پێوەکردنی و گیرۆدەکردنی بە هەموو جۆرەکانی قۆستنەوە و لادان.

ژن هاوشێوەی پیاو نییە، هەر یەکێکیان سروشت و تایبەتمەندی و پێویستیی خۆیانیان هەیە، هەردوکیان تەواوکەری یەکترن نەك هاوشێوە، مامەڵەکردن لەگەڵیان بەوپێیەی کە هاوشێوەی یەکترین، ستەمکردنە دەرهەق بە هەردووکیان، ستەمکردنە لە پیاو لەڕووی دەروونی و باوکایەتییەوە لە پەیوەندی و ڕۆڵە تەوەرییە (سەرپەرشتیاری)یەکەیدا لەژیانی خێزان و دەستەبەرکردنی ئارامی و خۆشگوزەرانی بۆی، هەروا زیانگەیاندنیشە بە ژن بەشێوەیەکی تایبەت لە ڕۆڵی دایکایەتییە تەوەرییەکەیدا لە ژیانی مرۆڤ و پێگەیشتنی، لە پەروەردەی منداڵ، لە شەونخونیی لەسەرماڵی خێزان و ئاسوودەیی و کامەرانییەکەی.

لەبەر ئەوە هێشتا پێویستە لەسەر کۆمەڵگای موسوڵمانو بڕیار و سەرکردەکانی کە لەبارەی سروشتی ڕۆڵی پیاو و ژن لە شەرعو لە کۆمەڵگای موسوڵمانی هاوچەرخدا لە خۆیان بپرسن، هەروەها لە چۆنێتی پاراستنی تایبەتمەندییەکانیان و هێنانەدی مەبەستەکانی شەریعەتی ئیسلامی، لەگەڵ خستنەگەڕی تواناکان و ڕامکردنی وزەکانی ژن و پیاو بەباشترین شێوەی لەتوانادا بوو لە خزمەتی کۆمەڵگادا

بە جۆرێك كە مەبەستەكانی بەشێوازێكی هاوسەنگ بێنێتەدی و وای لێ بكات سوود لە وزەكانی وەربگرێت و بە باشترین شێواز ڕووبەڕووی تەحەدداكانی ببێتەوە.

بۆ هێنانەدی ئەمەش پێویستە لە بازاری كاركردن بكۆڵرێتەوە و ئامادەبكرێت بۆی و ڕێكبخرێت، لەگەڵ ئاسانكردن و ئەولەوییەت تێیدا، لەژێر تیشكی ئەو پێویستی و توانا و ڕۆڵانەی سەرجەم تاك و گروپەكانی كۆمەڵگا پیادەیان دەكەن و ئەنجامیان دەدەن، بە ژن و پیاوەوە، كە لەگەڵ ئامانجەكانی كۆمەڵگادا بسازێت و تایبەتمەندییەكانی بهێنێتەدی. لە دۆخی ژندا ئەوا ڕۆڵی زیندووی دایكایەتی بە بناغە گرنگەكەی كۆمەڵگا هەژمار دەكرێت، مانەوە و بەردەوامبوونیشی بەشێوەیەكی كارا، لە بایەخدارترینی ئەو ئیعتباراتانەیە كە پێویستە بازاڕی كار لە كۆمەڵگای موسوڵماندا لەسەر بناغەیان ڕێكبخرێت. ژن لە ڕۆڵی دایكایەتیدا پێویستی بە چاودێریی ماددییە بۆ ئەوەی ڕۆڵی خۆی لە خزمەتكردنی خێزان و شەونخونیكردن بۆ پشوودانیدا ببینێت، وەك چۆن پێویستی بە چاودێریی مەعنەوییە بۆ پارێزگاریكردن لە جەوهەری دایكایەتی، بۆ پاراستنی داوێنپاكی و كەرامەتەكەی.

چەند بوارێكی زۆریش لە كۆمەڵگای موسوڵماندا هەن كە دەبێت ئەولەویەتی تێیاندا بە ژن بدرێت، لە باشترین نموونەكانیشی فێركردنە لە قۆناغی باخچەی ساواییاندا و لە قۆناغی سەرەتاییدا، كە ژن بەپێی سروشتی خۆی بەتواناتر دەبێت لەمامەڵەكردن لەگەڵ منداڵدا.

لە ڕوانگەی سروشتی ژن و ڕۆڵە زیندوو كۆمەڵایەتییەكەیەوە، كاتێك دەگاتە بیست ساڵ دەگاتە كۆتایی، یان نزیكدەبێتەوە لە كۆتایهاتنی لە ئامادەكردنی پیشەییانەیدا بە دەستخستنی بڕوانامەی دیبلۆم، یان بەكالۆریۆس، لەم تەمەنەدا لەوپەڕی ئامادەگیدایە بۆ بینینی ڕۆڵی دایكایەتی، لەلایەنی بۆماوەیی و توانای جەستەیی و دەروونیشەوە هەر بەتواناتر دەبێت، لە خستنەوەی منداڵی تەندروست و توانای پەروەردەكردن و چاودێریكردنیان لە ڕووی دەروونی جەستەییەوە، لەبەر ئەوە جێی بایەخە ڕەخساندنی هەلی كاری گونجاو بۆ سەرقاڵبوونی ژن بە دایكایەتییەوە لەم

ماوەیەدا کە تا چل ساڵی درێژدەبێتەوە، کاتێك بچووکترینی منداڵەکانی توانای پشتبەخۆبەستنیان دەبێت، کە ماوە نارەحەتەکانیان لە ڕووی جەستەیی و دەروونییەوە تێپەڕاندووە.

ئەمەش مانای ئەوەیە لەم تەمەنەدا لە مەیدانی کارکردندا بەخێرهاتنیان لێ بکرێت و ئەولەویەتیان پێ ببەخشرێت و توانا و تایبەتمەندییەکانیان بنرخێنرێت، بەڵکو دایکایەتییان بە خزمەت بۆ هەژماربکرێت هەموو دوو ساڵێك یان سێ ساڵێك بە ساڵێکی خزمەت، بەگوێرەی ئەوەی خزمەت و پسپۆڕیەتییەکانی پێ هەژمار دەکرێت لە تەرازووی دامەزراندندا (التوظیف)، بەتایبەتیش کە ژن –لەلایەکەوە بە ئەزموونەکانی و بە سروشتی ئەو گۆڕانە بایەلۆژییانەش کە لە دەوروبەری تەمەنی چل و پێنج ساڵیدا بەسەریدا دێت، بەهۆی وەستانی سووڕی مانگانە و کۆتاییهاتنی ماوەی توانای سکپڕی– تۆکمەتر و ئەرێنییتر دەبێت، بەهۆی زیادبوونی هۆڕمۆنەکانی نێرێتی و پاشەکشەی هۆڕمۆنەکانی مێینەیی لەلای، بەپێچەوانەی ئەوەی لای پیاو لەم تەمەنەدا ڕوودەدات کە دوای ئەوە مەیلی بەلای نەرمیی و ناسکیی عاتفیدا دەچێت، لەبەر ئەوە کارێك گونجاوە کە مافی خانەنشینی لە تەمەنی شەست و پێنج ساڵیدا، یان حەفتا ساڵی تەمەنیدا پێی بدرێت، نهێنیش نییە کە ژن بەتەمەنترە، لەهەمانکاتدا پێکهاتەشی بەهێزترە لە پیاو لەم تەمەنەی دواییدا.

ئێمە لە سایەی پاشکۆیەتی خۆرئاوادا، کە مەیلی بەلای بازرگانیکردن بە ژن و مێینەییەکەیدا هەیە و لە بایەخی ڕۆڵی دایکایەتیەکەی کەم دەکاتەوە و هەوڵ دەدەین هیلاکی بکەین و لە سەرەتای لاوێتییەکەی و بەهاری تەمەنیدا لە ڕۆڵی دایکایەتییەکەی لای بدەین، دواتریش دەرگاکانی لەبەردەم دابخەین کاتێك پێدەگات و لە سەرقاڵیەکانی دایکایەتی خاڵی دەبێت، تا ببێتە بێکرا و پارێزگار و سەرچاوەیەك بۆ ناکۆکی و کێشەکانی خێزان.

لەلایەکی دیکەشەوە، ڕێکخستنی بازاڕی کارکردن، بەجۆرێك کە کەرتی کارکردنی ژنان خاوەنی سەربەخۆیی خۆی بێت لە کەرتی کارەکانی پیاوان، کارێکی مومکین

بێت، هاوشێوەی سەربەخۆبوونی کەرتە جیاوازەکانی کارکردن، ئەوە لە جەوهەری خۆیدا پرۆسەیەکی ڕێکخستنئامێزە و پێکهاتنی دەروونی و بەهایی مرۆڤ و کۆمەڵگای موسوڵمانی لەسەر دیاری دەکرێت. گرنگە ملکەچنەبوونی ژن لە بازاڕی کاردا بۆ دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی پیاوی بێگانە، بە چەشنێك ڕێگا بە گەشەکردنی پەیوەندییە تایبەتییە گەرموگوڕەکان نەدات لەلایەکەوە، ڕێگە بە فریواندنە وەزیفی و ماددییەکانیش نەدات کە بە ئامانجی کارتێکردنیان فشار بۆ سەر ژن ڕام بکرێن، گەر لە پەیوەندییە سەرکردایی و بنکردنییەکانی دەسەڵات وردبینەوە –تەنانەت لەنێو پیاوانیشدا– ئەوا سەرسام دەبیین لەو ئەگەرە کاریگەرییانەی کە زۆرێك لە پیاوان پاڵ پێوەدەنێن بۆ ملکەچی و دووڕوویی و ئەنجامدانی لادانەکان لەپێناو ڕازیکردنی سەرۆکەکاندا و لەپێناو خۆ ڕزگارکردن لە تووڕەبوون و دەسەڵاتەکەیان و بۆ سوود و قازانجکردن لێیان لە پێگە و زیادکردنی مووچە و بەرزبوونەوەیان.

سروشتی لاوازی مرۆیی و بەردەوامی هاوەڵێتی نێوان پیاوی سەرۆك و ژنی ژێردەست و زانینی خاڵەکانی لاوازی و هێزی نێوانیان، ئەوەش کە ژیانی تاك خوازیاریەتی لە کێشەکانی و ئەرکەکانی و پەیوەندییە خێزانییەکان و ئەو دەسەڵاتە ئەرێنی و نەرێنییانەش کە لە دەستی سەرۆکدان، هەموو ئەمانە وا دەکەن ئابڕووی ئافرەت بە بایەخدارترین شت بێت کە سەرۆکی پیاو چاوی تێدەبڕێت، ڕەنگە لە حاڵەتەکانی لاوازیدا، ئاسانترین شت بێت کە ژنی بەردەست بە جەنابی سەرۆکی ببەخشێت. ئەوەی ژیانی وەزیفی ئەمڕۆی خۆرئاوا ئاشکرایدەکات لە ممارەساتی پەلامارە سێکسییەکان دەبێت ئاگادارکەرەوەیەکی بەس بە بۆمان، بەتایبەتیش کە شەریعەت و بەها و تایبەتمەندێتییەکانی ئێمە وا دەکەن ئەو شوێنەوارانەی لە بوونی ئێمەدا لێیان دەکەونەوە –سەرەڕای زەبەلاحییەکەی لەلایان– کاریگەری گەورەتر و درێژ بێت لەوەی لای ئەوان.

لەسەرمان پێویستە بایەخ بە پلانسازیی کۆمەڵایەتی بدەین، هێندەی گرنگیدانمان بە پلاندانانی ئابوری، تا بەر لە هەنگاونان نەگەینە کۆتایی، چونکە باشی پلاندانانی

کۆمەڵایەتی و کاراییەکەی –تەنانەت لە ڕووی مادديشەوە– کارێکی ئاسان نییە بە تەنیا، بەڵکو خاوەنی کاردانەوەی ئابوری خۆیەتی، کە زۆرجار دەبێتە مایەی باش بەکارهێنانی داهاتەکان و هێنانەدی لێهاتوویی بەرهەمهێنان.

**دووەم: نیشانەکانی سەر ڕێگا لە (سیناء)ی سەردەمدا**

**ڕۆڵی خێزان:**

پێشتر بۆمان ڕوونبووەوە کە منداڵ و بایەخدان بە پەروەردەکەی و، پەرەپێدانی بەرنامەی ئەم پەروەردەکردنە و، پاڵفتەکردنی ئەو کەلتوور و چەمکانەی لە تەمەنی منداڵییەوە بە شیرەکەی گۆش بووە، کەجێگەی بایەخی زانستی و پەرەپێدانی کردەیی نەبووە لای ئەهلی مەعریفە و فیکر و بریار لە جیهانی ئیسلامیدا. ئیدی چۆن ئوممەت بتوانێت شەڕی پەروەردەکردن و پێگەیاندنی ئیسلامییانە بباتەوە لەکاتێکدا کە گیرۆدەی شێواندنی بۆماوە ڕووناکبیرییەکەی خۆی و ڕوکەشگەرایی کەلتوورێکە کە خەسڵەت و تاکبوون و غوربەتەکەی لە کات و شوێندا، لەگەڵ کەموکووڕیی رۆشنبیری خەڵکی گشتی و دارمانی، لەهەمان کاتدا گیرۆدەی هێرشی داگیرکاریی فیکریی بێگانە و میدیای جیهانی و ئامانجە کۆلۆنیالییەکان و ئەو ئامرازە سەپێنەرانەیە کە درەوشانەوە ژیارییەکەی خۆی پێ دەقۆزێتەوە، لەپاڵ بێئاگایی لەئیسلام و گەندەڵییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکەیدا؟

**سیستم و دامەزراوەکان: ڕۆڵێکی شوێنکەتە:**

ئاشکرایە کە کەرتی چاکسازی ئیسلامی لە ئوممەتدا دەربڕی ناخ و ویژدانیەتی، کلیلی بزوێنەرەکانی وزەکانی لەدەستدایە و خاوەنی توانای دوواندنی گیانی ئوممەت و پێشکەشکردنی پرۆژەیەکی سەرکەوتوو بۆ چاکسازی و بونیادنانەوە و دروستکردنەوەی پەیوەندی لەگەڵ سەردەمی هاتنە خوارەوەی وەحی، لەگەڵ دیدە گەردوونییە گشتگیرەکەی و گیانی جیهادیی چاکسازییەکەیدا.

ئەم کەرتە لەتوانایدا نییە پشت بە سیستمەکان و پاڵفتە سیاسییەکانی ببەستێت بۆ چاکسازی لە پەروەردە و فێرکردن بەشێوەیەکی ڕیشەیی، بەگوێرەی دیدی ئیسلامی، چونکە بەرژەوەندییەکانی سیستمەکان –بەهۆی کاریگەری سروشتەکەی و هێزە کاریگەرەکان تێیدا– مانەوەیە لەسەر ئەو دۆخەی کەهەیەو تێیدا بەهرەمەندن لەوەی لەبەردەستیاندایە لە بەرژەوەندی و دەستکەوت، سوورن لەسەر هێشتنەوەیان بەراکێشانی ڕەزامەندی هێزە جیهانییە گەورە حوکمڕانەکان بەسەریانداو دژ نەبوون لەگەڵ بەرژەوەندی و گەنجینە و کەرەستە و سیستمەکانیان. ئەمەش بەمانای فەرامۆشکردنی گوتاری سیستمەکان و سەرکردەکانیان و وەستاندنی هەوڵەکانی ئامۆژگاریکردنیان و بەدەستهێنانی بەشێك لە قەناعەتهێنانیان و هاوکاریکردن لەگەڵیاندا لە سنووری تواناکانیاندا و هەوڵدان بۆ کەمکردنەوەی بەرگریکردنیان و دژایەتیکردنی ئەو هەولانەی لەپێناوی چاکسازیدا دەدرێن نایەت.

هەمان قسەش سەبارەت بە میدیا و بازنەکانی ڕاگەیاندن دەگوترێت، جۆری ئەو کەلتوور و بەرژەوەندییانەی کۆنترۆڵی میدیا دەکەن و ئەو دەزگایانەش کە بەڕێوەیاندەبەن، پەرۆشیان بۆ پرۆژەی پەروەردەی ئیسلامی و هێنانەدی ئامانجەکانی ناهێڵێت. بەڵام ڕووبەرێکی فراوان دەمێنێتەوە کە دەکرێت بیریار و ڕووناکبیرانی دڵسۆز بۆ چەسپاندنی هەولەکانی چاکسازی ئیسلامی ژیاریی سوودی لێ وەربگرن، سوودیش لە هۆکارەکانی ڕاگەیاندن و پەیوەندییە ئەلکترۆنییەکان وەربگرن کە بوارێکی فراوانی توانای پەیوەندی ئازادانە بە جەماوەرەوە دەبەخشێتە ل تاك و ڕێکخراوەکان، بە چەشنێك کە سەرجەم جۆرەکانی سنوور و لەمپەرەکان ببڕێت.

گەر ڕامکردنی سیستمەکان و خستنەگەڕیان بەشێوەیەکی کارا –لە سایەی ئەو هەلومەرجانەدا کە دەیانبەن بەڕێوە– لەپێناو کاراکردنی پرۆژەی چاکسازیی ئیسلامی لە توانادا نەبێت، بانگخوازانی چاکسازی پەروەردەش (سیناء)ێکی دوورە دەست بۆ ئوممەت نادۆزنەوەتا چەند کۆمەڵەیەکی منالانی ئومەت و تازە پێگەیشتووانی تێدا

لەخەڵك دابڕن، تا بەشێوەیەكی دروست پەروەردەیان بكەن كە دەیخوازن، وەكو ئەوەی موسای گەورەمان و هارونی برای (علیهم السلام) لە (سیناء)ی دورگەی عەرەبدا پێشتر كردیان، لەكاتێكدا كە چیتر لە جیهانی گلۆبالیزم و پەیوەندی فەزایی و ئەلكترۆنی و ڕۆكێتدا، شوێنێك بۆ خەونی بەرەبەستەكانی پارێزگاری كەلتووریی و گومرگی نەماوە، پێویست دەكات پڕۆژەی ئیسلامی ڕووبەڕووی واقیع ببێتەوە – بەهەموو ئەوەی كە ئەوی تر لە باڵادەستی ماددی و تواناكانی هەژمونی كەلتووری خۆرئاوایی هەیەتی – ڕووبەڕوو، جۆر بەرانبەر بەجۆر، و توانا بەرامبەر توانا، كەلتوور و ژیار بەرانبەر كەلتوور و ژیار، گۆڕانكاریش لەسەر زەوی و لەنێو كۆمەڵگادا ڕوبدات، بەبەرچاوی ڕژێمەكان و، دژایەتی هێزە دواكەوتووە بەرەوخۆرئاوایی و تەقلیدییەكان.

ئەو چارەسەرەشی كە بكرێت لەم جۆرە هەلومەرجانەدا بێتەدی دەبێت پشت بە پاڵنەرێكی خودی خۆڕسكی كارا ببەستێت، كە تاكە پاڵنەرە مرۆڤی موسوڵمان دەكاتە كەسێك حەزی ئەنجامدانی هەبێت و تواناشی بەسەریدا بشكێت و، (سیناء)ەكەی لە بن باڵەكانی هەڵگرێت، ئیتر دۆخە ماددی و كۆمەڵایەتییەكەی هەرچییەك بێت، جا خودی خۆی پێ دروستبكاتەوە، نەوەكانی پەروەردە بكاتەوە، دەروونیان ببوژێنێتەوە، وزە و توانای ژیاریی ئیسلامی كە ئوممەتەكەیانی پێ هەڵدەستێتەوەپێیان بدات، بەوەش مودێلی خۆیان و تەحەددییاتی چاكسازییەكانی خۆیان پێشكەش بە ژیاری مرۆیی هاوچەرخ بكەن، دەبێت ئەو پاڵنەرە فیترییە چی بێت؟ ئەی كامەیە كلیلی خسنەگەڕی گۆڕانكاری لە كۆمەڵگادا؟؟

**پاڵنەری خۆڕسكی باوكانە كلیلی خستنەگەڕی گۆڕانكاری كۆمەڵایەتییە:**

كلیلی ڕزگاركردن و (سیناء)ی سەردەمی عەولەمە و پاڵنەری خودییانەی موسوڵمان و كلیلی بەگەڕخستن لەپێناو گۆڕانكاریی ئیجابی لە ئوممەتدا، دەبێت لە ناخی موسوڵمانەوە هەڵبقوڵێت و لە خوا بەولاوە پشت بە كەسی دیكە نەبەستێت، پاشان پشت تەنیا خودی خۆی ببەستێت، بەبێ وەرگرتنی فەرمان و مۆڵەت لەو دەستەبژێرانەوە كە ئیرادەیان لێ زەوتكراوە، نە لە بەرژەوەندییە دژیەكەكانیانەوە.

ئەم ئاسانكارو كليل و (سينا)يە تەنيا لە (خێزان)دا خۆيان دەنوێنن، كە ئامێزی مندالّ و ویژدانو كارگەی دروستكردنی دەروونیەتی كە لەسەر پایەكانی پالّنەری خودی خۆڕسكانە ڕاگیراون، پالّنەری (باوكايەتی) يان (دايكايەتی) كە هەميشە ئامانجی ئەوەيە بەرژەوەندی مندالّی تێدايە بەبێ هيچ شتێكی دیكە، لەسەر بناغەی چەمكگەلێكی ڕوون بۆ باوك و دايكان و قەناعەتهێنان پێييان، بەوەی هێنانەدی بەرژەوەندی ڕۆلّەكانيان و جگەرگۆشەكانيانی تێدايە.

پالّنەری خۆڕسكانەی باوكان بۆ ئەو شتەی كە بەرژەوەندی ڕۆلّەكانی تێيدا بريتييە لەو تاكە كليلەی كە لەم سەردەمەدا ماوەتەوە، وەك سەرچاوەيەكی كارا بۆ چاكسازی ڕووناكبيری و پەروەردەيی ئيسلامی، كارەكەش لەوكاتەدا پشت بە بيريار و پەروەرشيار و چاكسازی  موسولّمان لە خودی خۆيدا دەبەستێت، بۆ ئەوەی بە ئەركی خۆی هەستێت لە هاريكاری كەلتووری و ئەدەبياتی پەوەردەيی زانستی دروستی ئيسلامی بەباوكان، گەيشتن بە هێنانەدی متمانە دروستكردن بەو باوك و دايكانە سەبارەت بەوەی بەرژەوەندی ڕۆلّەكانيان تێدايە، لەگەلّ چۆنێيەتی دارشتنەوەی بونيادی سايكۆلۆژی و ویژدانيان، لەسەر بنەماگەلێكی دروستی ئيسلامييانە، بەجۆرێك بەختەوەريی هەردوو دنيايان بۆ دەستەبەر بكات، لەڕووی ئيمان و توانا و كەرامەتەوە.

گەر قوتابخانە بيەوێت ڕۆلّێكی گرنگی كارای لە خزمەتكردنی  موسولّماناندا و پەرەپێدانی جۆرێتی نەوەكان و تواناكانيان هەبێت، ئەوا لە توانايدايە كەبەرنامەی پەروەردەيی منالاّن پێشكەش بە باوكان بكات و ئامادەيان بكات بۆ بەجێگەياندنی رۆلّی خۆيان بەو رادە پەرەسەندووەی كەهەلومەرجی كۆمەلّگا بواری پێدەدات، ڕۆشنبيركردنی باوكان و هۆشياركردنەوە و دەولّەمەندكردنيان بە چەمك و توانا پێويستييەكانيش بكاتە بەشێكی دانەبڕاو لە بەرنامەی كاری قوتابخانە و ڕۆلّيان لەكۆمەلّگادا.

خوێندنی باڵاش دەتوانێت لەڕێی بەرنامەی خوێندنی زۆرەملێ (ئیجباری)یەوە بۆ کارمەندە لاوەکانی بەشدار بێت و بۆ پێکهێنانی خێزانگەلێکی سەرکەوتووی ئیسلامی ئامادەیان بکات، لەگەڵ هەستان بە ڕۆڵی خۆیان لە پەروەردەکردنی ڕۆڵەکانیان و ئاڕاستەکردنیان بەشێوەیەکی ئیسلامییانەی ژیارییانەی دروست.

قوتابخانە و زانکۆ تایبەتە ئیسلامییەکان لەو دامەزراوانەن کە توانای بەشداریکردن‌و لەئەستۆگرتنی ئەم ئەرکەیان هەیە، بەجۆرێك کە ئاستەنگەکان لاواز دەبن لەبەردەم تواناکانی دیاریکردنی بەرنامەی تەواوکاری کە پێویستە ئەرکی ئامادەکردنی باوکان (بە قوتابیانی کوڕ و کچەوە) لەپێناو باش پەروەردەکردنی ڕۆڵەکانیان و بەخشینی ئەولەویەتی گەورە پێی بدات، بۆ خزمەتکردنی ئایندەی ئوممەت و بەرزکردنەوەی کوالێتییەکەی، بەتایبەتیش کە باوکانی منداڵان لەم قوتابخانانەدا هەمیشە لە ڕووناکبیرانی شایستەی ئەنجامدانی ئەم ئەرکە دەبن، گەر بێتو ئاڕاستەکردنیان بەشێوەیەکی پەروەردەیی لەڕوانگەیەکی زانستییانەی ئیسلامییانەوە بە باشی بەڕێوەبچێت لەشێوەی خوێندنەوە و وانەو کۆڕبەند و ۆرکشۆپەکانەوە، پێویستیشە کارلێکی باوکان لەگەڵیاندا مەرجێك بێت لە مەرجەکانی قبوڵکردی قوتابی لەم قوتابخانانەدا.

## ڕۆڵی پەروەردەیی و ویژدانیانەی دایك و باوك:

کارامەیی سەرجەم ڕۆڵەکان (الادوار) لە پەروەردەکردنی منداڵ و تاکی تازە پێگەیشتوودا، لە قوتابخانە و میدیا و کۆمەڵگادا، پشت بە هەڵوێستی دایك و باوك دەبەستێت، هەر ئەوانن توانای گەیشتنی هەموو هێزەکان و دەزگا کۆمەڵایەتییەکان بە منداڵ‌و دروستکردنی کاریگەری لەسەری دەدەن، لە ڕووی ئەرێنی و نەرێنییەوە، ئەمەش لەڕێی ئەو رۆڵەی سەرپەشتیکردنی پەروەردەیی کاراوە کەپێیان سپێردراوەو ئادەکردنی رۆڵەکانیان بۆ ئەو ئاراستەیەی کەدەیانەوێت، یان بە نەرێنیبوون و

دەستبەرداربوون لە ڕۆڵە پەروەردەییەکانیان و ڕادەستکردنی پەروەردەکردنی منداڵان بەو دەزگایانە، بەبیّ بوونی هیچ لێپرسینەوە و چاودێریێك.

خێزان ئەو هێز و ڕەوایەتییەی بەدەستە کە جۆری ئەو کاریگەرێتییە دیاری دەکات کە دەشێت دامەزراوەکان و هێزەکانی دیکەی کۆمەڵگادا لەسەر منداڵ دروستی بکەن، هەروەها لەسەر بونیادە دەروونی و ناوەکییەکەی و بۆ سەر توانا مەعریفییەکانیشی. خێزان وەك چاویلکەی ڕەنگاوڕەنگ وایە بۆ چاو و دیدەی منداڵ، چۆنێتییەکەی دەبێتە هۆی دیاریکردنی ئەو ڕەنگەی منداڵ لە بوون و ژینگەدا بەدیی دەکات. لەرووی حەقیقەتو قوڵییەوە ئەوە گرنگ نییە کە منداڵ دەیبیستێت یان دەیبینێت، بەڵکو گرنگ ئەوەیە منداڵ چۆن تێی دەگات؟ چۆن هۆشیاری بێتەوەو تێبگات لەوەی کەدەیبیستێت و دەیبینێت؟ لەبەر ئەوە منداڵان جیاواز دەبن – بەوەی لەودیو توانا سروشتیەکانیانەوەیە –لە زۆر ئاڕاستەو جۆری کانزاکانیان و ڕەفتاریاندا، لەکاتێکدا لەهەمان قوتابخانەدا دەخوێنن و لەسەر هەمان بەرنامەی خوێندنن و لەسەر دەستی یەك مامۆستاش. هۆکاری ئەمەش –بە پلەی یەکەم– بۆ کاریگەری خێزان و ژینگەی ماڵەوە و جۆری هاوڕێکانی–ئەوانەی پێویستە دایك و باوکان لەهەڵبژاردنیاندا بەشداربن– لەسەر بونیادی دەروونییانەی منداڵ و وزە و ئاڕاستەکردنە ناوەکییەکانیان دەبێت.

**کەم و کوورتی پەروەردە و فێرکردن لای موسوڵمانان:**

گەر بایەخی منداڵی و پەروەردەمان لە دروستکردنی گۆڕانکارییە ڕیشەییە مەعریفی و ویژدانییەکاندا هەست پێکرد، ئەوا یەکەمین شت کە بەزەیندا بێت بریتییە لە قوتابخانە و فێرکردن، کاریگەری ڕاگەیاندنیش بە پلەی دووەم دێت، ڕۆڵی خێزان لەکۆتاییدا دێت، خەریکیشە ڕۆڵی لە ئەرکی پێدانی خواردن و دەستەبەرکردنی خواست و پێداویستییە ماددییەکانی منداڵ لە شوێن و خۆراك و پۆشاك کۆتایی بێت.

گەر بێتو بڕی ئەو پارەیەی لە قوتابخانە و فێرکردنـدا خەرجـدەکرێت –سـەرەڕای کەمی ڕێژەکەی لە وڵاتانی جیهانی ئیسـلامیدا– لەگـەڵ ئـەوەی بـۆ ڕاگەیانـدن خـەرج دەکرێت بپێوین، بەراورد بەوەی کەبۆ ڕۆڵی پەروەردەییانەی خێزان و بەرزکردنـەوەی ئەم ڕۆڵە و ڕووناکبیرکردن و ڕابەرایەتیکردن و دەوڵەمەندکردنی بـە چـەمك و هۆکـارە پێویستییەکانی بەجێگەیانـدنی کـارای پـەروەردەیی خـەرج دەکرێـت، ئـەوا دەبیـنین شایانی بـەراوردکردن نییـە، گـەر هەنـدێك لـە قسەوباسـی دارشـتن ئاسـاو ئامۆژگـاری سـەبارەت بـە بایـەخی ڕۆڵـی دایـك و بـاوك بەوپێیـەی سەرمەشـقی منـداڵان و تـازە پێگەیشتووانن جیابکەینەوە، بابەتەکە لەو رادەیەدا کۆتایی دێت، ئیدی دایـك و بـاوك توانای گۆڕینی کانزاکانیان نابێت و ناشزانن چۆن ئەوە ئەنجام بدەن، بەشێوازگەلێکی کردەیی، پێکهاتەی ڕۆڵەکانیان چـاك بکـەن و بـە شـێوەیەکی جیـاواز لـە هـی خۆیـان دایبڕێژنەوە، سەرەڕای سووربوونی فیترییان لەسەر کارکردن بەهەموو توانای خۆیان، بۆ بەرژەوەندی ڕۆڵەکانیان و بەرزکردنەوەی ئاستییان.

مەخابن تێڕوانینی دایك و باوك بۆ ئایندەی ڕۆڵەکانیان، لەبەر رۆشنایی رۆشـنبیری و پسـپۆڕی و ئـەزموکانی خۆیانـدا، لـەژێر کاریگـەری ئاڕاسـتە مادديیـە تاکگـەرای بەکاربەری تەواوی رۆشـنبیری خۆرئـاواییو ئـەو قۆناغـەی کـە پێیـدا گـوزەر دەکـات، لەگەڵ پێویستییەکانی و ئەو مەبەست و تێڕوانینانەی بڕیاریان لەسەر دەدەن، لـەپاڵ نەخۆشـییەکانی سـەردەمانی دواکـەوتنی کـەلتووریمان. لای جـەماوەری باوکـانی لای ئێمە هیچ شتێك بوونی نییـە جگـە لـە خولیـای زیـاتر بـۆ خودپـەرسـتی و سـووربوون لەسەر بژێوی و بـەکاربردن و کەڵەکـەکردنی مـاڵ و سـامان ئەوەنـدەی بـۆی بلوێـت و بارودۆخــەکان ڕێگــە بــدەن. ســەبارەت بــە کۆمــەڵگاش، ئــەوا سیســتمی گشــتی و بەرژەوەندی گشتی و هاوکاریی کۆمەڵایەتی و برایەتی ئیسلامی و مرۆیی و کەرامـەتی مرۆیی و مافەکانی جێنشـینێتی و کۆمـەڵگای یاسـا و بـەها و دادپـەروەریی و چـاکە و چێژی مەعریفە و داهێنان، بوون بە بابەتگـەلێکی سەفسـەتییانەی خـاڵی لـە مانـا لـە

جیهـانی دووڕووی و ململانــێ و ســەرکوتکاریی و ســتەم و گەنــدەڵیی و بەزایــەدان و ستەمکارییدا.

سەیریش نییە کە دەبینین قوتابخانەکان و دەزگاکانی فێرکردن و میدیا لە جیهانی ئێمـەدا ئـەرکی پێویسـتی خۆیـان ئـەدا ناکـەن لـە پێگەیانـدنی نـەوەی ڕێـزدار لـە هاولاّتییانی بەهێزی دەستپاك، ئەوانـەی بەهرەمەنـدن بـە توانـا و دەستپێشـکەری و ئەدای وردی تایبەت، لەسەر ئاستی سەردەم و ئەڵنگارییەکانی.

گـەر سـەیری دەزگاکـانی خوێنـدنی بـالاّ و بەشـدارییان لـە پێگەیانـدنی کـادر و ئەزموونی پەروەردەیی بکەین، ئەوا هەژار و سنووردار بەدیدەکەین کە کارەکـەیان لـە دەرچوواندنی ئەو مامۆستایانەدا کورت دەبێتەوە کە خاوەنی هیچ هۆکار و بەرنامـە و توێژینەوە و وزەی کـارای پێویسـت نـین بـۆ فێرکـردن و ڕاهێنانیـان، بـەڵکو سـووکی پێگـەی مامۆسـتا و نزمـی ئاسـتی بـژێوی و ئـەو خزمەتگوزارییـە فێرکارییانـەی بـۆی ڕەخساون، (کادرە) ناوازەکان لەم پیشەیە لا دەدەن و لە چوونە نـاو بەشەکەشـەوە، هەروەها بە شـێوەیەکی نـەرێنییش کاریگـەری بـۆ سـەر حـەزی ئەوانـەی ئـەم کـارە ئەنجام دەدەن و بۆ سەر حەزکردن لە باش بەجێگەیاندنی دەبێت.

گەر بەراوردی ئەو ڕێژەیەش بکەین کە نەتـەوە زینـدووە پێشـکەوتووەکان لـەکۆی خەرجیەکانو داهاتی نەتەوەییان وەبـەرهێنانی لەپـەروەردە و فێرکردنـدا پێدەکـەن، لەگەڵ ئەوەی دەوڵەتانی جیهانی ئیسلامی لەم بـوارەدا خـەرجی دەکـەن. تێدەگـەین ئـەوەی وڵاتـانی ئیسـلامی خـەرجی دەکـەن زۆر کەمـە. بـەڵکو کـۆی خەرجییـەکانی خوێندن –وەك هەمیشە– تەنیا (بەندێکی) مووچە زۆر کەمە نزمەکانە، کـە لەشـکۆی مامۆسـتا کـەم دەکاتــەوە و وەلائەکـەی وێرانـدەکات و گیـانی بەخشـش لەناخیـدا دەکوژێت، پـاڵی پێـوە دەنێـت بـۆ ئەنجامـدانی کـاری نەخۆشـانەی شـەکەتکار هـەتا هەندێك لە داهاتەکەی بەدەست بهێنێـت و تـەواوی بکـات لـەڕێی بـاوکی قوتابییـەکان وەربگرێت بەهۆی خۆشەویستکردن و وانە تایبەتەکانەوە. سەبارەت بەو داهاتانەی بۆ

خوێندن تایبەتکراون، ئەوا لە چەند شوێنێکی بنیایەکانیدا خەرجدەکرێن، کە دەستی پەرەپێدانی پێڕانەگەیشتووە.

گەر بۆ بەرنامە و ئامراز و هۆکارە پەروەردەییەکانیش و لە ڕادەی نزمی هۆشیارییەکەی بڕوانین، سەبارەت بە بایەخدان بە بونیادی دەروونی و ویژدانییانەی منداڵ، لەگەڵ گونجانیدا لەگەڵ ئەو قۆناغ و تەحەددایانەی منداڵ پێیاندا تێپەڕدەبێت و ئوممەتیش ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، ئەوا درك بەهۆکاری خراپ ڕاپەڕاندنی ئەرکی پەروەردەیی دەکەین، لەگەڵ داڕمانی مومارەسەکان و بەرنامەکانی خوێندن کە لەسەر شەکەتکردن و تۆقاندن و دەرخکردن دەمەزراون، لەگەڵیاندا منداڵ بێبەش دەبێت لە گەشەی ویژدانی و مەعریفی و جەستەیی، گەشەپێدانی تواناکانی بەو ئاستەی سەردەم و تەحەدداکانی دابینی دەکات و دەیخوازێت.

خۆ ئەگەر بۆ باوانیش بڕوانین –بە پیاو و ژنەوە– و بۆ ئەو پشکەش کە هەیانە لە فەرهەنگ و ڕووناکبیری پەروەردەیی، ئەوا ڕووبەڕووی شۆکی نەخوێندەوارییەکی پەروەردەیی دەبینەوە کە لە ڕەهاوە نزیکە، تەنانەت لەنێوان ڕووناکبیرەکانیشیاندا، ئەوەش بەهۆی گەندەڵیی ئەزموونیان لەو پرۆسە پەروەردەییانەی لە خێزان و قوتابخانە لەسەری پێگەیشتوون، بەهۆی کەمی ئەو ئەدەبیاتە زانستی و پەروەردەییەوە کە ئاڕاستەی باوان دەکرێت و خەریکە کورت دەبێتەوە لە لایەنە فیقهییە یاساییەکە و بەشە ئامۆژگارییە تەقلیدییەکەیەوە و ئەو وەرگێڕانە بیانییانەی پەیوەندییان بە بیروباوەڕ و کەلتوور و ژینگەکانیانەوە نییە، نە هاوکاریشیان دەکەن لەداڕشتنی کارەکتەری موسوڵمان و وردەکاری ئەنجامدانی کارەکانی و ڕوبەڕووبوونەوەی تەحەدداکانی سەردەمدا [1].

---

[1]. من بۆ خۆم ڕووداوێکم بینی کە ڕادەی دواکەوتووی هەندێك لە زانایان و شوێنکەوتوییەکەی لە تێگەیشتن لە ڕۆڵی ژن و دایك لە بونیادنانی کۆمەڵگا و بەشداریکردنی جددی لە ئەنجامدانیدا وێنا دەکات، کە نموونەیەکە حاڵەتگەلێکی زۆر لە کەموکوڕی ئەم فیکرە و شوێنکەوتوییەکەی لە ڕووبەڕووبوونەوەی زۆرێك لە بابەتە گۆڕاوەکاندا وێنا دەکات، لەگەڵ درککردنی ڕەهەندەکانی و ڕێگاکانی ڕووبەڕووبوونەوەیان،

له ڕۆژگاری منداڵیمدا گوێم له ڕادیـۆ دەگـرت، کـه لـەو کاتـەدا شـتێکی نـوێ و سـەرنجڕاکێش بـوو ئـەوەش بەیانیانی جومعه بوو کاتێك ڕاهاتبووین دوای دەستپێکردنی به قورئانی پیرۆز گـوێ بـۆ وتـاری بەیانییانـەی ئاین ڕادێرین، که یـەکێك لـه زانـا ناودارەکـانی مەککـه وتارەکـەی دەدا، لـەو بەیانییـەدا وتارەکـەی لەسـەر فێرکردنی ژن بوو گوێم له دایکم بوو (ڕەحمـەتی خـوای لـێ بێـت) دەیگـوت: (ئـەرێ ئـەوە ئـاین گـۆڕاوە؟) سەبارەت به نهێنی ئەم پرسیارەی لێم پرسی: ئەویش گوتی: (ئایا ئەوەی قسـه دەکـات فلانـه زانـا نییـه؟) (گوتم با خۆیەتی)، (گوتـی: ئەمه ئەو کەسه بوو که پێشتر فەتوای حەرامکردنی فێرکردنی نووسـینی کچـانی دابوو لەبەر ئەوەی گوایا دەبێته هۆی نووسینی نامەی عەشق و دڵداری)، تەنانەت بـەهۆی ملکەچـبوونی بـۆ فەتوا و ئامۆژگارییەکەی، کەوتبووە لێدانی پەنجـەکانی کچـه گەورەکـەی کـه فێـری پرنسـیپەکانی نووسـین بووبوو له حوجرەکاندا، لەو کاتەدا بۆ ئەوەی ڕێگری له نوسین و بەردەوامبوونی بکات، ئینجا گوتـی: (چـۆن ئەو کەسه لەمڕۆدا ئامۆژگاری کچان دەکات که بخوێنن و هانیان دەدات بۆی؟) بـه سەرسـامیی و دەربـڕینی ناڕەزایی و ئازارەوە پرسیاری کرد ئاخۆ دەبێت ئاین گۆڕدرابێت.

نموونەیەکی دیکەش له ئارادایه سەبارەت بـه دەستەوەسـتانی مەنهەجییانـه لـه تـەوزیفکردنی گشـتگیری و شیکارگەرایی بەئامانجی درککردنی گۆڕدراوەکان و بەهێزکردنی ئوممەت له توانایدا، بـۆ مامـەڵکردن لەگـەڵ تەحەدداکاندا، نمونەی ئەمەش وێنـەگرتنی فۆتـۆگرافی (التصـوير الشمسـی)، کـه فـەتواکاران بـۆ ماوەیـەکی دوورودرێژ لەسەر حەرامکردنی سـووربوون، تـا ئەمڕۆکـەش هێشـتا هـەر زۆرێـك لـەوان سـوورن لەسـەر ئـەو حەرامکردنه، ئەوەش که به دروستی داناوە لەو ڕوانگەیەوەیه که کارێك نییه مرۆڤ به مەبەستی ئەوە بیکـات که خۆی وەك هاوشێوەی خوا دابنێت، بەڵکو گرتنی سێبەره! نازانم بۆچی بۆ مـرۆڤ ئەنجامـدانی کارێـك بـه موباح دادەنرێت کـه دەبێتـه مایـەی دروسـتکردنی وێنەیـەك لـه سـێبەری بوونـەوەی زینـدوو گواسـتنەوەی شتەکه بۆ خۆی، بەڵام بەکارامەیی دەستی خۆی به حەرام بێت! گـەر ئـەوە بـزانین کـه وێنـەکانی ئێسـتای کۆمپیوتەر گرتنی سێبەر نین، ئەوا لەوەش تێدەگەین که فەتواکه دواکەوتووە و چیتر چارەسەری ئیشـکالی پشتگیریکردنی  موسوڵمان له بەکارهێنانی ئامڕازەکانی سەردەم ناکات.

وەڵامی دروست –بۆچوونی خۆم– له بەکارهێنانی مەنهەجییەتی گشـتگیرانەی شـیکارییانەدا پەنهانـه، لـەو سـۆنگەیەوە گـەر لـەڕووی جەوهـەرەوە لـه بابەتەکـه بـڕوانین درك بـه حیکمـەتی ڕێگـرتن لەوێنـەگرتن لـه سەردەمه ڕابردووەکانـدا دەکـەین کـه لـه جەنگانـدا بـووە لەگـەڵ ئـایینی بتپەرسـتیدا. لەکاتێکـدا کـه دوای شۆڕشـی پیشەسـازیی و زانسـتییانەی تـەکنیکی و داهێنـانی وێنـەگرتن و وێنـه ئەلکترۆنییـەکان، بـوون بـه بابەتگەلێکی خاوەن ئامانجی فێرکارانەی میدیاییانەی تـەکنیکی، هـیچ پەیوەندییەکیشـی بـه ئـەمر و نـەهی پێغەمبەرانـەوە نییـه مەگـەر لێکچـوونێکی زمانیانـه. ئـەو واژە (لفـظ)ییـەی بـۆ ئامانجـه ئایینییـەکان بەکارهێنراوە هەمان شتیشه بۆ ئامانجه زانستییه فێرکارییه تەکنیکییەکان، وەك چۆن بابەتەکه لـه حاڵـەتی زۆری دیکەشدا هەروایه، بۆ نموونه واژەی (السيارة) له قورئـانی پـیرۆزدا کـه مانـای کـاروانی گواسـتنەوەی

**بایەخی ئەدەبیاتی باوکایەتی پەروەردەیی:**

گرنگترینی ئەم ئەڵقانە لە زنجیرەی هۆکارەکانی چاکسازی کە پێویستە بیریار و ڕووناکبیران بایەخیان پێ بدەن بریتییە لە ئەڵقەی خێزان و باوکایەتی: باوکان و دایکان.

**ئەم بابەتەش چەند هۆکارێکی خۆی هەیە:**

أ- خێزان خاوەنی ئەوپەڕی بایەخی خۆیەتی لە پێکهێنانی سایکۆلۆژیای منداڵ و عەقڵیەتەکەی و گونجاندنی تواناکانی، بەوپێیەی شوێنی پێگەیشتن و باوەش و پەناگەی پێگەیشتنی منداڵە، لەبەر ئەوە لەسەر بناغەی دیدی ئەو و ژینگە و ئاڕاستەکردنەکەی -بە ئەرێنی و نەرێنییەوە- منداڵ سروشتی چەمکەکانی و دنیابینییەکەی خۆی دادەمەزرێنێت.

ب- پاڵنەری دایك و باوك کە بە پلەی یەکەم و بە پاڵنەری فیترەت، سووردەبن لەسەر هێنانەدی بەرژەوەندی منداڵەکانیان و بەرزکردنەوەی کوالێتی ژیانیان و ئاستی ئەداکردنیان. چونکە ڕۆڵی دایك و باوك و خێزان لە گرنگترین ئەو ڕۆڵانەیە کە ڕادەی کاریگەری ڕۆڵ و دەزگا فێرکاریی و پەروەردەییەکانی دیکە لای منداڵ دیاری دەکات، هەر ئەویشە ڕەوتی کاریگەری ئەو دەزگایانە و کاراییان ئاڕاستە و هەموار دەکات.

ت- بیریار و نووسەر و چاکساز توانای قسەکردن و گوتاریان بۆ دایك و باوك هەیە، تێچوونی ئەوەش لەبەردەستدایە، فیترەتی باوك و دایکانیش بۆ ئەوە یاریدەی دەدەن لەهەوڵداندا بۆ ئەوەی پێیانوایە بەرژەوەندی ڕۆڵەکانیانی تێدایە و هەوڵدان لەپێناو دەستخستنیدا، بەپێچەوانەی لایەن و دەزگاکانی دیکە کە بەرژەوەندیی و ئاڕاستەی تایبەتی خۆیانیان هەیە، ئەمانە لەسەر مانەوەی ئەوە سووردەبن کە لەواقیعدا هەیە و جێگیری دەکەن، هەر گۆڕانکارییەکیش دەبێت لە چوارچێوەی

---

بازرگانیی دەگەیەنێت، بەڵام لەمڕۆدا بەو گالیسکانەی گواستنەوە دەگوترێت کە خاوەنی جووڵەی خودیین، لەبەر ئەوەی (سیارة)ی ڕابردوو و (السيارة)ی ئێستا پێکەوە کۆدەکاتەوە تەنیا لەفزەکەیە و گشتیبوونی مانای جووڵە و گواستنەوەیە.

پارێزگـاریکردنی دۆخـی ئامـادە بەرێوەبچـێت، بـۆ پاراسـتنی و زیانگەیانـدن لـە هاوسـەنگییە ئاڵۆزییـەکانی و بەرژەوەندییـەکانی جێبـەجێکاران لەکۆمـەڵگادا، هـەر گۆڕانکارییەکیش لە لایەنی دەزگکانەوە تەنیا بۆ پاراستنی ئەم دەزگایانە و بارودۆخی ئامادەبێت، لە باشترین حاڵەتیشدا بـەدەم خواسـتەکانی گۆڕانکارییـە بنەڕەتییـەکانی جەماوەری ئوممەتەوە دێت، بەڵام بەوپەڕی دڵنیاییەوە ئەمانـە ئـەو لایەنانـە نـین کـە دەست بە گۆڕانکاری دەکەن و دەستپێشکەری بۆ دەکـەن و وزەکـانی دەتەپێننـەوە. لەبـەر ئـەوە پێویسـتە بیریـاران و چاکسـازان بایـەخ بـە خێـزان بـدەن و بـە ڕۆڵـە پەروەردەییەکەی و بەرهەمهێنانی ئەدەبیاتی پێویستی قەناعەتپێکەر و کردەییانـەی هۆشیاری باوکان و دایکان و فێرکردنی ئـەوەی کـە چـۆن بتـوانن توانـای ئەنجامـدانی ڕۆڵـی پـەروەردەیی خۆیانیـان هـەبێت، لەسـەر بناغەگـەلێکی دروسـتی زانسـتییانەی تاقیکراوە، لەسەر بناغەگـەلی جـێگیرە بـەهای و کـەلتووریی و ویژدانییـە ئیسـلامییە دروستەکان.

پێویسـتە بەچەشـنێك بـۆ خێـزان و باوکایـەتی و دایکایـەتی بڕوانرێـت بەوپێیـەی (سـینا)ی ئوممـەت و سـەردەمەکەن، لـەو ڕووەوە کـە بریـاران و پەروەرشـیاران لـە پێغەمبـەرانی چاکسـازی ژیـاری ئیسـلامین، دەتـوانن –بـە جددییـەت و دڵسـۆزیی و بونیـادنراو لەسـەر زانسـت و شـارەزایی– کـە باوکـان و دایکـان بـدوێنن، بەوپێیـەی گرنگترین لایەنی پەیوەندیدارن بە پـەروەردەی منداڵـەوە، بەشـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ، بەبێ لەمپەڕ و بە کەمترین تێچوون.

لە ژیانی نەوەی ئێمەدا مۆدێل و شێوەگەلێکی زۆر هەن کە ئـەوە ڕوون دەکەنـەوە چۆن باوکان و دایکان توانیویانە وا بکـەن ڕۆڵـەکانیان ئـەو بەربەسـتانە بـبڕن و بـازی فراوانی ژیارییانەیان لەماوەی یەك نەوەدا پێ بدەن، لەبەر ئەوەی ڕووبەڕووی چەمك و تێڕوانینگەلێك بوونەتەوە کە قەناعەتی پێهێنـاون بـە بـەهای خـوازراوی گۆڕانکـاری و زانیاری و ئەزموونی پێویستیان پێبەخشراوە.

به قەناعەتهێنان بە باوکان و دایکان کاریگەری و فشاری کردەیی لەسەر سەرجەم دەزگا کۆمەڵایەتییە پەروەردەیی و فێرکارییەکان زیاد دەکات، بۆ چاککردنی ئاستی ئەداکردنیان و بەدەمەوەهاتنیان لەگەڵ زۆرێک لە خولیاکانیاندا، بەجۆرێك کە بەشداری بکات لە چاککردنی ئەدای ئەم دەزگایانە لە پەروەردەکردنی نەوەکاندا.

خۆشەویستی و سۆز و چاودێری و ئاساییش مەرجگەلێکی بنەڕەتین بۆ سەرکەوتنی هەوڵی زانستییانەی پەروەردەیی و بەکارهێنانی وزەی خۆشەویستی لە ئاڕاستەکردنی ئیجابییانەی منداڵدا. خۆشەویستی دایك و باوك و سۆزی ئەوان هەست و نەستی خۆشەویستی و پابەندبوون و خولیا بەرەو دایك و باوك لای منداڵ دروستدەکەن، وەك چۆن پەیوەندی خۆشەویستی لەلایەن دایك و باوکەوە ئەو چاودێریی و سەرپەرشتییە بەرهەمدەهێنن کە بە منداڵی دەبەخشن، کە پەیوەندی خۆشەویستی لەلایەن منداڵەوە بۆ دایك و باوکی، حەزی بەدەمەوە هاتن بۆ ئامۆژگارییەکانی و ترس لە تووڕەکردنیان لەلا دروستدەکات. وزەی خۆشەویستی بەهەردوو بەشەکەیەوە، ئەرێنی: کە بریتییە لە حەزی دەستخستنی خۆشەویستی دایك و باوك، نەرێنییەکەش: بریتییە لە ترسی ئیجابی لە لەدەستدانی خۆشەویستی ئەوان و متمانە و سەرسامبونیان پێی، کە پاڵی پێوە دەنێت بۆ بەدەمەوە هاتن و تێکۆشان بۆ ڕازیکردنیان و هەوڵدان و بەرهەمهێنانی وزە بۆ ئەوەی جێگای گومانی باشی ئەوان بێت.

لەبەر ئەوە پێویستە هۆشیاری لای هاوسەرەکان دروست بکەین بۆ درککردنی ڕۆڵە ئەرێنییەکانیشیان ئامادەیان بکەین و بۆ بونیادنانی پەیوەندییان لەسەر خۆشەویستی و بەزەیی لەنێوان یەکتریدا بە پلەی یەکەم، گەر بیانەوێت ئەم سیفاتانە لە سیفاتی ڕۆڵەکانیان بن، چونکە ئەوەی هیچ شك نەبات هیچیش نابەخشێت (فاقد الشيء لا يعطيه)، ئەو ماڵە هەڵوەشاو و داڕماوەش کە لەسەر بێزاندن و ناکۆکی و لەبۆسەدابوون و ڕق و کینە دامەزرابێت، دەبێتە ئەو ژینگەیەی کە ئومێدی ئەوەی لێ ناکرێت پەروەردەی بچکۆڵەکانی بەباشی بکات و ئەو ژینگەیەیان لەلا بڕەخسێنێت کە

ماناکـانی خێـر و بەخشـین و دەستپێشـکەری و داهێنـان لـە دڵ و ویژدانیانـدا گەشـە پێـدەدەن. بـەڵکو ئـەمجۆرە ژینگەیـە شـوێنێکی بـە پیتـە بـۆ ڕق و کینـە و خراپـە و گەندەڵی کە دەبێتە هۆی لادان و تاوان و کینە لەکۆمەڵەدا. وەك چۆن پێویستە ئـەم هۆشدارییە و ئەم بایەخدانە بە ئەدەبیاتی بونیادنانی خێزان بەشێکی گرنگ بێت لـە هــەوڵی بریــاران و چاکســازان و لــە بەرنامــەکانی پــەروەردە و هۆشــیارکردنەوە و فێرکردنـی ئوممەتـدا بـەجۆرێك کـە نەخوێندەوارییـەك لـەئارادا نـەبێت سـەبارەت بـە ڕێســـاکانی پەیوەندییـــەکانی خێـــزان و بەرپرســـیارێتییەکان و تێگەشـــتنیان و قەناعــەتهێنان پێیــان لەســەر بناغەگــەلێکی زانســتی، بــۆ نموونــە پێشکەشــکردنی بەرنامەی خوێندنی پەیوەست پێیانەوە، بە دەستپێکردن لە بەرنامـەکانی قوتابخانـە دواناوەندییەکانەوە، لەگـەڵ پێشکەشـکردنی بەرنامـەی فێرکـاری زانکـۆیی تایبـەت و پەیوەسـت بـە پێکهێنـانی خێـزان و پەیوەندیـەکانی، لـەپێناو ئامـادەکردنی لاوان بـۆ ژیانێکی خێزانییانەی پەروەردەییانەی سەرکەوتوو کە پشت بەو ئـەدەبیاتی زانسـتی یــە دەبەســتێت کــە بیریــاران و پســپۆڕان و ســەنتەرەکانی توێژینــەوەی زانســتی بەرهەمیدەهێنن.

بێگومان بە تـەنیا هەسـت و سـۆزی خۆشەویسـتی و چـاودێریکردنی منـداڵ بـەبێ ئاشنابوون بـە یاسـا دەروونـی و کۆمەڵایەتییـەکان لەسـەر بنەماگـەلێکی لێکـۆڵراوەی زانستی، باشی پەروەردە و سەرکەوتن تێیاندا مسـۆگەر ناکـات، بـەڵکو خۆشەویسـتی نەزانانـە ئەوپـەڕی زیـان دەگەیـەنێت، گـەر بێتـە مایـەی نازپێـدانی زیادەڕەوانـە کـە بێتوانایی و ئەنانیەتی لێ بەرهەم دێت، ئەوەشـی کـە لێیـان دەکەوێتـەوە، لـەتوانای منداڵی تازەپێگەشتوو و هەست و نەست و کۆڕانەکانی کە لە ئاکامدا بەرەو یاخیبوون و گەندەڵی و تاوان پاڵیان پێوەدەنێت.

**کارایی مەعریفەی پەروەردەیی، ئەزموونێکی خێزانییە:**

ڕەنگە کارێکی بەسوود بێت گەر نموونەیەك بۆ وانەیەکی پەروەردەیی بهێنینەوە کە بۆ خۆم ئەزموونم کردووە و ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە چۆن ئەو پەروەرشیارەی هەوڵدەدات ڕۆڵەکانی خاوەنی سیفاتی جوان بن، لە شێوازە پەروەردەییەکاندا پشتیوانییەکی گرنگ بۆ خۆی بەدی دەکات، لە بەدیهێنانی ئامانجەکانی و دوورخستنەوەی منداڵەکانی بە زۆریی لە هەڵە و نەریتە خراپەکان، بەبێ تێگەیشتن و بەردەوامیدانی پەروەردەیی هەرگیز سەرمەشقێتی بەتەنها شوێنەواری پێویست جێناهێڵێت، چونکە زۆرێك لەوانەی لە خودی خۆیاندا سەرمەشقن لە ڕەفتار و سروشتی دەروونی خۆیاندا، لەڕووی پەروەدەییەوە لەگەڵ ڕۆڵەکانیاندا بەردەوام نابن، کە لادانی زۆرێك لە ڕۆڵەکانی ئەو باوکانە تەفسیر دەکات، کە چاکسازییان لە باشێتی پەروەردەی منداڵەکانیاندا و لە سەلامەتی ئاڕاستەکردنیاندا شەفاعەتیان بۆ ناکات.

ئەو دیمەنەم لەیادە لەنێوان دایکم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەگەڵ برا بچکۆلەکەمدا، جارێکیان دەچێتەماڵەوە و بەهەڵچوونەوە ورتەورتە دەکات، چونکە وشەی پێویستی بەدی نەکرد تا گوزارشت لە هەستی خۆشیەکەی بکات بەوەی دوو دەستە بچکۆلەکانی هەڵیگرتبوون. کە (ئامێرێکی برژاندن)ی دەسك ڕازاوەی هەڵگرتبوو، لەو جۆرانەی دەنکی قاوەیان پێ دەبرژێندرێت، بۆ ئامادەکردنی قاوەی عەرەبی، بەفرێدراویی لە ناوەڕاستی ڕێگا تەنگەبەرەکەی بەردەم ماڵ دۆزیبوویەوە، لەوانەیە لە هەندێك لەو ڕێبوارانەی عەرەبی کەوتبێت کە دەچنە مەککە، بەهۆی تێپەڕینیان زۆر بە ڕێگاکەدا، دایکم پێشوازی لە منداڵەکە کرد و منیش سەیرم دەکرد بزانم چی لەم (شتە دۆزراوەیە) دەکات؟ سەرسام بووم کە بینیم مناڵەکەی بە نەرمی خستە سەر قۆڵی کە (مەکینەکە)شی هەر بە دەستەوەبوو، دەبینم بەرزی دەکاتەوە تا دووبارە بیخاتەوە سەر جادەکە و بۆی ڕوونبکاتەوە کە ئەم ئامێرە هی ئێمە نییە و نایبەین، ئاشکرایە کە مەبەستیشی ئەوە بوو کە کوڕەکەی بەوە ڕانەیەت کە شتێك بهێنێتەوە ماڵەوە کە هی ئێمە نییە.

کاتێك لەم وانەیە وردبوومەوە زانیم کە ئەمجۆرە منداڵە ئیتر دەست بۆ هیچ شتێك نابات کە هی خۆی نەبێت، ئەوەش لە ناخیدا دەچەسپێت –بە زمانێکی باشتری پەروەردەیی– کە چاونەبڕێتە هیچ شتێکی دیکە، تەنانەت گەر لە ناوەڕاستی ڕێگاش فڕێدرابوو، چەند منداڵ بوون بە دز کاتێك دەستە بچکۆڵەکانیان بۆ ماڵی ئەوانی دیکە درێژکردووە و بە بابەتە دزراوە نزمەکەیانەوە بۆ ماڵێ گەڕاونەتەوە؟ کە خۆشی بەدی دەکات بەتاڵانییەکەیەوە لەگەڵ بەڕاستدانانی سەرجەم درۆکانی، ئیدی نەفسی ڕادێت و بە بەرائەتەوە لەسەر نەریتی دزیی و درۆکردن ڕادێت، بەهۆی نەزانینی و بێئاگایی کەسوکاریانەوە و بەدوادانەچوونی ڕەفتار و چالاکییەکانی ڕۆڵەکانیان.

ئەوەش ون نەبووە لە کوڕەکە کە کەشوهەوای خۆشەویستی و سازان و چاودێری و ئاساییش لە ماڵەکەیدا، لە پشت ئەو بەدەمەوەهاتنەوە بووە کە وای لە دایك و باوك کردووە کە چاکە لە دڵی منداڵە بچکۆلەکانیاندا زاڵ بکەن، ئەوانەی حەزدەکەن لە پاڵ دایك و باوکیان و لە ماڵدا بن، دوور لە هاوڕێیەتی شەڕەنگێزان و دەسەڵاتی هاوەڵانی خراپ، هەروەها وایکردووە کە ڕۆڵەکانیان بەیەك نەوەدا بۆ چەندین سەدەی ژیاری بپەڕێننەوە کە دەلالەت دەکاتە سەر ئەو توانایەی چاکسازیی و گۆڕانکاریی کە شێوازە پەروەردەییەکان هەیانە.

هەروەها لەبەر ئەوەش کە من لە ڕووی پەروەردەییەوە دەزانم کە منداڵ هەمیشە خەمی ئەوەیەتی بۆچوونی دایك و باوکی سەبارەت بەو ئایدیایانەی بزانێت بۆی دەردەکەون و ئەو پرسیارانەش کە لای دەورووژێن و ئەو هەڵوێستانەش کە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، کە من –هێندەی بمتوانیبایە– سووردەبووم لەسەر ئەوەی لەگەڵ منداڵاندا بوومایە کاتێك سەیری بەرنامەیەکی تەلەفزیۆن دەکەن. گرنگترین ڕۆڵیش کە پێی هەڵدەستام، کاتێك سەرنجی پەیامێکی نەرێنیم دەدا کە دیمەنێك لەم بەرنامانە پەخشی دەکرد، کە بەدواداچوونێکی ڕاگوزاری کورت و دیاریکراوم هەبێت، بەشێوازێکی گونجاو بۆ ئەوەی پووچی پەیامەکە دەربکەوێت و بەرپەرچی بداتەوە و هەڵەکانی ڕاستبکاتەوە، بێئەوەی منداڵ بێبەش بکرێت لە چێژی بەدواداچوون و

لەزەتکردن لە بینینی چیرۆکەکە یان بەرنامەکە، گەر پێویستیشی بە بەدواداچوون و مشتومڕی زیاتر بکردایە، ئەوا دوای بەرنامەکە بە ئاکام دەگەیشت، بەشێوازێکی گفتوگۆیەکی کراوە بۆ تاوتوێکردنی گرنگترینی ئەوەی تێدایە بەمەبەستی ڕوونکردنەوە و ڕاستکردنەوە و ئاشناکردنی منداڵ بە بۆچوونی دایك و باوکی و بەجێهێشتنی بابەتەکەش تا لەسەری منداڵدا خول بخوات تا بەهێمنی و ئارامیی دەچێتە قووڵاییەکانیەوە.

ئەو شێوازە لە ماوەی ئەزموونی مندا کاریگەرییەکی ئاکتیڤی هەبوو لە بەرەنگاربوونەوەی زۆرێك لە شوێنەوارە نەرێنییەکانی بەرنامە تەلەفزیۆنییەکان، پێویستە لەسەر پەروەرشیاران کە باوکان دەوڵەمەند بکەن بە زۆرێك لە ئامۆژگاری پەروەردەیی بۆ جوانی مامەڵەکردنی کارای عەمەلییان، لەگەڵ ئەوەی ڕووبەڕووی دەبنەوە لە هەڵوێستی پەروەردەیی لە ژیانی منداڵدا، لەگەڵ ئەو هەڵوێست و تەحەددایانەی دەیبینن، کە دواترینیان تەحەدداکانی پەخشی ئەلکترۆنییانەی (ئینتەرنێت) و بەرنامەکانی (کۆمپیوتەر) نابن.

گرنگترین ڕەگەزەکانی ئەو پرۆژە پەروەردەییەی ئەم کتێبە بانگەشەی بۆ دەکات، بریتییە لە تەرخانکردنی بەشێکی گرنگ لە هەوڵی بیریاران و پەروەرشیاران و چاکسازانی ئیسلامی و دەستەبەرکردنی پشگیری مەعنەویی ئەو لێکۆڵینەوە زانستیانەی کە گوتاری زانستی ئیسلامی قەناعەتپێکەری کاریگەر بۆ باوکان و دایکان ئاڕاستە دەکات و لەڕووی پەروەردەییەوە ڕووناکبیریان دەکات و شێوەکانی شێواندنی کەلتووری و کەموکووڕیی پەروەردەییان پێ بناسرێت، لەگەڵ شوێنەواری ئەوەش لەسەر بونیادنانی ڕۆڵەکانیان و ئوممەتەکەیان، لەڕووی ئایینی و دەروونیی و مەعریفی و ژیارییەوە، چاوکردنەوەیان بەو زانیاری و ڕێگا و ئامرازانەی وایان لێدەکات بتوانن ڕۆڵی خۆیان ببینن، لە پەروەردەکردنی ڕۆڵەکانیان و چاودێریکردنی گەشەکردنیان و سەقامگیربوونی بونیادی دەروونی و ویژدانیی و مەعریفییان،

بەجۆرێك كە وزەكانی خۆشەویستی و دادگەری و هەوڵ و خۆڕاگرتنیان لێوە سەرچاوە بگرێت، لایەنە فیترییەكانی دایك و باوكیان بەرانبەر منداڵەكانیان لێوانلێو بكات.

مایەی نەنگییە كە كتێبخانەی نەتەوەكان ببینین پڕاوپڕە لە سەدان و هەزاران كتێب و توێژینەوەی زانستی و پەروەردەیی كە چاوساغی دایك و باوكان دەكەن بە هۆكاری ڕووناكبیریی و پەروەردەیی كە یاریدەیان دەدات بۆ ئەنجامدانی ڕۆڵ و كاریگەرییان لە پەروەردەكردنی جگەرگۆشەكانیاندا، لەكاتێكدا كە دەبینین كتێبخانەی ئیسلامی لە كاروبارەكانی خێزان و پەروەردە خەریكە خاڵی بێت لە كتێب و توێژینەوەی زانستییانەی جددی، زۆربەی ئەوەش كە دەریدەكەن، لەو كتێبە زۆر كەمانە، لەوە تێپەڕناكات كە دووبارەبوونەوەی وتارگەلێكی وەعزیی دەسەلاتگەرانە، یان كتێبی یاسایی و فیقهی بن كە پەیوەستن بە ئەحكامی گرێبەستی هاوسەرگیری و بڕیارەكانی تەلاق و وەسیەتكردن بۆ منداڵان و بەشكردنی میرات، زۆربەشیان بابەتانێكن كە پەیوەندییان بە جەوهەری پەروەردە و پەیوەندییە مرۆییەكانەوە نییە، نە زانستێكی (سننی)یانەش پێشكەش دەكەن، نە زانینێكی زانستی كەلتووری پەروەردەیی، كە ئەمانە بابەتگەلێكن خەڵكانی گشتی پێویستیان بە فێربوونی وردەكارییەكانیان نییە، چونكە مەلا و قازی و حاكم كاری وردەكارییەكانیان لەكاتی پێویستدا دەگرنە ئەستۆ، – لەم كاتەشدا – بە ئیجرائاتەكانیان و دەركردنی یاسای پێویست لەبارەیانەوە هەڵدەستن. ئەو چارەسەر و فەرهەنگە پێویستەی دەبێت بەرهەمبهێنرێت لەپێناو پێشخستنی كاروباری خێزان و پەروەردە و فێركردن و پەرەپێدانیان، پێویستە لە لێشاوێكی دانەبڕاوی لێكۆڵینەوە و توێژینەوە تاقیكردنەوەدا بەردەوام بێت، لەگەڵ بەدواداچوونی تەحەدداكان و گۆڕانكارییەكانی پەیوەندییەكان و هەلومەرج و تواناكان و بابەتە تازەكانی مەعریفە و زانیارییەكان، بە لێكۆڵینەوە دەروونییەكانەوە و لێكۆڵینەوەكانی مێشكی مرۆڤ و جینەكان و بوارە نوێیەكانی دیكەی مەعریفە كە بۆ ئاسۆگەلی فراوانی نوێ لە زانینی نهێنییەكانی فیترەتی دەروونەكان و بوونەوەرەكان درێژدەبنەوە.

**مامۆستا هاوشانی خێزانه:**

گەر پاڵنەری فیتری لای باوکان لـه سـووربوون لەسـەر پەرژەوەنـدی ڕۆڵـەکانیان و دەستەبەرکردنی ئەوەی بەرژەوەنـدییانی تێدایـە، بریتیـی بێـت لـە یەکـەمین بناغـەی بەهێز، کە پێویستە هەموو هەوڵێکی جـدی بـۆ چاکسـازیکردن لـە مەعـدەنی مرۆڤـی موسوڵماندا پشتی پێ ببەستێت، ئەوا مامۆستا خاوەنی ڕۆڵێکی گرنگە لەمەشدا، لـەو ڕوانگەیـەوە کـە پشـتیوان و ئەڵتـەرناتیڤی یەکـەمی مەیـدانی ڕۆڵـی خێزانـە لـە پـەروەردەدا، هـەروەها لـەو سۆنگەیەشـەوە کـە ئـەو ڕەگەزەیـە کـە کۆمـەڵگا کـاری فێرکردنی چاوگەشەکانیان پـێ دەسـپێرێت، لەگـەڵ چـاودێریکردن و ئاڕاسـتەکردن و گەشەپێدانی تواناکانیان و دەمەزەردکردنەوەی بەهرەکانیان.

فەرهەنگی مامۆستا و بەرنامە پەروەردەییـەکانی و هۆکـارە ڕەخسـاوەکان لـەلای، بایەخێکی گەورەیان هەیە لە گەشەپێدانی منـداڵ لـە ڕووی مـەعریفی و ویژدانییـەوە، هـەتا چـەمکەکانی باوکـان و مامۆسـتایان گونجـاوبن لەگـەڵ یـەکتردا و هەوڵـەکانیان هەماهەنگ بن، هەوڵەکان کاراتر و ئەنجامەکان ئەرێنیتر دەبن.

زۆربەی هەڵەکان و لایەنەکانی کەموکووڕیی لە کاری مامۆستایان و قوتابخانەکان و پلانەکانی پەروەردە و فێرکردن لـە زۆرێـك لـە وڵاتـانی (گەشـەکردوو) دا دەرەنجـامی خراپی جێبەجێکردن، یان خراپی مەبەست نییە، بەقەدەر ئەوەی لە کـەموکووڕی لـە ئەدا دەکەنەوە و لـە بەدواداچـوونی نامۆکارانـەی کوێرانـە لـە بونیادنـانی پلانـەکان و بەرنامە و چالاکییە فێرکارییەکاندا.

بایەخـدان بـە مەسـەلەکانی مامۆسـتا و ئامـادەکردن و چـاودێریکردنی، هـەروەها بایەخدان بە مەسەلەکانی فێرکردنی گشتی و میتۆدەکانی و ئامڕازەکانی و لایەنەکانی کـەموکووڕیی تێدایـە، ئـەم مەسـەلەیە دەخاتـە بـەردەم ئوممـەت و زۆر یاریـدەی ڕاستکردنەوەی ڕوانگەی لایەنەکانی بەرپرس لە پەروەردە و فێرکردن دەدات کە —لـە زۆر لە حاڵەتەکاندا— هیچ ناڕەحەتییەك لە ڕیفۆرمی زۆربەیاندا بەدیی ناکات، هەروەها لەوەبـەرهێنان لـە ڕێگەیـەوە لـەو نەوانـەدا کـە دێـن، بەشـێوازێکی هاوسـەنگی

پـەروەردەیی، بەتایبـەتیش کـە ئوممـەت شـوێنەوارەکانی ئـەم چاکسـازییانە و ئـەم میتۆدانەی لە گەشەپێدانی تواناکانی نەوەی تازە پێگەیشتوو چـاککردنی ئەداکەیانـدا درك پێکردووە.

مامۆستا لە سووربوونیدا لەسەر بەرژەوەندی منداڵ و سەرکەوتنی کارەکەیدا، وەك بـاوك وایـە، ناشـتوانێت ڕۆڵـی خـۆی ببینێـت تـەنیا ئـەو کاتـە نـەبێت کـە هۆشـیارکردنەوەکەی تێروتەسـەل بێـت و هەلومەرجـەکانی ژیـانی و پێگـە کۆمەڵایەتیەکـەی چـاك نـەکرێت، ڕۆڵـە پەروەردەییەکەشـی پشـگیری نـەکرێت بـە توێژینەوەی پەروەردەیی زانستی و بە کتێب و کەرەستەی خوێنـدنی مەنهەجییانـەی کارای پەرەسەندوو و بریاران و دەزگا پەروەردەییە فـەرمی و نافەرمییـەکان و هـەوڵی چاکسازان، ئەمانەش دەتوانن بە پشکێکی باش بەشداربن لە پشگیریکردنی مامۆسـتا و پەرەپێدانی فیکر و هۆکار و ئامڕازە پەروەردەییەکانیدا.

**گوتاری پیرۆزگەرانەی ئاینی، پەیوەندی نێوان مەعریفی و ویژدانی:**

زانیارییەکان بە هەڵقوڵان و نوێبوونەوەیان کۆتاییان نایەت، بە بەدواداگەڕانی زیاتر و پێداچـوونەوە و پەرەپێـدانیان لـە وەسـتان ناکـەون، مادامـەکی ژیـان بـە دەمـاری مرۆڤەکاندا بڕوات. چونکە مەعریفە لە بێشکەوە تا گۆڕ لە خواستن و نوێبونەوەدایـە. لەکاتێکدا کە لایەنە ویژدانییە دەروونییە پەروەردەییەکان کاتو رادەی خۆیانیـان لـە قۆناغەکانی تەمەن و گەشەی مرۆییدا هەیـە کـە تێیناپـەڕێنن، لەبـەر ئـەوە پێویسـتە لایەنی دەروونی ئەو بناغەیە بێت، کە جـۆری مـەعریفی و شـێوازی فێرکردنـی لەسـەر بونیادبنرێت، تەنانەت لە بواری فێرکردنی عەقیدە و بەها ڕەوشتییەکانیشدا.

هەموو ئەوانەی پێشکەش بە منداڵ دەکرێن لە زانست و زانیارییەکان –تەنانەت لە بـواری فێرکردنـی قورئـانی پیرۆزیشـدا– پێویسـتە سـەرنجی شـوێنەوارەکانی لەسـەر پێکهاتنی عەقڵی و بونیادی دەروونی و سۆزگەرایی منداڵ بدرێت، لە هەموو قۆناغێك

له قۆناغەکانی منداڵێتیەکەیدا، لەو ڕوانگەیەوە کە (لکل مقام مقال: هەموو شوێنێك قسەوباسی خۆی هەیە).

ڕەنگە لە گرنگترین ئەو بوارانەی پێویستە بێت پەیوەندی بابەتی مەعریفی تێدا بە بابەتی سۆزگەراوە دەروونییەوە (الوجدانی) ڕوونبکرێتەوە و سەرنجی کاریگەریی ئاڵوگۆڕکراوی نێوانیان بدرێت، بریتی بێت لە بواری فێرکردنی ئاینی — فێرکردنی قورئانی پیرۆز بۆ منداڵ بۆ نموونە — لەو ڕووەوە کە بەرنامە تەقلیدییەکان لەسەر ئەوە ڕاهاتوون کە بەشێوەیەکی هەڕەمەکییانە قورئانی پیرۆز فێری خەڵك بکەن، ئەوان هەر لەسەرەتای منداڵییەوە خوێندنی بەشی سییەم لە قورئانی پیرۆز فێری منداڵ دەکەن و پێشی لەبەر دەکەن، لەوانەشە لەبەر ئەوە بێت، کە سوورەتە کورتەکان لە سوورەتە درێژەکان ئاسانترین لە ڕووی لەبەرکردنەوە، هەروەها لەبەر ئەوەش کە زۆربەی بابەتەکانی ئەو سوورەتە مەککەییانە بریتییە لە غەیب و عەقیدە [١]، ئەم مەنهەجە —بە بۆچوونی ئێمە— دەبێت ڕاستبکرێتەوە و قورئانی پیرۆز لەسەر بنەماگەلێکی میتۆدییانەی زانستییانەی پەروەردەیی پێشکەش بە منداڵ بکرێت.

جوزئی سییەم بریتییە لە گوتارێکی خودایی، کە گوتارێکە زیاتر ڕووی لە کافرە زۆردار و نکوولێکارەکانە، لەگەڵ ئەو سووکایەتی و سزا و خراپی و چارەنووسەی کە هەڕەشەیان لێ دەکات پێیان، بە هەموو ئەو هێز و ڕەوانبێژییەی زمان هەڵگریەتی، لە هەڕەشە و بەڵێندان بە سزا، لەپێناو بانگکردنی ئەو لوتبەرزانە بۆ تێگەیشتن لە حەقیقەتی حاڵی خۆیان و بەدیی سەرەنجامیان، گوتارێکە بۆ حاڵی پێگەیشتووانی لوتبەرزان گونجاوە تا بەرپرسیارێتییەکەیان دیاری بکات و سەرەنجامەکانی

---

[١]. ژمارەی سورەتەکانی جوزئی سییەم دەگەنە سی و حەوت سوورەت، هەموویان مەککین سێ سوورەتی نەبێت، ئەوانیش: سوورەتی (النصر، الزلزلة و البینة)ن، لەگەڵ سێ ئایەتی یەکەمی سوورەتی (الماعون). بڕوانە:

— مخاوف، حسنین. صفوة البیان لمعاني القران، الکویت: وزارة الأوقاف و الشؤون الاسلامیة الکویتیة، ط٣، ١٤٠٧هـ/١٩٨٦م.

کارەکـــەیان بخاتـــە بەرچـــاویان و بـــۆ دروســـتی و ئاگـــایی خۆیانیـــان بگەڕێنێتـــەوە. شـوێنەوارەکانی ئـەم گوتـارە بـۆ پێگەیشـتووان (البـالغین) ئـەوە نییـە کـە بیانکاتـە پیاوانێکی ترسنۆك، بونیادی دەروونیشیان تێدا بڕمێنێت، بەڵکو چاویان دەکاتـەوە و ڕابەرێتییان دەکات و بـە بەڵگـە دەیانبەسـتێتەوە و داوای دووربوونـەوە و تێفکـرین و تێڕامان و بە هەندوەرگرتنی سەرەنجامەکان و ڕێنماییکردنیان بۆ باشەکان دەکات.

بەلاّم هەمان گوتار، گەر ئاڕاستەی منداڵێکی بچـکۆلەی نەونـەمام بکرێـت، هـەمان کاریگەری نابێت، لەبەر ئەوە منداڵی بچکۆلە پێویستی بە هەڕەشە و ترسـاندن نییـە. خـۆ گـەر هەڵـەمان کـرد و بـەو گوتـارە لەگەڵیـدا دووایـن کـە قورئـان ڕووی پـێ لـە نکوڵیکـاران دەکـات، ئـەوا شـوێنەواری دەروونـی و سـۆزگەرایانە –لـە حاڵـەتی بچکۆلەیەکی بێتاواندا– جیاوازە و بونیادی دەروونـی و وێرانـدەکات، چـونکە تـرس و تۆقینی تێدا بلاّودەکاتەوە و هێز و ئازایەتیی تێـدا دەمرێنێـت، ژیـانیش لەبەردەمیـدا دەکاتە بیابانێك کـە لێـی دەترسـێت و بەشـێوەیەکی نەرێییانـە هەڵوێسـتی بەرامبـەر وەردەگرێت، ئیدی نەك بە گیـانی جێنشـینێتی، بـەڵکو بـە گیـانی تـرس و غـەریزەی مانەوەوە دەبزوێت، ناکرێت لە دەروونی کەسـی ترسـاوی تۆقیـودا توانـای داهێنـان و هێزی بەخشیش گەشە بکات، چاوەڕێش ناکرێت پەیوەندییەکـەی بـە خـودا و ژیـان و ڕۆژی دواییـەوە، لەسـەر هەسـت و نەسـتی خۆشەویسـتی و تاسـە و جـوانیی و وزەی ئەرێنیی بونیاد بنرێن.

لەوانەیە ئەمە –تاڕادەیەکی زۆر– ڕاڤەی نەرێنیبوونی دەروونی موسوڵمانان بکات لەسەدەکانی داڕماندا، کە خۆشەویستی خـوای تێـدا لاواز بـوو و جددییـەتی ژیـان ون بوو، نموونەی ئەم جۆرە نەفسـانە لـە وێنـەی ڕۆژی دواییـدا نابینیـت، مەگـەر کلێپـەی دۆزەخ، گەرچی چارەنووسی موسوڵمان ––بەهۆی ڕەحمەتی خواوە– بۆ بەهەشتە، (تەنانەت گەر زیناش بکات و دزیش بکات)[١].

---

[١]. ئەحمەد لەمەسنەدەکەیدا گێڕاویەتەوە، ئەبو دەردا (ڕەزای خـوای لێبێـت) وتوویـەتی: پێغەمبـەری خـوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: هەرکەسێك بڵێت (لا اله الا الله وحـده لاشـريك لـه) ئـەوا دەچـێتە

چونكه خوای گەورە لەسەر كردەوەكانی مرۆڤ بەگشتی لێیان دەپرسێتەوە، نەك تەنیا لەسەر ئەو هەڵانەی دەیكەن، ئیتر چاكە و خراپەكانیان دەهێنرێنەئاراوە، ﴿إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ ذَلِكَ ذِكْرَى لِلذَّاكِرِينَ﴾ [هود:١١٤]، زۆرینەی خەڵكیش خێر بەسەر شەڕیاندا زاڵە لە ژیان و دەروونیاندا، لەبەر ئەوە سەیر نییە گەر هەست و نەستی ترس و سام لەسەردەمەكانی دواكەوتندا بەسەر دڵی زۆرینەی موسوڵماناندا لە هەموو شتێكدا زاڵ بووبێت، لەبەر ئەوەی دركیان بە شوێنەوارەكانی گوتاری پەروەردەیی هەڵەی ئاڕاستەكراو بۆ موسوڵمانان نەكردبوو بەتایبەتیش منداڵ، كە لەسەر ترس و تۆقین و سزادان بونیادنراوە، نەك لەسەر خۆشەویستی و سۆز و ڕێز و متمانە و هاندان و بەرچاوڕوونی هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی و ئەمانەتەكان.

پێویستە لەسەر پەروەرشیار –لەسەر بنەمای ڕێنمایی گوتاری پێغەمبەر بۆ قۆناغی منداڵێتی و گەڕانی زانستییانەی پەروەردەیی بونیادنراو لەسەر بناغەی دیدی قورئانی و بەها و مەبەستەكانی– كە ئەو هەڵبژاردنە قورئانییانە پێشكەش بە منداڵ بكرێن كە لەگەڵ سروشتی ئەودا دەسازێن، لەو قۆناغە دەروونییانەدا كە پێیاندا گوزەر دەكات، بەوەی لە خودا نزیكی بكاتەوە و هەستی ئەرێنییانەی خۆشەویستی لە دەروونیدا گەشە پێبدات و بەهاكانی ئیسلام و مەبەستەكانی لا خۆشەویست بكات، تا كاتێك گەیشتە قۆناغی جیاكاری (التمييز) هانی بدەین –لە ڕێگەی ڕاستیی و دووربوون لە زیان و خراپە و پرەنسیپ و بەهاكان لەدڵیدا بچێنین، لەهەمان كاتدا ترس و تۆقین لە هەڵە بچكۆلەكانی لە دڵە ناسكەكەی لا بدەین، وەك هەندێك درۆ و زیانگەیاندن بە هاوەڵان و زیانەكانی حەزكردن لە ئاگاداربوون لە شتەكان، بەوەش –

---

بەهەشتەوە، دەڵێت: وتم: ئەگەر زینای كردبێتو دزیشی كردبێ؟ فەرمووی: بازیناشی كردبێتو دزیشی كردبێت. وتم: ئەگەر زینای كردبێتو دزیشی كردبێ؟ فەرمووی: بازیناشی كردبێتو دزیشی كردبێت. وتم: ئەگەر زینای كردبێتو دزیشی كردبێ؟ فەرمووی: بازیناشی كردبێتو دزیشی كردبێت، با ئەبودەردائیش پێی ناخۆش بێت . بڕوانە: الشيباني، مسند الامام احمد بن حنبل، مرجع سابق، ج٤٥، ص٤٨٣، حديث رقم: ٢٧٤٩١.

بــە هەڵبژاردنــە قورئانییــە گونجاوەکــان– ڕێگــەکانی بەخۆداچــوونەوەی لەبەردەمــدا دەکەینەوە، لەگەڵ دوورکەوتنەوە لە هەڵە و پەروەردەکردنی خود، بە ماناکانی تەوبە و لێخۆشــبوون و ڕەحمــەتی خــودایی، ئــیتر هەســت بــەو داڕمانــە نــەکات کــە بــەرەو هەڵهاتنی دەروونیاینە و تەسلیمبوون بە هەڵەکان و ڕووتێکردنیانی بەرێت.

کــە منــداڵ گەیشــتە ڕادەی پیــاوان –لــە ڕێگــەی هەڵبژاردنــە قورئانییــە گونجاوەکانەوە– دەخرێتە بەردەم بەرپرسیارێتییەکان و چاوساغبوون لە ســەرنجامی کردارەکانیان، وەك ئەوەی هاوەڵانی بەهێزی پێغەمبەری خــوا (درودی خــوای لەســەر بێت) خرانە بەردەم بەرپرســیارێتیەکانیان و بەرچــاوڕوونیان دەربــارەی ســەرئەنجامی کارەکانیان پێدرا، ئەوانیش بەرپرسیارێتییە گــەورەکانی خۆیانیــان بــە هێــز و توانــای مەعدەنەکانی نەفسی جــوامێ و بــەهێزی نەترســی خۆیــانو ئــەو بێگەردیــەی کــە لــە منداڵییەوە لەسەری گۆشکرابوون هەڵگرت.

پێویســتە چاکســازیی فەرهــەنگی پــەروەردەیی بــۆ هــەموو لایەنــەکانی پێکهــاتنی مــەعریفی و دەروونــی و ســۆزگەراییانەی منــداڵ و تازەپێگەشــتوو درێژببێتــەوە، بــۆ خزمەتکردنی پێکهێنانی دروستی عەقڵیەتی منداڵ و لایەنە دەروونییەکەی بخرێتەگەڕ. لایەنە ئاینی و بیروباوەڕییەکــەش لــە گــرنگترین ئــەم پێکهاتانەیــە، پێویســتە گوتــاری خۆشەویســتئامێزانەی پێغەمبــەر، لەســــەر بناغــەی وردبوونــەوە و تێگەیشــتنی زانستییانەی (سننی)یانە، ببێتە ڕابەر و بناغە لە دامەزرانــدنی بەرنامــە پەروەردەییــە مەعریفیی و دەروونیی و ویژدانییەکانی منداڵیی.

پێویستە درك بە پەیوەندی لایەنی مەعریفی بەلایەنی دەروونی سۆزگەرایانە بکەین لەکاتێکدا کە منداڵ فێردەکەین، کاتێك فێری قورئانی پیرۆزی دەکەین کــە پێموانییــە بەرنامەی دروستی پــەروەردەییمان لــە فێرکردنیــدا پــەیڕەو کردبێــت، لــە هەڵبــژاردنی ئەوەی بۆ هەموو قۆناغێــك لــە قۆناغــەکانی گەشــە و بونیــادی دەروونییانــەی منداڵــدا دەگونجێت، بەجۆرێك کە بە خۆشەویستی خوای بێگەرد و بالا و خۆشویستنی ئــاین و ئوممەتەکەی و پابەندبوون بــە پــەروەردگاری و باوەڕەکەیــەوە دەســتپێبکەین، لەگــەڵ

باشیی تێگەیشتن لێیان، پلەبەپلە بەرەو ئەو قۆناغانەی بەرین کە تێیدا پێدەگات و گەورە دەبێت، تا درك بە بەرپرسیارێتییەکانی و سەرەنجامی کارەکانی سەبارەت بە خۆی و ئوممەتەکەی بکات، بە گوتاری بەرپرسیارێتی و چاوکردنەوەی لەبارەیەوە قسەی لەگەڵدا بکرێت و –بە ئامۆژگارییەوە– ڕێنمایی بکرێت بۆ ئەوەی لە کردارەکانی دەکەوێتەوە لە سەرەنجامەکان و بەرپرسیارێتییەکان.

ئەم چەمکە پەروەردەییە، کە ڕەچاوی شوێنەوارە ویژدانییەکان دەکات، بەسەر هەموو ئەو شتانەدا پراکتیك بکرێن، کە دەدرێتە منداڵ، لە فیکر و فەرهەنگ و مەعریفە، بە چەشنێك گونجاو بێت لەگەڵ هەموو قۆناغێك لە قۆناغەکانی گەشەکردنیدا، هیچ جیاوازییەك نییە لەنێوان گروپێك و یەکێکی دیکە و دەستەبژێر و جەماوەر، لەو سۆنگەیەوە کە هەمووان بران، سەربازانی ئوممەتی موسوڵمانی بەهێز و بەڕێزن.

پێویستە لەسەر چینەکانی ئوممەت، بە بڕیار و چاکسازان و دایکان و باوکانەوە، بەتاکو دامەزراوەکانەوە، گرنگی پێویستو ئەولەویەت بدەن بەکاروباری پەروەردە و فێرکردن، هەوڵی پێویستیش لەم بوارە گرنگەدا بدەنو بنەماکانی قەوارەی ئوممەت بونیاد بنێنەوە و وزەکانی لە منداڵێتیی ڕۆڵەکانیاندا بتەقێننەوە و گەشە بە داهاتە مرۆییەکانی لەسەر بنەما مەعریفی و ویژدانی ئیسلامی زانستی دروست بدەن.

هەتا گوتە بگۆڕێت بۆ کردار، فیکریش بۆ ئەنجامدان، پێویستە بە دانانی پلانی جددی و گشتگیری کارکردن دەست پێ بکەین، کە هەموو دەستە دڵسۆزەکان هاوکاربن تێیدا، بۆ چاندنی نەوەی باوەڕ و هێز و شکۆ و ڕیفۆرم.

**یەکەم: بەرەکانی کارکردن (جهات العمل)**

دەبێت هەموو پلانێکی کارکردن لەبنەڕەتدا فرە ڕەهەند بێت، کارکردن تێیدا لە چەند بەرەیەکی هاوتەریب و پێکەوە ڕێکخراو و یەکتر تەواوکەردا بە ئەنجام بگات، تا لەکۆتاییدا بەری پێویستی خۆی بدات بەدەستەوە. سەبارەت بە قۆناغی منداڵیش، مەبەست لەم پلانە بریتییە لە گۆڕانکاریکردن لە لایەنی دەروونی و ویژدانیدا تا دەروونی موسوڵمان بەهێز و کاریگەر و بونیادنەر و داهێنکار دەبێت، کە ئەم پرۆسەیەش بریتییە لە بونیادنانەوەی عەقڵیەتی موسوڵمان بۆ ئەوەی ببێتە عەقڵیەتێکی دروستی بڕواداری، بەهێزی زانستی جددی.

بۆ بەئاکام گەیاندنی ئەمەش پێویستمان بە هێنانەوە کایەی دیدی ئیسلامگەرایانەی گەردوونی قورئانیی سەردەمی هاتنە خوارەوەی پەیامەکە دەبێت، ئەوەش لەڕێگەی پاڵفتەکردنێکی کەلتوورییانەی ئەوە دەبێت کە تووشی تێڕوانین و فەرهەنگی ئیسلامیی بووە، لە چاخەکانی ستەمکاریی و پەرتەوازەیی و لەمیانی هێنانەوە ئارای گوتاری پەروەردەییانەی پێغەمبەر بۆ منداڵی موسوڵمان دەبێت، بۆ ئەوەی ببێتە بناغەیەك بۆ ڕیفۆرمی پەروەردەیی: کە تۆوی چاکسازی مەعریفیی و ویژدانی لەسەر بناغەیەکی پتەو لە خاکی منداڵێتیدا بنێژرێت و (ڕەهەندە نا ئامادە)ەکەی پڕۆژەی چاکسازیی ئیسلامیی شارستانییانە بۆ ئوممەت بهێنێتەوە پێش.

**هۆشیارکردنەوەی ڕووناکبیران و بیریاران:**

هەنگاوی یەکەم لەم پلانەدا بریتییە لە هۆشداریی لەبارەی سروشتی کێشەکە و ڕەهەندە ڕووناکبیرییە مێژووییەکانی. لەو ڕوانگەیەوە کە سەرەڕای ئەو دڵسۆزییە زۆرەی کەسانێکی زۆر لە ڕووناکبیران و بیریارانی پێدەناسرێتەوە و ئەو هەوڵە زۆرە ماندووکەرانەش کە دراون، بەدرێژایی چەندین سەدە لەناو ئەو هەلومەرج و تەحەددایانەدا کە دەوری ئوممەتیان داوە، بەو پێیەی ئەو هەوڵانە کاریگەرییان سنووردار ماوەتەوە، لە هێنانەدی ئامانجەکانی ئوممەت لە گەڕاندنەوەی وزە و

تواناکانیدا بەریان نەگرتووە، بەهۆی بێبەشبوونیان لە دیدی گشتگیرانە و ونکردنی ڕۆڵی عەقڵی دروستی (سننی: پەیڕەوکەر لە یاسا گەردوونی و فیتریی و قورئانییەکان) لە ڕوانین و گەڕان و لێکۆڵینەوەی دەروونی کۆمەڵایەتیدا، بەهۆی ئەوەوە کە دزەی کردۆتە ناو عەقڵی موسوڵمانانەوە لە فیکری میتافیزیکی وێنەییانەی گریکی (الفكر الميتافيزيقي الصوري الإغريقي) کە بەسەر فیکری ئوممەت و ئاسۆ مەعریفییەکانیدا زاڵ بووە، لەپاڵ توندوتیژیی ململانێی سیاسی کە زۆرێك لە زانایان ناچاربوون بۆی لە ڕووبەڕووبوونەوەی نوخبەی ستەمکاری سیاسیدا، لەپێناو بەرگریکردن لە پیرۆزیی و پێگەکان و پاراستنی ئەو میراتەی –تا ئەمڕۆکەش– شوێنەوارەکانی هەر کۆنترۆڵی فیکری ترادسیۆنالی ئاینی دەکەن و بونیادی دەروونی و وزەی ناخەکی ئوممەت لاواز دەکەن.

گەر هۆشداری سەرکەوتوو بوو لە ئاڕاستەکردنی بڕێکی گونجاو لە بایەخی بیریاران و پەروەرشیاران و چاکسازان سەبارەت بە گرنگی منداڵ و خێزان لەڕووی پەروەردەییەوە و خستنەگەڕی هەوڵی پێویست بۆ پاڵفتەکردنی فەرهەنگی و پەرەپێدانی چەمك و هۆکارە پەروەردەییەکان و چڕکردنەوەی لێکۆڵینەوەی جددی لەم بوارانەدا،لەراستیدا ئەنجامدانی گۆڕانکاری لەیەك نەوەدا کارێکە کەلەتوانادایە، بەڵگەی ئەمەش ئەو بەرنامە پەروەردەییەی حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لەسەربێت) پەیڕەوی کرد بۆ ئازادکردنی کۆیلەکانی بەنی ئیسرائیل، [1] هەروەها وەك

---

[1]. کارێکی گرنگە کە سەرنجی جیاوازیی نێوان سروشتی ئەو قەومە بدەین کە موسایان بۆ نێردراوە و ئەو قەومەش کە پەیامی ئیسلامی موحەممەدییان بۆ نەتەوەکان هەڵگرت و شوێنەواری ئەوەش لەو بەرنامەیەدا کە موسا گرتییەبەر لە مامەڵەکردن لەگەڵ قەومەکەیدا و ئەو گوتارەش کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) ئاڕاستەی قەومەکەی خۆی کرد، دەلالەتی ئەوەش لە بەرنامە و گوتاری خوازراوی گوتاری گەلانی موسوڵماندا، بۆ نموونە موسا پێغەمبەر بۆ بەنی ئیسرائیل ڕەوانەکرا ئەوانەی لە میسردا بە کۆیلەکرابوون، بەرنامەکەی ئەو وەك ئەوەی خوا فەرمانی پێدابوو بریتی بوو لە پێگەیاندنی نەوەیەکی ئازادی بەرێزی ئازا لە (تیە سیناء)دا لە ماوەی چل ساڵدا. سەبارەت بە موحەممەدی پێغەمبەریشمان (درودی خوای لەسەربێت) ئەوا قەومەکەی کە عەرەب بوون و شکۆی هەڵگرتنی پەیامەکەیان هەبوو بۆ

**ئەو بەرنامەیەش کە گوتار و سەرمەشقی پێغەمبەرانەی محەمەدیان لە پەروەردەکردنی منداڵدا پێشکەشکردووە، لەپاڵ ئەوەشدا کە ئەزموونە زیندووەکانی نەتەوە هاوچەرخەکان سەلماندویانە و ئەوەش کە زۆرێك لە ئێمە لە نەفسی خۆماندا دەیزانین لە ڕوودانی گۆڕانکارییەکی گەورە لە چەمك و مەعریفەکاندا، لە ماوەی تاکە یەك نەوەدا کە نەوەکەی خۆمانە، ئەمەش دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە هاوشێوەی ئەوە و قووڵتر و فراوانترو بواری زیاتریش دەکرێت لە تەمەنی یەك نەوەی دوای خۆماندا ڕووبدات، گەر بێتو نوێکاری بکەین و ئیجتیهاد بکەین لە ماوەی چل یان پەنجا ساڵی داهاتوودا بە پشتیوانی خوا.**

---

جیهانیان، لەکاتێکدا کە تیرەی دەشتەکی ئازاد و ڕێزداربوون و نە هیچ قەیسەرێك و نە هیچ کیسرایەکیش ملی شۆڕنەکردن، لەبەر ئەوە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) گوتاری مژدەپێدان و پەرەپێدان و بەرپرسیارێتی بۆ بڕوادارانی ئاڕاستەکردن، لەگەڵ ئاگادارکردنەوە و هەرەشە بۆ نکوڵیکاران و نەیاران، ئیدی پەیامەکەیان بە توندی و ئەمانەتەوە هەڵگرت و ئالأی ئیسلامیان بەرزکردەوە و ڕێساکانی ژیارەکەیان بونیادنا، کاتێکیش کە پادشایان و سوڵتانەکان ملی گەلانی ئیسلامییان نەوی کرد، ڕابوونی دووەم لەسەر دەستی ئەو هۆزە تورکە ئازاد و ئازایانە بەئەنجام گەیشت کە هاتبوونە ناو ئیسلامەوە و دەوڵەتی عوسمانییان دامەزراند. لەمڕۆشدا ئەو بەرنامە پەروەردەییەی گەورەمان موسا (سەلامی خوای لێ بێت) گرتیەبەر هەمان شتە کە بەسەر حاڵی گەلانی ئیسلامیدا پیادە دەبێت، هەر دەبێت بونیتنانی بنەماکا دەست پێبکەنەوە و عەقڵی دروستی موسڵمان و پێکهاتەو دروونی تازەپێگەیشتووانی لەسەر ئەو ڕێبازە چاك بکەنەوە کە لەگەڵیدا سیماکانی گوتاری پێغەمبەر بۆ منداڵان و تازە پێگەیشتووان دێنینەوە ئارا. هەروەها پێویستە کە سەرنجی پێکهاتەی ئەوانەش بدرێت کە دێنە ناو ئیسلامەوە لە ڕۆڵەی گەلانی ئازادی پێشکەوتوو کە بەهێز و جوامێری ناسراون، ئەوانەی هێزن بۆ ئیسلام، سیفاتی هێز و ئازایەتییان بپارێزین، ئەو ڕۆشنبیرییە پیسەی پێشکەشیانی دەکەین نەبێتە هۆکارێکی نەرێنی وزەکانیان کۆت بکات و ناخ و ویژدانی تازە پێگەیشتوانیان وێران بکات.

**گەشەپێدانی فیکری ئیسلامیی کۆمەڵایەتی ڕەخنەگر:**

هـەوڵی زۆر دراون و پێشـنیاری زۆر خراونەتـەڕوو، بـە مەبەسـتی چاکسـازیکردنی فیکریی و تەکامولی مەعریفی لەنێوان هیدایەتی وەحی و ئایەتەکانی قورئان لەلایەك و ڕوانینی عەقڵ و نیشانە و ئایەتەکانی گەردوون و پارێزگاریکردنی بابەتە جێگیرەکان و خسـتنەگەڕی گـۆڕدراویش لەلایـەکی دیکـەوە. بـەڵام گۆشـەگیری ئـەهلی زانسـتی قوتابخانـەیی و مومارەسـە زانسـتییە لێکۆڵینەوەگـەرە تەقلیدییـەکانیان، بۆتـە هـۆی ئەوەی خاکی فەرهەنگ و فیکری ئیسلامی یاریدەدەر نەبن بۆ گەشە و خسـتنەگەڕ تـا ئەمڕۆکە، بێئـەوەی زۆرێـك لـە ئـەهلی پیشـەکە و چاکسـازان و خەڵکـە گشـتییەکەش هەست بە مەترسی ئەوە بکەن، لەگەڵ ئەوپەڕی ئیخلاس و نیازپاکیشدا.

بـۆ خسـتنەگەڕی عـەقڵی دروسـت و بـەپیتکردنی خاکەکەشـی پێویسـتە فیکـری ئیسلامی زانستی کۆمەڵایەتی ڕەخنەگر هانبدرێت، کـە ئامـانجی گەڕاندنـەوەی دیـدی هەمەکیانـەی گشـتگیری ئیسـلامییە، لەگـەڵ کاملّکـاریی سەرچـاوەکانی مەعریفـەی ئیسلامی لە وەحی و عەقڵ و گەردووندا، لەسەر بناغەی ئەم دید و ئـەم میتـۆدەش – پاکسازیی فەرهەنگی ئیسلامی بەئەنجام بگات، لە هەموو ئـەو تێکچـوونەی گـیرۆدەی بووە، لەگەڵ پەرەدان بە بەرنامە پەروەردەییەکان بۆ گەڕاندنەوەی بونیادی دەروونی و عەقڵی ئیسلامییانەی جێنشینگەرانە.

لەراستیدا هـەوڵی زۆر و بایەخـدار بـۆ چاکسـازیی خراونەتەگـەڕ کـە سـەرکەوتنیان دەست نەخستووە، لە هێنانەدیی ئامانجەکانیان و خستنەسەرپێی ئوممـەت، چـونکە بایـەخیان بــە گــۆڕینی پەروەردەییانــەی منــداڵ نــەداوە، بــەڵکو وەك گوتــارێکی ترسێنەرانە و بانگێکی مەعریفیی جەدەلی ئاڕاستەکراو بـۆ بـاڵغبووان ماونەتـەوە. لـە بایەخدارترین ئەم هەولانەش لە مێژووی ئیسلامدا هەوڵەکانی ئـەبو حامیـدی غەزالییـە (کە لە ١١١١ز وەفاتی کردووە). غەزالی هەر زوو پێویستی چاکسـازیی مەعریفییانـەی لە کتێبەکەیدا (تهافت الفلاسفة) ڕوونکردەوە، بە ئامانجی گونجانکاریی نێوان بابـەتی ئایینی و عەقڵی، هەروەها لە کتێبەکەیـدا (احيـاء علـوم الـدين) مەبەسـتی ئـەوە بـوو

بابــەتی شــەرعی عــەقڵیی و ویــژدانیی (دەروونــی) پێکــەوە بســازێنێت، بــەڵام ئــەم بانگەوازە و ئەم ئاڕاستەیە لە دروستکردنی ئەو گۆڕانکارییە مەعریفییەدا سـەرکەوتوو نــەبوون، کــە ببێتــە مایــەی کــارلێکی نێــوان بابەتــە بــەهایی و بابەتــە یاســاییە گەردوونییەکاندا (بين القيمي و السنني)، لـەو سـۆنگەیەوە کـە سـەرکەوتنی بـەوەوە بەنـدە کـە لەسـەر بناغەگـەلێکی مەنهەجییانـە بونیادنرێـت لەلایەکـەوە، لەلایـەکی دیکەشـەوە سـەرکەوتنی چاکسـازیی ویـژدانیی پـەروەردەیی لەهـەمان کاتـدا بـەوەش مەرجدارە کە بـە شـێوەیەکی زانسـتیانەی لێکـۆڵراوە بـۆ قۆنـاغی منـداڵێتی ئاڕاسـتە بکرێت.

بەهەمان شێوە ئیمام تەقی دین ئەحمەدی کوڕی تەیمییەش (کۆچکردوو لە ساڵی ١٣٢٨ز دا)، درکی بە بابەتێکی بایەخـدار کـرد لـە بونیـادی کارەکتـەری مرۆڤـدا، کـە بریتییە لە عەقیدە و سەلامەتییەکەی، بەڵام زاڵبـوونی فیکـری تیـۆری جەدەلییانـەی پێکداکێشەرانە –کە هەلومـەرجی سـەردەمەکە و فەرهەنگەکـەی سـەپاندبووی– ئـەم ڕەهەندە نەیتوانی ڕێگای خۆی بەرەو لایەنە پەروەردەییەکە بگرێتەبەر و لـە میتـۆدە پەروەردەییە کاراکاندا وەبەرببهێنێت، لەپێناو گۆڕین و بونیادنانی قۆناغی منداڵێتیدا، بەڵکو زۆرێك لەوانەی بە ئیمـام کاریگـەر بـوون دوورتـرین کـەس بـوون لـە درککردنـی هۆکارە دەروونی و ویژدانیی و پەروەردەییەکان یان گرنگیدان پێیان.

ئیمام عەلی کـوڕی ئەحمـەدی کـوری حـەزمیش (کۆچـکردوو لـە سـاڵی ١٠٦٤ز دا) بەشـداری کـرد لــە بونیادنــانی بناغــەکانی مەنهــەجی زانســتییانەی (ســننی)یانەی کۆمەڵایەتییانە، هەر وەك ئیبن خەلدونیش ڕێساکانی ئەم میتۆدەی دانا، بەڵام فیکری ئــەم دوو ئیمامــە پــەراوێزخران، وەك چــۆن زۆرێــك لــە داهێنــەرانی ســەردەمانی لاساییکردنەوە و وەستانی فیکریی. یەکەمیان (ظاهري)یە، نووسـینەکانی دووەمـیش لە گرنگیپێدانەکانی فیکری تەقلیدی و لە خوێندنەوەکانیشی نییـە، لەبـەر ئـەوە ئـەم فیکرە لە بونیادنانی مەعریفـە کۆمەڵایەتییـە ئیسـلامییەکاندا تـەوزیف نـەکرا، نـە لـە

پەرەپێدانی لێکۆڵینەوە زانستییە پەروەردەییەکان، لەپێناو ڕوودانی گۆڕانکاریی خوازراو لە ڕیشەی بونیادی منداڵێتی موسوڵماندا.

لە زانایانی دواییینیش ئیمام محەمەد عەبدە بەدی دەکەین (کۆچکردووی ۱۹۰۵ز)، دوای ئەویش زانایان و قوتابیانی قوتابخانەی مەنار، کە جەختیان لەسەر بایەخی دروستیی عەقیدە دەکرد، لەگەڵ چەسپاندنی عەقلیەتی زانستی و پاڵفتەکردنی کەلتووری ئیسلامیی لە چەمکەکانی خورافە و بابەتی پڕوپووچ. وەك چۆن (عەبدولڕەحمانی کەواکبی)ش (کۆچکردوو لە ساڵی ۱۹۰۲ز)، درکی بە بایەخی ڕەهەندی گشتی و سیاسی و پێویستی چەسپاندنی لەسەر بناغەیەکی بەهێز لە پرنسیپەکانی ئیسلام و بەهاکانی کرد، لەگەڵ زەرورەتی زاڵبوون بەسەر ستەمکاریی لەکۆمەڵگادا، بەڵام ئەم چاکسازییانە نەگەیشتنە قووڵایی پێویست، نە ئامانجە خوازراوەکانیشیان هێنایەدی، چونکە لە بازنەی مەعریفیی و لە چوارچێوەی گوتاری باڵغەکاندا مایەوە، فیکر و توێژینەوەکانی ئاڕاستەی منداڵێتی و پەروەردە و گۆڕانکاریی لەسەر بناغەی بونیادی کارەکتەری مرۆیی وەرنەگرت، هەموو ئەم هەوڵانە و ئەوەش کە دواتر بەدوایاندا هاتن، گۆڕانکاریی پێویستیان بەرهەم نەهێنا، چونکە فیکری دۆگمایی و چەقبەستنی خوێندن و لاسایکردنەوە، هەموو ئەم هەوڵانەی پەراوێز خست و ئاسۆکانی سنووردار کرد، ڕێگەی پێ نەدا پەرەبسێنێت و کارلێك بکات لەپێناو بونیادنانی فیکرێکی زانستییانەی ئیسلامیی کە لەسەر کامڵکاریی مەنهەجیی مەعریفیی و بونیادنانی زانستی دەروونی کۆمەڵایەتیی و پەرەپێدانی بەرنامەی پەروەردەیی بونیاد نرابێت.

لەلایەکی دیکەشەوە، فیکری هاوردە و بەخۆرئاواییکردن بەشێوەیەك مایەوە کە بەدەم ویژدانی ئوممەت و سایکۆلۆژیاکەی و بناغەکانی بونیادە عەقیدەییەکەوە نەهاتن، کە ئەمیش، بەشێوەیەکی خۆوەکی و لەبەر هۆکارگەلێکی بابەتی، کاریگەرییەکەی لە ویژدانی ئوممەتدا پەراوێزخست.

## چاكسازیی پەروەردەیی و ئەدەبیاتی خێزانیی پەروەردەیی:[1]

ئەگەر ئێمە درکمان بە بایەخی پاڵفتەسازیی فەرهەنگی و بەرنامەی پەروەردەیی مندالّ کرد، ئەوا ئەوەش گرنگە کە لەلایەن بیریاران و کۆمەڵناسان و دەروونناسان و پەروەردەکارانەوە جەخت بکرێتە سەر بایەخدان بە پێشکەشکردنی ئەو ئەدەبیاتە

---

[1]. لەلایەنەکانی بایەخدانی قوتابخانەی ئیسلامییەی مەعریفە بە لایەنی پەروەردەیی و ئەدەبیاتی پەروەردەیی خێزانی موسوڵمان، هەستانی پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامییە بە دەرکردنی چەند کتێبێکی بایەخدار و ڕێکخستنی ژمارەیەك لە کۆنگرەی زانستی لەبارەی کاروبارەکانی پەروەردەوە، بەدرێژایی پتر لە دەیەیەك، لەوانەش دەرکردنی سێ چاپی کتێبی (دليل مكتبة الأسرة المسلمة) کە پێشتر پلانەکەیم دانابوو و سەرپەرشتی ئامادەکردنی بووم، کاتێك ئەمینداری گشتی کۆڕبەندی جیهانی لاوانی ئیسلامیی بووم (١٩٧٣–١٩٧٩ز)، (چاپی سێیەم، المعهد العالمي للفكر الاسلامي و دار السلام، قاهیرە، ٢٠٠٨ ز) و ماددەی دەلیلەکە بریتی بوو لە ناساندنی باشترینی ئەوەی لە کتێبخانەی عەرەبیدا هەیە لە کتێب و ئەدەبیاتی تایبەتی ئیسلامی، بۆ سەرجەم قۆناغەکانی تەمەنی تاکەکانی خێزان و ڕۆڵە جیاوازە خێزانییەکانیشیان، پاشکۆیەکیشی لە پێڕستگەلێکی زۆر بۆ کرابوو کە یاریدەی خوێنەر دەدات بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی لەم ئەدەبیاتە و بەگوێرەی ئەم قۆناغە، یان ڕۆڵی خوازراو، یان پسپۆڕێتی، بەو پەڕی سانایی و ئاسانیشەوە، لەگەڵ ناساندنی دانەرانی ئەم کتێبانەش ئەوەندەی لەتوانادا بووبێت.

هەروەك پەیمانگا لە ئێستا دا خەریکی ئامادەکردنی ئینسکلۆپیدیایەکی گشتگیرە و بریتییە لە (دليل القصة الاسلامية)، تا خزمەت بە خێزانی موسوڵمان بکات کە دەلیلەکە چیرۆکە پاکەکان دەناسێنێت، کە چێژێکی پاکی بێگەرد دەبەخشێت و یاریدەی پێگەیشتنی کۆمەڵایەتی دەدات و بەها باڵاکان دەچێنێت و لای تاکەکانی خێزان پشتگیرییان دەکات، لە قۆناغە جیاوازەکانی تەمەن و کەلتووریشدا، لەبەر ئەوە سەرجەم جۆرەکانی چیرۆك لەخۆدەگرێت، لەگەڵ هەموو جۆرەکانی نووسەریشدا، بە چاوپۆشین لە بابەتی چیرۆکەکە یان شوناسی نووسەرەکە، لەبەر ئەوەی پێوەرەکە جۆری چیرۆکەکە لەڕووی هونەرییەوە و بەهاکەی و شوێنەوارە برەوپێدەر و پەروەردەییەکەی و ڕادەی بەشداریکردنی لەسەرخستنی پرۆژەی خوازراوی چاکسازیی ئیسلامییدا.

وەك چۆن دەزگاکە هەڵدەستێت بە ئامادەکردنی هەڵبژاردەگەلێکی ئەدەبیی جیهانیی ناوازەیش لە (سرودی ئیسلامیی) بۆ مەبەستە کۆمەڵایەتییە ویژدانییە جیاوازەکان، لە ڕوانگەی ئەو کاریگەرییەی شیعر و سرود هەیانە لە بونیادنانی لایەنە ویژدانیی و هونەرییەکان لە دەروونی مرۆڤدا بەگشتی و دەروونی ئیسلامیش بەتایبەتی.

زانستییەی کە باوکان فێردەکەن چۆن دەبنە باوکی ڕاستەقینە، چەمکە ئیسلامییە زانستییەکانیشیان بۆ دەستەبەر دەکات، لەگەڵ چەمکە کۆمەلأیەتییە پەروەردەییەکان، ئەو چەمکانەی هاوکاری بونیادنانی خێزانی دروست و پارێزگاریکردنیان دەکەن، وەك شوێنێکی کارای پەروەردەیی بۆ پێگەیاندنی منداڵ.

کارێکی گرنگە لێرەدا، لەکاتێکدا ئێمە لە ئەدەب بەشێوەیەکی گشتی و لە چیرۆك و ئەدەبی منداڵیش بەشێوەیەکی تایبەت دەدوێین، ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە ئەدەب لە گرنگترینی هۆکارە هونەرییە کاریگەرەکانە لەسەر ڕۆڵە تازە پێگەیشتووەکانی نەتەوەکان، تایبەتمەندییەکانی نەتەوە و فەرهەنگەکان زەقدەکاتەوە و دەریدەخات و گەلاڵەیان دەکات. بوونی هۆشیارییش بەم تایبەتمەندیی و سیمبولانە بایەخێکی گەورەی هەیە لە گەیشتن بە گیانی شارستانی، بەدحاڵیبوونیش لەم خاسیەت و ڕەمزانە –لەسەردەمانی دابڕانیشدا بە تایبەت– لەو کارانە هەژمار دەکرێت کە پشکێکی زۆری هەیە لە شێواندنی فیکریی و فەرهەنگیی گەلاندا.

نمونەش ئەو بەدحاڵیبوونەی ڕوویداوە لەتێگەیشتنی ئەو سیمبولە ئیسلامییانەی لە چیرۆکانی کەلتووردا تەوزیفکراون، بەتایبەتیش چیرۆکەکانی (هەزار و یەك شەوە) و هاوشێوەکانی، کە زۆرجار ڕەمزی شەڕەنگێز و دڕندە لە مرۆڤ و ئاژەڵ و خشۆکەکان وەك شێر و مار وێنا دەکات، ئەرکەکەشی لەم چیرۆکانەدا ئەوەیە کە ببێتە ئاستەنگی گەیشتن بە گەنجینەکان و بابەتە گرانبەهاکان، بەلأم ئەم هێزە شەڕەنگێزانە لەبەردەم پاڵەوانێتی کەسانی چاکەکاری پاڵەواندا لەوانەی بەدوای گەنجینەکاندا دەگەڕێن لە هەوادا ون دەبن، چونکە ئەم ڕەمزانە لە حەقیقەتی بازنە خەیاڵییە ئیسلامییەکەیدا ڕەمزی هێزی شەڕ و خراپەکاریین، کە دەبنە لەمپەڕی بەردەم گەنجینەکانی حەق و چاکە، هەروەها ئەوەی کە چۆن پاڵەوانێتی خوازیارانی حەق و چاکە و خۆڕاگرییان هێزی شەڕ و ستەم دەبەزێنێت و دەسەلأتی هێزەکانی خراپە و فەساد لەڕاستیدا وەهمم و تراویلکەیە.

مایەی نیگەرانییە کە تایبەتمەندییەکانی ژیار و فەرهەنگی ئیسلامیی و سیمبولە ئەدەبییەکانی بەهۆی نەزانی ڕۆڵەکانی و نەفامکردنیانەوە، ببنە دەروازە و زەمینەیەك بۆ فیکری خورافە و وەهم و خەیالاتی درۆ، کە ترس و تۆقین لە وەهمەکانی جیهانی جنۆکە دەخەنە ناو دڵی ڕۆڵەکانی موسوڵمانانەوە، ئیدی لە خەیالات و ڕەمزی ئەدەبی ئافرێنەرانە و وێنەی هونەریی و ئامرازەگەلێکی چێژوەرگرتن کە پشتگیری وزەکانی ئیمان و ئازایەتی دەکەن و گەشە بە تواناکانی بەرگری بەرامبەر ستەم و گەندەڵی لای هەرزەکار و لاوان، لەمانەوە بەرەو ئامرازگەلێك بۆ خورافە ئاراستەیان بکات، بەمەش وزە ئەرێنییە ژیارییەکان بۆ پاچی ڕووخاندن و دواکەوتن و هۆکارگەلێکی کارا بۆ تیرۆری سایکۆلۆژیی وەربچەرخێن، کار لەسەر چەسپاندنی سیستەمەکانی سەرکوتکردن و ستەمکاریی بکەن و ببنە یاریدەدەری برەوپێدانی پیشەسازیی کاهینانی خورافە و بابەتی پڕوپووچ.

**چاکسازی لە خوێندنی باڵادا:**

بۆ سەرخستنی پڕۆژەکانی چاکسازی مەنهەجیی فیکریی کەلتووریی، چاکسازیی خوێندنی باڵا دەبێتە کارێکی پێویست، بەتایبەتیش زانکۆ تایبەتە خێرخوازەکان کە دەشێت بەهرەمەندبن بە بڕێکی زیاتر لە ئازادیی و پاڵنەری نوێکردنەوە و گۆڕانکاریی، هەروەها ئەو زانکۆیانەش کە لەو دەوڵەتانەدا کە خاوەنی جۆرێك لە ئازادیی و سەربەخۆیی بڕیار و ڕێزگرتن لە ئەرکی ئەکادیمین، لەو سۆنگەیەوە کە خوێندنی زانکۆ ئەو لایەنەیە پەیوەستە بە ئامادەکردنی (کادران)ی ڕووناکبیری زانستی و تەکنیکی و هونەری، بەتایبەتیش لە بواری زانستە عەقیدەیی و یاساییە فیقهی و کۆمەڵایەتیی و مرۆییەکاندا. بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجانەش دەبێت چاکسازیی لەو بەرنامە زانستییانەدا بکرێت کە لە قۆناغەکانی خوێندنی باڵادا دەخوێندرێت و یەکخستنی ئەم بەرنامانە لەگەڵ سەرچاوەکانی مەعریفەدا تێیاندا و کاملکارییکردن تێیاندا لە ڕووی ئیسلامی و (سننی)یەوە تا ڕووناکبیر و پسپۆڕی ئیسلامی ئەڵتەرناتیف بونیاد بنێت،

له سـەرجەم بوارەكـانی مەعریفـەی مرۆیـی و فیزیكـی و بـۆ ئـەوەی بتوانێـت فیكـر و فەرهەنگی ئیسلامیی ئامانجداری یەكگرتوو ئەڵتەرناتیڤ بەرهەمبهێنێت.

جیهانیبوونی پەیوەندی و ئـەوەی بەدەسـتی هێنـاوە لـە توانـا و لـە هۆكارەكـانی پەیوەندی و فێركردنی ئەلیكترۆنی، لەپاڵ كردنـەوەی بـواردا بـۆ فێركـردن لەبـەردەم هەوڵی چاكسازان و بزنسمانانی دڵسۆز و پرۆژەكانیان بـوارێكی فـراوان دەكەنـەوە بـۆ بەشداریكردن لە ڕیفـۆرمكردن لـە خوێنـدنی بـاڵادا و هانـدانی توێژینـەوەی زانسـتی و پشگیریكردنی و چاككردنی ئاستەكەی لـەڕووی چـەندێتیی و چـۆنێتییەوە، دواتـریش دەستەبەركردنی (كادیر) و ئـەو توێژینـەوە و ئەدەبییاتانـەی بـەدەم پێویسـتییەكانی موسوڵمانانەوە دێن، لەگـەڵ ڕووبەڕووبونـەوەی ئەڵنگارییـەكانی سـەردەم و كـاركردن لەسەر پاڵفتەكردن و لابردنی شێواندنەكان و زاڵبوون بەسەر نامۆكردن و دۆگمابوون و پەرتبوونی فەرهەنگی.[١]

---

[١]. ڕەنگە بەسوود بێت گـەر لێرەدا ئامـاژە بـۆ بایـەخی خوێنـدنی سـەرجەم جۆرەكـانی مەعریفـەی مرۆیـی كۆمەڵایەتی و فیزیكی و تەكنیكی بكەین لە زانكۆكانماندا بە زمـانی عـەرەبی، لـەو سـۆنگەیەوە كـە ڕوویـەك لەڕووەكانی چاكسازیكردن لە خوێنـدنی زانكۆییـدا، بەوپێیـەی زمـانی عـەرەبیی یەكـەمین زمـانی ئوممـەتی عەرەبی ئیسلامییە و پێویسـتە دەوڵەمەنـد بكرێـت، بـەوەی ژیـاری مرۆیـی و بەرهـەمهێناوە و بەرهەمیشـی دەهێنێت، لە دۆزراوە زانستییە (سننی)یەكان، لەو ڕوانگەیەوە كە داهێنان بە ئاكام ناگـات تـەنیا لـە زمـانی یەكەمدا نەبێت، كە لەم دۆخەدا زمانی عەرەبییە (بۆ ئێمەی كورد زمـان زمـانی كوردییـە گەرچـی پێویسـتە هەوڵی زۆریش لەگەڵ زمانی عەرەبیدا بدەین، وەك زمانی قورئانی پـیرۆز و كـەلتووری ئیسـلامی/ وەرگێـڕ). گومانیشی تێدا نییە كە یەكێك لە هۆكارەكانی شكستی ئێمە لـە ڕووبەڕووبوونـەوەی تەحـەددای زانسـتیی و تەكنـەلۆجیا دا لـە مـاوەی دوو سـەدەدا، ئەوەیـە كـە ئێمـە -تـا ئێسـتاكەش- زانسـتە فیزییكـی و تەكنەلۆجییەكان لە زانكۆكانماندا بە زمانە بیانییەكان دەخوێنن. كاتێك كـە زانسـتە مرۆییـەكان بـە زمـانی عـەرەبی بیلێنـەوە، دەمارەكـانی كـەلتوور و دەزگـا زانسـتیەكانمان بـە بەرهـەمی ژیـاریی مرۆییـەوە نابەستینەوە، لە ڕێگەی وەرگێڕانی دەوریاتی گرنگی زانستی (گۆڤار و بڵاوكراوەی زانستی) كە توێژینـەوە و دۆزینـەوەی نـوێی زانسـتییان تێیـدا بڵاودەكرێنـەوە، بـەڵكو تـەنیا بـە وەرگێڕانـی هەنـدێك كـاری ئـەدەبی كلاسیكیی و ڕۆمانی بازرگانی وازدەهێنین، خوێندن لە هەموو قۆناغەكاندا بە زمانی یەكـەم كـارێكی گرنگـە، بەو مەرجەی وەرگێڕانی زانستییانەی هەموو توێژینـەوە و داهێنـانێكی زانسـتی پشـتیوانی بكـات، لـەمیانی

کارکردنی جددی بۆ هێنانـەدی ئـەوەی ڕابـورد، بەتایبـەتیش بایەخـدانی خێـرا بـە هێنانە بەرهەمی ئەدەبییاتی کەلتووری خێزانی موسوڵمان، بونیادنراو لەسـەر دیـد و چەمکی فەرهـەنگی و پـەروەردەیی ئیسـلامی دروسـتی زانسـتی و دەسـتەبەرکردنیان بەئاسانترین ڕێگا، بە چاپکراو و بیستراو و بینراو و ئەلیکترۆنییـەوە، لەگـەڵ هانـدانی لاوەکان بۆ ڕووتێکردنیان و بەدەستخستنیان و خوێندنەوە و پەیڕەوکردنیان، کارێکـە پێویستە دەستپێشخەریی بۆ بکرێت لەگەڵ هۆشیارکردنەوەی بیریار و پەروەرشـیار و ڕوونـاکبیر و بڵاوکـەرەوان و ئەوانـەی بـە کاروبـاری پـەروەردەکردن هەڵدەسـتن، هۆشیارکردنەوەیان سەبارەت بە بایەخی زۆری پـەروەردە لـەم قۆناغـەدا، بـۆ ئـەوەی ببێتە بەشێکی دانەبڕاو لـە بایەخپێدانـەکانی ئوممـەت و چـاودێریکردنی، تـا بکەوێتـە سەر ڕیشەی کەلتوورەکەی و ممارەسەکردنی.

---

دەزگاگـەلی زانسـتی وەرگێڕانـەوە و (کادرەکانیانـەوە) لـە قوتابیـان و مامۆسـتایانی خوێنـدنی بـالاّ و مەڵبەندەکانی توێژینەوەی زانستی کە ئامادەکردنیان بەباشی لە زانستە جیهانییەکاندا بە مەرج بگیرێت.

هەموو هیوایەکیشم بەوەیە کە بگۆڕدرێن بۆ دامەزراندنی کۆلێژ بۆ وەرگێڕان دەزگای نیشتمانی بۆ وەرگێڕان و بڵاوکردنەوەی زانستی بۆ دەوڵەمەندکردنی کەلتووری ئوممەت و فراوانکردنی بازنـەی ڕونـاکبیری زانسـتیی تـا ببێتـە خـاوەن بەرهـەمێکی بازرگـانیی کـە بزنسـمانەکان هانبـدات بـۆ بەشـداریکردنی فـراوان لـە دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی ئوممەتدا، ئومێدەواریشم ملبدەینە ئەو کارە و واز لە جەدەلی بیزەنتی وەهمـی لەبارەی توانای زمانی عەرەبی بۆ هەرسکردنی زانست و مەعریفـەکان بهێـنین، کـە زمـانی عـەرەبی ئـەوەی ئەنجامداوە وەکو ئەوەی لەمڕۆدا هەموو نەتـەوە پێشـکەوتووەکانی سـەر زەوی ئـەنجامی دەدەن، گەرچـی ئـەو دەوڵەمەنـدیی و توانـا و بونیادنانانەشـیان نییـە کـە زمـانی عـەرەبی هەیـەتی، پێویسـتە لەسـەر مەجمەعەکانی زمان و هۆکارەکانی ڕاگەیاندن بە ڕۆڵی خۆیان هەڵبستن لـە بونیادنـانی زاراوە و یەکخسـتن و برەو پێدانیان لە فێرکردنی ڕۆڵەکانی موسوڵمانان و ئاگادارکردنیان.

**دووەم: پلانی قوتابخانەی ئیسلامییەتی مەعریفە و گێڕانەوەی فیکری ئیسلامی بۆ ڕەسەنەکەی خۆی:**

نە تێگەیشتنمان لەشەپۆلە فیکرییەکانی جیهانی هاوچەرخی ئیسلامیی کامڵ دەبێت، نە درککردنیشمان بەو هەوڵانەی بۆ چاکسازیی ژیاریی ئیسلامیی و بونیادنانەوەی ئوممەت و بەگەڕخستنی ڕۆڵە ژیارییەکەشی کامڵ و تەواو دەبن، گەر درك بە سروشتی قوتابخانەی (ئیسلامیبوونی مەعریفە) نەکەین و درك بەو ئامانجانەش نەکەین کە بەردەوام هەوڵ بۆ هێنانەدییان دەدات و ئەو هەوڵانەش کە لە ماوەی چەند دەیەی ڕابردوودا تەرخانیکردوون بۆ پاڵنانی لایەنە فیکریی و کەلتووریی و پەروەردەییەکان لە ڕەوڕەوەی چاکسازیی ژیاریی ئیسلامیدا.

هەرچۆنێك بێت ئەوەی لێرەدا سەبارەت بە قوتابخانەی ئیسلامیەتی مەعریفە باسی دەکەین، مەبەست پێی وردەکارییەکانی لایەنەکانی ئەو هەوڵ و ئەزموونانە نییە، بەڵکو مەبەست بەخشینی بیرۆکەیەکی کورتە سەبارەت بە ڕەهەندەکانی ئەم هەوڵانە و ئەو ئاسۆیانەی چاویان تێدەبڕین.

**دامەزراندن و ڕێگا:**

ئەم قوتابخانەیە لەسەر دەستی لاوانێك بونیادنراوە کە کۆکەرەوەی نێوان ڕۆشنبیری ئیسلامی و ڕۆشنبیری دانراوی مرۆیین (الثقافة الوضعية)، نۆبەرەکانی بیرۆکەکەی لە چالاکی و نووسین و تێزەکانانیاندا دەرکەوت، بەر لەوەی یەکبگرن و هەوڵەکانیان چڕبکەنەوە و ڕۆڵەکانیان لە بواری کاری ئیسلامی و خزمەتکردنی ڕێنساسی ئیسلامیدا یەکترتەواو بکەن، لەم نۆبەرانەش کتێبی (النظرية الاسلام الاقتصادية: الافلسفة و الوسائل المعاصرة)ی نووسەری ئەم توێژینەوەیە، کە لە (دار الخانجي) لە قاهیرە و لە ساڵی (١٩٦٠ز) دا دەرچووە،[1] کە نووسەر دەستی خستبووە

[1]. لە دەرئەنجامەکانی درککردنی نووسەر بە بایەخی دۆزینەوەی لە مەنهەجەکەدا، ئەبووە بوو بابەتی توێژینەوەی زانستییەکەی خۆی بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامەی دکتۆرا لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا لە

سـەر بنـەماكانی مەنهـەجی فیكـری ئیسـلامیی پێویسـت و سـەر گرنگییەكەشـی و تواناكانیشی لە زیندووكردنەوەی فیكری هاوچەرخی ئیسلامیی.

ڕوانینەكانی ئەو لاوانە لە كاتی بەیەكگەیشتنی گروپی یەكـەمیان لـە شەسـتەكانی سـەدەی ڕابـردوودا، لـەمیانی شـەپۆلی ئـەو قوتابییانـەی بـۆ خوێنـدن بـۆ ولاّتـە یەكگرتووەكان نێردرابوون لە ولاّتانی جیهانی ئیسلامیی و ئەو دەوڵەتانـەوە كـە تـازە بـە سـەربەخۆیی نوێكردنـەوە گەیشـتبوون گـۆڕا بـۆ بەرنامـەی كـاركردن. سـەرەتای كۆبوونـەوەی ئـەم كۆمەڵەیـەش بـریتی بـوو لـە كـاركردن لەسـەر بونیادنـانی دامەزراوەگەلێكی قوتابییانەی كەلتوورییانەی ئیسلامییانە كە ئەو لاوانـە لـەخۆبگرێت كە نێردراوون و لە نامۆبوونی ئایینی و كەلتووریی و كۆمەلاّیەتی خۆیاندا دەژیـان، بـە ئامانجی پارێزگـاریكردن لـە شوناسـی لاوی موسـوڵمان نێـردراو لـەپێناو بیروبـاوەڕ و (ولاء)یانـدا و ئاڕاسـتەكردنی وزە و تواناكانیـان، بەچەشـنێك كـە یاریـدەی خزمـەتی موسوڵمانان و هێنانەدی ئامانج و خولیاكانیان بێت.

بەهۆی پاشخانی ئەم كۆمەڵە لاوەوە، بە حوكمی فراوانیی ئاسۆی ڕووناكبیرییـان، دركیـان بـە بایـەخی ڕەهەنـدی فیكریـی لـە قـەیرانی دواكـەوتنی زانسـتی و ژیـاریی ئوممـەت كردبـوو، لـە بایـەخی ئامادەكردنـەوەی ئوممـەت تێگەیشـتبوون، لـە ڕووی ڕیفـۆرمكردنی میتۆدەكـانی فیكـری و پاڵفتـەكردنی ڕووناكبیرییەكـەی و پەرەپێـدانی بەرنامە پەروەردەییەكانی و شێوازەكانی فێركردن و خوێندنیان، لەپێناو گەشەدان بە

---

زانكۆی پنسلڤانیا لە فیلادلفیادا بریتی بوو لە (النظرية الإسلامية للعلاقات الدولية: اتجاهات جديدة في الفكر و المنهجية)، لە (١٩٧٣ز). كە لایەنە نوێكارییـەكانی میتۆدەكـەی تێـدا خسـتبووەڕوو و بەڵگـەی هێنـابووەوە لەسەر توانای ئەم میتۆدە بۆ نوێكردنەوەی فیكریی لەو توێژینەوەیەدا و پەرەپێدانی فیكری ئیسلامیی لـەو بوارەدا، دكتۆر (ناصر البريل) مامۆستای زانستە سیاسییەكانی زانكۆی مەلیك سعود لە ریاض لە شانشینی عەرەبی سعودییدا، كتێبەكەی بۆ زمانی عەرەبی وەرگێڕاو بلاّویكردەوە.

وزەی دەروونی و ناخەکیی و توانای مەعریفی و تەکنـەلۆجی پێویسـت بـۆ هـەڵگرتنی سەختییەکانی پرۆژەی چاکسازیی ئیسلامیی و گۆڕانکاریی و ژیاریی.[١]

بە بڕوابەخۆبوونی ئەو لاوانە و ڕوانینیان، لە سەرەتاوە لە ساڵی (١٩٦٣ن)دا (اتحاد الطلبة المسلمين في الولايات المتحدة وكنـدا MSA of the US and Canada) دروستبوو ئەم کۆمەڵەیـەی قوتابیـان لـە مـاوەی یـەك دەیـەدا، بـوو بـە گـەورەترین کۆمەڵەی ڕووناکبیری قوتابییانی ئیسلامی لە خۆرئاوادا، کـە هـەزاران ڕوونـاکبیری لـە هەموو ڕۆڵەکانی جیهانی ئیسلامییەوە وەك ئەندام لەخۆگرتبوو، لەوانەی بـەزۆریی بـۆ خوێندنی بالاّ نێردرابوون. لـەم ماوەیـەدا ژمارەیـەك لـە کۆمەڵـەی پیشـەیی زانسـتیی ئیسلامیی پسپۆڕ لە یەکێتی لاوانی موسوڵمانانەوە سەرچاوەیان گـرت، گرنگترینیـان (کۆمەڵەی زانایانی کۆمەڵایـەتی موسـوڵمان) (جمعيـة علمـاء الاجتماعيـات المسـلمين: Association of Muslim Social Scientists) کە لـە سـاڵی (١٩٧٢ن)دا بەشێوەیەکی فەرمیی دامەزرا، مەبەست لـەم کۆمەڵەیـە یەکخسـتنی هـەوڵی قوتابییـە ئیسـلامییەکان بـوو لــە قوتابیــانی خوێندنــە کۆمەڵایــەتیی و مرۆییــەکان لــەپێناو بەگەڕخستنی مەعریفە و توانـا زانسـتییەکان لـە دامەزرانـدنی فیکـری ئیسـلامیی (بـە ئیسـلامیکردنیان) و چاکسـازیکردنی بەرنامـەکانی فیکـری ئیسـلامی و کـارکردن بـۆ بونیادنـانی زانسـتگەلێکی کۆمەڵایـەتی و مرۆیـی ئیسـلامی، کـە بونیـادنرابن لەسـەر مەبەستەکانی شەریعەت (مقاصد الشريعة) و بابەتـە جێگیرەکـانی ئیسـلام و چـەمك و سەرچاوەکانی و هێنانەکایەی زمانێکی هاوبەشی زانسـتی لەگـەڵ قوتابییـانی زانسـتە کۆمەڵایـەتی و مرۆییـە هاوچـەرخەکان. لـەو ڕوانگەیـەوە کـە گیـانی بەرگریکارانـە و

[١]. کەسانێك –لە نەزانینەوە بێت یان خۆگێلکردنەوە– دەپرسن: چۆن دەکرێت زانسـت و بیرکـاریی ئیسـلامیی و زانست و بیرکـاریی نائیسـلامیی بوونیـان هـەبێت؟ وەڵامەکـە ئەوەیـە کـە مەبەسـت لـە ئیسـلامبوونی زانسـت و تەکنیکەکان ئەوەیە کە پەیوەستە بە فەلسەفەی زانستەکان و ئامانج و مەبەستەکانی کارکردن لـەم بوارانـەدا و ڕێگاکـانی ئاڕاسـتەکردنیان و سـوودوەرگرتن لێیـان بەشـێوەیەکی ئـەرێنیی، و بـە گیـانی بەرپرسـانەی جێنشینانەوە، کە نەبنە ئامرازێك بۆ سەرکوتکاریی و ستەم و وێرانکاریی ژینگە و بەفیڕۆدانی داهاتەکان.

بانگەشـەی خـورافیی بەسـەر نووسـینە ئیسـلامییەکاندا زاڵ بـووە، بـەهۆی نـەبوونی پسـپۆڕێتی زانسـتی و ڕووکەشـیبوونی زانسـتییەوە لای زۆرینـەی نوسـەرانی بـوارە ئیسـلامییەکان، کـە کـەلێنی خسـتۆتە نێـوان پیـاوانی فیکـری ئیسـلامی و پیـاوانی چاکسـازیخوازی ئیسـلامی و قوتابییـانی خوێندنـە کۆمەڵایەتییـە خۆرئاواییـە هاوچەرخەکان لەلایەکەوە و لەلایەکی دیکەشـەوە پیـاوانی دەسـەڵات و دەسـتەبژێری سیاسـی و بـانگخوازانی گۆڕانکـاریی پەرەپێـدان و نوێکردنـەوە، ئەمـەش بـەهۆی پێکهاتەی فیکریی ڕۆژئاواییانەی ئەوانی دوایی و بەرپرسیارێتییە کردەییەکانیان.

لـە دەیـەکانی دواتـردا ژمارەیـەکی زۆر لـە نێردراوانـی موسـوڵمانان لـە وڵاتـە یەکگرتووەکان جێگیربوون و کۆچی بەلێشاوی فراوانی عەقڵە موسوڵمانەکان ڕووی لە ئەمریکا کرد، بەهۆی پاشەکشەی بارودۆخە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان لـە زۆرێـك لـە وڵاتانی ئیسلامییدا، ئیدی یەکێتی لاوانی موسـوڵمان: (کۆمەڵـەی ئیسـلامیی بـاکوری ئەمریکا)ی لێکەوتەوە ((ISNA) Islamic Society of North Amenic) لە ساڵی (١٩٨٠ز)دا، ئامانجی ئەوەش خزمەتکردنی فەرهەنگ و شوناسی ئیسلامیی و ڕەوەندی موسوڵمانی ئەمریکای باکوور و کەنەدا بوو.

لەگـەڵ سـەرەتای سـەدەی پانزەهـەمی کۆچیشـدا (١٤٠ك / ١٩٨١ز) (پـەیمانگای جیهانیی فیکریی ئیسلامیی) هاتە ئاراوە، وەك دەزگایەکی زانستیی فیکریی ئیسلامیی تایبەتمەنـدی سـەربەخۆ، کـە کـاری لەسـەر خزمـەتکردن بـە فیکـری ئیسـلامیی و بونیادنانـەوەی میتـۆدی مەعریفییانـە دەکـرد، لەگـەڵ پاڵفتـەکردنی فەرهەنگـە ئیسلامییەکەی لەسەر بنەماگەلێکی زانستییانەی دروست، بـەلابردنی ئـەوەی تووشـی دیدە هەمەکییەکەی هاتووە لە شێوان، دوور لـە فیکـری خورافـە و بـیری پڕوپـووچ و بونیادنانـەوەی دەروونـی ئیسـلامیی و ئـازادکردنی لـەڕووی مـەعریفی و دەروونـی و ویژدانییـەوە و گەڕاندنـەوەی ڕەهەنـدە دەسـتەجەمعییەکەی و وزە ئاوەدانکارییـە ژیارییە ئافرێنەرەکەی، پەیمانگاکە لـە هـەموو ئەمـەدا هاوکـار بـوو لەگـەڵ کۆمەڵـەی زانایانی کۆمەڵایەتی موسوڵمان لە خزمەتی فیکر و فەرهەنگی ئیسلامییدا.

پەیمانگای جیهانیی فیکریی ئیسلامیی-لەپێناو ئامادەکردنی گۆڕەپانی رۆشنبیری و ئەکادیمیو هەستان بە ڕۆڵی خۆی لە بونیادنانەوەی میتۆدی فیکری ئیسلامی و پاڵفتەکردنی رۆشنبیریی ئیسلامی- هەنگاوێکی گرنگی تا، کە بناغە و بنکەکەی چاکسازی مەنهەجیی و کاملکردنی سەرچاوەکانی مەعریفەی ئیسلامیی بێت. چیتر مەعریفەی ئیسلامی لە تێگەیشتنی قوتابخانەی ئیسلامییەتی مەعریفەدا تەنیا بریتی نەبوو لە مەعریفەیەکی قوتابخانەییانەی دەرخراو، بەڵکو بووە مەعریفەیەکی گشتگیری نوێکراوە (Prosses) کە بایەخی بە ژیانی سیاسی و کۆمەلآیەتی و ئابوری و پەروەردەیو زانستی دەدا و دەچووە قووڵایی سروشتی مرۆڤەکانەوە و ڕێنمایی کاروانەکەی دەکرد لەژێر تیشکی بابەتە جێگیرەکانی وەحی خودایی ئیسلامیی و ئامانجە باڵآکانی.

پەیمانگا تا ئەمڕۆ نزیکەی پێنجسەد کتێبی لە سەرجەم بوارەکانی زانستە ئایینی و کۆمەلآیەتی و ئابوری و پەروەردەییەکاندا دەرکردووە، تا هەنووکەش هەر بەردەوامە لە بایەخدان بە چارەسەرکردنی چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەردا و چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ کەلتوور (التراث)دا و چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ فیکری خۆرئاوایی دا و مامەڵەکردن لەگەڵ زانستەکانی یاسا و سوننەتەکان (علوم السنن) لە ژیان و گوزەراندا، لەپاڵ چارەسەرکردنی کێشەکانی میتۆدی فیکر و ڕێگاکانی خستنەگەڕی فیکری ئیسلامیی و ڕامکردنی سەرچاوەکانی بۆ بونیادنانی زانستە کۆمەلآیەتییەکان و زانستە مرۆیی و پەروەردەیی و ئابوورییە ئیسلامییەکان. هەروەها پەیمانگا بۆ هەمان مەبەست سەدان وانە و کۆنگرە و کۆڕی زانستی لە چەندین شوێنی زانستیدا لە وڵاتە جیاکانی جیهاندا ئەنجام داوە، بۆ ئەوەش ژمارەیەك لە نووسینگەی ڕووناکبیرانەی سەر بەپەیمانگا، یان هاوکار لەگەڵیدا هەبووە، لەپێناو گەیاندنی پەیامی پەیمانگاکەدا و خستنەڕووی مەسەلەکانی کەلتووری ئیسلامیی و ئیشکالاتی فیکری ئیسلامیی و ڕێگاکانی چاکسازیکردن

تێیاندا، لەبەردەم بیریاران و ڕووناکبیران و مامۆستایانی زانکۆ لەسەرجەم مەیدانی زانستەکاندا.

**هەروەها** پەیمانگای جیهانی فیکری ئیسلامی، بۆ خزمەتکردن بە پێویستە ئیسلامییەکان لە بابەتەکانی ئیسلامیبوونی مەعریفە و چاکسازیی مەنهەجەکانی فیکری ئیسلامی و بونیادنانی زانستە کۆمەڵایەتییە ئیسلامییەکان، دوو گۆڤاری جیهانیی دەرکرد، یەکێکیان بە زمانی عەرەبی (مجلة اسلامية المعرفة) و ئەوی دیکەیان بە زمانی ئینگلیزیی (گۆڤاری ئەمریکیی بۆ زانستە کۆمەڵایەتییە ئیسلامییەکان، American Journal of Islamic Social Sciences (AJISS)، ئەمە جگە لەوەی لە هەندێك بڵاوکردنەوە و گۆڤاری ناوخۆیی کە لە نووسینەگەکانی پەیمانگا و ئۆفیسەکانی هاوکار لەگەڵیدا دەردەچن.

**دامەزراوە تایبەتمەندەکانی لێکۆڵینەوەی منداڵێتی و چاودێریکردنی:**

گەر ڕۆڵی ئیسلامییەتی مەعریفە و دەزگا ڕۆشنبیری و فیکرییەکان و دامەزراوەکانی توێژینەوەی ئەکادیمی و خوێندنی باڵا، بناغە بن لە بونیادنانەوەی گۆڕەپانی فیکریی و ئامادەکردنەوەی عەقڵی موسوڵمان و چارەسەری ئیشکالییاتە مەنهەجییەکان و پاڵفتەکردنی ڕۆشنبیری و دروستکردنی (کادر)ی ڕووناکبیر و زانستیی شایستە لەڕووی ئیسلامیی و زانستییەوە بۆ ئەوەی هاوشانی گۆڕانکارییەکان ڕۆڵی خۆیان ببینن و کۆمەکی ئوممەت بکەن بە شارەزایی و تواناکانیان، لەو ڕوانگەیەوە کە پێویستیش زۆرە و پێویستە پەلەی لێ بکرێت، بۆ چالاکییەکی زانستییانەی پەروەردەییانەی چڕوپڕ لەبواری بابەتەکانی پەروەردەی ئیسلامییدا، کە دەبێتە مایەی کۆمەکیکردن بە ئوممەت و دایك و باوکان و مامۆستایان و سەرکردەکانی ڕای گشتی و بەرپرسانی توێژینەوە و ئەدەبییاتەکان، کە ڕوانین ڕووندەکەنەوە و شارەزایی دەستەبەر دەکەن، لەگەڵ هۆکارە خوازراوە پێویستییەکان بۆ ڕووبەڕووبونەوەی گۆڕانکارییەکان و بەرهەڵستیکردنی تەحەدداکان

و چاوساغیکردنی دایکان و باوکان و مامۆستایان و بەرپرسان بە بابەتی نویێ و کارا، بە ئامانجی چاککردنی کۆلێتی منداڵی تازەپێگەیشتوو لەڕووی ویژدانی و مەعریفییەوە و بەرزکردنەوەی ئاستی ئەداکەی.

**دەزگای گەشەپێدانی منداڵێتی:**

بە ئامانجی دەرخستنی بایەخی لایەنی پەروەردەیی و ڕۆڵی لە چاکسازی ئیسلامییدا و ڕاگەیاندنی هەڵمەتێکی جیهادی ئیسلامییانەی پەروەردەیی، بۆ خستنەگەڕی وزە فیکرییە پێویستییەکانی خزمەتکردن بە فیکری پەروەردەیی و گۆڕانکاری و نوێکردنەوەی کۆمەڵایەتی و بونیادنانی دەزگای پسپۆڕی زانستیی توێژینەوەی پەروەردەیی، کە کار لەسەر خزمەتکردنی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکان دەکات، لەگەڵ دەستەبەرکردنی ئەدەبیاتی زانستی لە بواری پەروەردەکردنی منداڵان و خزمەتکردنی دەزگاکانی (پەیمانگای جیهانی فیکری ئیسلامی) لەم بوارەدا، لەپاڵ ئەزموونی زانکۆی جیهانی ئیسلامی لە مالیزیا، بەشداریکردووە لە دامەزراندنی دەزگایەکی ئیسلامی توێژینەوەی پەروەردەیی سەربەخۆ لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بەناوی (دەزگای گەشەپێدانی منداڵێتی) (Child Development Foundation :CDF) کە دواتر پڕۆژە پەروەردەییەکانی لەگەڵ پەیمانگای جیهانی فیکری ئیسلامی ئاوێتە کرد.

پەیمانگا لەئێستادا بەرامبەر بابەتی چاکسازیی پەروەردەیی و گۆڕانی ڕیشەیی کۆمەڵایەتی لەکاردایە، لەگەڵ ئامادەکردنی کەرەستەی پێویست بۆ هێنانەدی ئەوە، بە بونیادنانەوەی دیدی ئیسلامییانەی ئیمانی یەکتاپەرستی ئیستخلاف ئەخلاقی و بونیادنانی عەقڵیەتی زانستی ئیسلامی و پاڵفتەکردنی رۆشنبیریو کەلەپوور لە خورافە و شەعوەزە و پاراستنی عەقڵی موسوڵمان لە خراپ بەکارهێنانی ئەوەی هاتووە لە دیدی دەقگەرایانە لە جیهانی غەیب و ئەوەش کە پەنهانە لە جیهانەکانی گەردوون و ئەوەش کە پێشتر لە قۆناغە مرۆییەکان و سەردەمەکانیاندا ڕوویانداوە لە موعجیزەی پێغەمبەران، بە جۆرێك کە ئەو ئاوڕدانەوانە نەبنە مایەی بەدحاڵیبوون و

تەئویلێك، کـە جیاوازبێـت لـەوەی مەبەسـتەکانی شـەریعەت و بابەتـە هەمەکییـەکانی دەیخـــوازن. پێویســـتە لـــەم قۆناغـــە گرنگـــەدا ئامـــانجی لێکۆڵینـــەوە مەنهەجییـــە ئەکادیمییـــەکان دەســـتکەوتی پڕاکتیکـــی بێـــت، مەبەســـتەکانی قورئـــانی پـــیرۆز و هەمەکییەکان(کلیات) و پرنسیپ و چەمکەکانی بکاتە پێودانگ بۆ فیکری ئیسلامی و پاسەوانی عـەقڵی موسـوڵمان لـە لادان و خورافـە و کـەموکووڕی و پاڵنـەر بـۆ کـار و ئیجتیهاد و جیهاد و ئەنجامدانیان بەباشی، لەپێناو بونیادنانی کۆمەڵگای دادپەروەری و کەرامەت و چاکەکاری و ژیاری ئەخلاق و زانست و ئاوەدانکاری.

پێویستە لەسەر عەقڵی موسوڵمان سوود لە کەلەپووری بەردەمی لە ژیاری مرۆیی لە سەرجەم بوارەکانی مەعرفەی مرۆیی وەربگرێت، لە زانستە کۆمەڵایەتی و مرۆیی و فیزیکییـەکان و ئەزموونـە ژیـاریی و ئاوەدانکارییـەکان، هـەروەها دەبێـت عـەقڵی هاوچەرخی موسوڵمان لەو وانەیەی سەلەف باجەکەی بە گرانی داوە تێبگات، کاتێـك عـەقڵی پێشـتری موسـوڵمان لەگـەڵ کـەلتووری پێشـوو و فیکـری مرۆیـی و ژیاریـدا کـارلێکی کـردووە، بەتایبـەتیش فیکـری فەلسـەفیی گریکـی، بـەڵام بەشـێوەیەکی هەڕەمەکی و بەبێ بوونی بەرنامەیەکی دروستی زانستی، کە کارلێکە هەڕەمەکییەکەی گەیاندییە گومڕاییەکانی فەلسەفە مرۆییە فیزیکییەکان، کە وزەی عەقڵی موسـوڵمان بێهوودە بە خەرج دا و بووە مایەی پەرتەوازەکردنی ڕیزی یەکگرتووی موسوڵمانان و بردنی بـەرو بابەتـە غەیبییـە گومانییـەکان. زۆرێـك لـە ڕوونـاکبیران و لـەملاولای ئـەو ڕێگایەدا بوونیان هەیە، کە ڕووناکبیری و درککردنی وایکردوە ئاشـنای ڕەهەنـدەکانی گۆڕانکاری پێویست و مەبەست و ئامڕازەکـانی ن زەمینـەیان بـۆ سـازدەکەن، لەسـەر ئەوانە پێویستە بوێر بن و بێنە گۆڕەپانەکە و قۆڵی مەردایـەتی لـێ هـەڵماڵن، چـونکە ئـەوان پیـاوانی کـارکردنی ئـەم قۆناغـەن، دەبێـت نـەوەی نـوێ ئامـادە بکـەن، ئـەو نەوەیـەی کـە بـەوەی لەبەردەسـتیدا لـە ڕووی مـەعریفی و دەروونییـەوە، بتوانێـت هەڵگری پەیام و بەرزکەرەوەی ئالاَکەی و درێژەپێدەری ڕێگا بێت.

**ئەزموونی ئیسلامییەتی مەعریفە لە ئامادەکردنی (کادر)ە ئەڵتەرناتیڤدا:**

ئەزموونی ئیسلامییەتی مەعریفە لە زانکۆی جیهانی ئیسلامی لە مالیزیا (١٩٨٨ – ١٩٩٩ز) و پلانەکانی ئامادەکردنی (کادر)ی رۆشنبیری و زانستی و ئەکادیمی ئیسلامی تێیدا، بە ئەزموونێکی زانستی عەمەلی پێشەنگ لەم بوارەدا هەژماردەکرێت. ئەزموونەکە درایە دەست یەکێك لە دامەزرێنەرانی پەیمانگای جیهانی فیکری ئیسلامی، کە بەراورد بە قوتابخانەی ئیسلامییەتی مەعریفە ڕەهەندگەلی گرنگی پێبەخشی، کە بوون بە مایەی پراکتیککردنی چەمکی ئیسلامیبوونی مەعریفە و مەنهەجییەتەکەی و دەرەنجامەکانی ئەزموونەکەی.[1]

گرنگە کە تێبگەین کاری (پەیمانگای جیهانی فیکری ئیسلامی) و کاری دامەزراوەی گەشەپێدانی منداڵێتی (مؤسسة تنمية الطفولة) لەمیانی ئەزموونی قوتابخانەی ئیسلامیەتی مەعریفە(مدرسة اسلامية المعرفة)دا دوو کاری یەکتر تەواوکەرن، چونکە چاکسازی رۆشنبیری و چاکسازی پەروەردەیی بۆ خۆیان تەواوکەری یەکترن، لەو ڕوانگەیەوە گەر کاری پەیمانگا لە گۆڕەپانی کاری فیکری و

---

[1]. بۆ ئاگاداربوون لە هەندێك لە ڕەهەندەکانی ئەزموونی ئیسلامییەتی مەعریفە و باکگراوندە فیکرییەکەی، دەکرێت بۆ چەند بەرهەمێکی پەیمانگای جیهانیی فیکریی ئیسلامیی بگەڕێنەوە، هەروەها بۆ هەندێك لە کارەکانی نووسەر، وەك: (نظرية الاسلام الاقتصادية: الفلسفة و الوسائل المعاصرة) (١٩٦٠ز) و (النظرية الاسلامية في العلاقات الدولية: اتجاهات جديدة في الفكر و المنهجية الاسلامية) (١٩٧٢ز)، (السياسة و الحكم) کە پێشکەش بە دیداری دووەمی جیهانی کۆنگرەی جیهانی لاوانی ئیسلامی (١٩٧٣ز) کراوە و لە کارەکانی ئەم دیدارەدا بلاّوکراوەتەوە، و (اسلامية العلوم السياسية) کە پێشکەش بە کۆنگرەی یەکەمی جیهانی خوێندنی ئیسلامی لە مەککەی پیرۆز کراوە (١٩٧٧ز) و (اسلامية المعرفة: منهج جديد لإصلاح المعرفة المعاصرة)، کە پێشکەش بە کۆنگرەی دووەمی جیهانیی (اسلامية المعرفة) لە ئیسلام ئاباد –پاکستان– کراوە (١٩٨٢ز)، کە لە کارەکانی ئەو کۆنگرەیەدا بلاّوکراوەتەوە کە پەیمانگای جیهانی فیکری ئیسلامی دەریکردووە، هەروەها کتێبی (اسلامية المعرفة: الخطة و الإنجازات) کە (شەهیدی دکتۆر اسماعيل الفاروقي) دەقە بنەڕەتییەکەی نووسیووە و پەیمانگای جیهانی فیکری ئیسلامی دەریکردووە دوای چەند زیادە و هەموارکردنێك کە بۆ نوسەر بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی بۆی زیاد کردووە، لەپاشاندا کتێبی (ازمة العقل المسلم) (١٩٨٦ز) کە پەیمانگای جیهانی فیکری ئیسلامی چاپی کردووە.

مەنهەجی و پاڵفتەکردنی ڕووناکبیریدا بوو بێت، ئەوا کاری دامەزراوەکە -بە هاوکاریی لەگەڵ پەیمانگادا- کارێکی پەروەردەیی بووە، بەمەبەستی پسپۆڕێتی لە تەوزیفکردنی چاکسازییە ڕۆشنبیرییەکانلە ڕیشەی بونیادی کەسێتی ویژدانی مرۆڤی موسوڵمان، لە قۆناغە جیاوازەکانی منداڵیدا، بەشێوازە پەروەردەییە کاراکان، هەرچۆنێك بێت، هێزی کارەکە لە بواری پەروەردەییدا گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە.

شێوازی زانستییانەی کارا کە خزمەت بە چاکسازی و گۆڕانکاری بکات لەم قۆناغە لە قۆناغەکانی ژیانی ئوممەتدا، خۆی لەو هەوڵە پەروەردەییانەدا دەبینێتەوە کە دیدی دروستی کۆمەڵایەتییانە وەبەردێنێت و ڕوانینەکان و بەها و پرنسیپە دروستەکان دەچێنێت و کار لەسەر هاوسەنگی لایەنە فەردی و جەماعییەکان لە کەسێتی ئیسلامیدا دەکەن و ئازایەتی ئەدەبی تێدا گەشە پێدەدەن و عەقڵیەتی زانستی لە بناغەکەیدا دروستدەکەن و لەگەڵ سەرەتای قۆناغی منداڵیدا گیانی دەستپێشخەری و هەستی ڕەخنەگرانەی ئافرێنەرانە دادەگیرسێنێت و پەیمانی پێدەدات بە بایەخدان بە دەمەزەردکردنەوە و پەروەردەکردن لە قۆناغە جیاوازەکانیدا.

گەر هەنگاوی یەکەم ئیسلامییەتی مەعریفە بوو بێت بە چاککردنی مەنهەجەکانی فیکر و پاڵفتەکردنی ڕۆشنبیری، هەنگاوی دووەمیش بریتی بوو بێت لە کارکردن لەسەر چاککردنی بونیادی خێزان و پەیوەندییەکانی دایك و باوك لەسەر بناغەی ئیسلامی وەك خۆشەویستی و متمانە و ئاسایش و دەستەبەرکردنی ژینگەی پێویستی پەروەردەیی بۆ پەروەردەکردنی منداڵی کەسێتی کامڵ و بەهێزی خاوەن توانای دەستپاك، ئەوا هەنگاوی سێیەم بریتییە لە هۆشیارکردنەوەی پەروەردەیی کە تواناکانی خێزان لە کانگاکانی خۆشەویستی و متمانە و ئاسایشەوە دەگۆڕێت بۆ بەرنامەیەکی پەروەردەیی ئەرێنی کارا، دەستی منداڵ دەگرێت و چاودێری دەکات، توانا و لێهاتووییەکانی پێکهێنەرەکانی عەقڵییەتی زانستی و ویژدانی زیندوو کۆمەڵایەتی گەشە پێدەدات.

هـەنگاوی چـوارەمیش دەسـتەبەرکردنی هۆکـارە زانسـتی و پەروەردەییەکانـە بـۆ مامۆسـتایان، تـا هاریکـارین بێـت لەراپەڕانـدنی ئەرکەکانیانـدا. ئەمـەش لـەرێگای کۆمەکیکردنیان بە هەموو نویێ و بەسوودێك لە بـواری پەروەردەییـداو بەرهـەمهێنانی ئەو ئەدەبیاتەی یاریدەیان دەدات و توانای تێگەیشتنیان قووڵتر دەکات، هەروەها ئەو بەرنامانەشیان بۆ دەستەبەر دەکات کە زانست و زانیاریی گونجاو بۆ هـەرقۆناغێك لـە قۆناغەکانی منداڵی پێشکەش دەکات.

دەبێـت ئـەم چـوار هـەنگاوە پێویسـتە رێـكو هاوسـەنگو گونجـاو بێـت لەگـەڵ گەڕاندنەوەی رەهەندی ونبوو لە نوێکردنەوە و گۆڕانکاری لە مێژووی فیکری ئوممەت و جیهادە ژیارییەکەیدا و ڕەهەنـدی پـەروەردەیی بنـەڕەتیش بـۆ منـداڵ پێکبهێنێـت، وەك پەیڕەوکردن لەسەر مەشقێتی گوتاری پەروەردەیی پێغەمبەر ڕێزدار بۆی.

ئـەوەی کـە پلانــی کـارکردنی پـەیمانگا خوازیاریـەتی بـۆ تـەواوکردنی پـڕۆژە نموونەییەکەی، بریتییە لە کارکردن –لە کاتی گونجاودا– بۆ بونیادنـانی دەزگایـەکی فێرکاریی جیهانی، کە زنجیرەیەك لە قوتابخانـەی ئیسـلامی جیهـانی لەسـەر دروسـت بکرێت، تا تۆوی فەلسەفە و میتۆد و شێوازەکانی ببنە نموونـەی بەگەڕخسـتنی ڕۆڵـی خێزان و قوتابخانە و کۆمەککردنیان بۆ بەجێگەیاندنی ڕۆڵەکانیان.

چونکە ئەو قوتابخانانە ئومێد وانییـە کـە بەرنامـەکانی لەکارکردنیـدا لـە سـنووری منداڵ و چالاکییەکەی لەناو باڵەخانەکەی و کاتژمێرەکانی دەوامی قوتابخانەدا بەتەنیا بوەستێت، بەڵکو شوێنەوار و بایەخپێـدان و چـاودێرییەکەی بگاتـە خێـزان و چـەمکە پەروەردەییەکانیشی. پەیمانگا پلانە پەروەردەیی و بەرنامە فێرکارییەکانی و چالاکی قوتابخانەکانی، لە بوارە دەروونی و ڕوونـاکبیری و زانسـتی و جەسـتەییەکاندا لەسـەر بناغـەی دیـدێکی گەردوونییانـەی دروسـتی قورئـانییو سەرمەشـقێتی پێغەمبـەر و رۆشنبیری دروستی پاڵفتەی ئیسلامی و بایەخدان بە بونیـادی دەروونـی و ناخـەکی و مـەعریفی ، لـە تـەواوکاری و هەماهەنگیـدا بونیـاد دەنێـت، کـە تـەوزیفی بوارەکـان و قۆناغەکان هەمووی بکات بۆ بەجێگەیاندنی ئەرکی پێویستی پەروەردەیی.

**قوتابخانە ئیسلامییە جیهانییەکان:**

پەیمانگای جیهانی فیکری ئیسلامی لەمیانی ئەزموونی زانکۆی ئیسلامی جیهانی لە مالیزیا، دەستی بەم گەشتە کردووە. زانکۆکە سەنتەرێکی بۆ توێژینەوەکانی بەرنامەکانی پەروەردە و فێرکردنی گشتی بونیادناوە و کاری لەسەر بونیادنانی قوتابخانەیەکی نموونەیی سەر بە زانکۆکە کردووە. هەروەها سەنتەرەکە، لەڕێگای ژمارەیەك لە مامۆستایانی پسپۆڕی پەروەردەوە و لەژێر ڕۆشنایی ئەو پلانەی دیاریکراوە و بە سەرپەرشتی ڕاستەوخۆی کارگێڕی زانکۆکەو بە هاوکاری لەگەڵ چەند لیژنەیەکی پسپۆڕ، لە مامۆستایانی زانکۆ لەسەرجەم بوارە ئەکادیمییەکاندا، سەنتەرەکە هەستاوە بە دانانی چەند ڕەشنووسێکی سەرەتایی بۆ بەرنامەگەلێکی پەروەردەیی بۆ قۆناغە جیاوازەکانی خوێندنی گشتی. بونیادنانی قوتابخانەیەکی سەر بە زانکۆکە بە فیعلی بەئەنجام گەیشت کە قۆناغە جیاوازەکانی فێرکردنی گشتی لەخۆدەگرێت، ئەو بەرنامانەش تێدا پیادەکرا کە ئومێد دەکرێت لەسەر ئەو شێواز و ئامانجانە بەردەوام بێت کە لەپێناویاندا دامەزراوە و سەنتەری توێژینەوە پەروەردەییەکان بەردەوام بێت لە پەرەپێدانی ئەو بەرنامانە و سەرکەوتوو بێت لە نووسینی کتێبی کاملی مەنهەجی لەسەر بناغەی ئەو بەرنامە پەروەردەییە پەرەپێدراوانە.

مەبەست لە دابڕینی سەنتەری توێژینەوەکانی بەرنامە و پلانە پەروەردەییەکانی زانکۆ لە ئیدارەی قوتابخانەکە، پارێزگاریکردنی سەنتەرەکەیە لەوەی لایەنە کارگێڕی و کاروبارە ڕۆژانەییەکان بەسەر لایەنە توێژینەوەییە پەروەردەییە زانستییەکاندا زاڵ نەبن، لەگەڵ سووربوون لەسەر بونیادنانی پەیوەندی هاوکاریی زانستی و پەروەردەیی لەنێوانیاندا، لەمیانی ئیدارەی باڵای هەردوو دەزگاکەوە، ئەمەش ئەوەیە کە ئومێد دەخوازرێت لە ئایندەدا لەنێوان (پەیمانگاکە) و زنجیرەی (قوتابخانە ئیسلامییەکان)، یان (زنجیرەی قوتابخانەکانی سەرکەوتنی ژیاریی)، یان (پەروەردەیی)یەوە پڕاکتیك بکرێت. هەروەها (پەیمانگای جیهانی فیکری ئیسلامی) بە هاوکاری لەگەڵ سەرجەم لایەنە بەرپرسەکانی جیهانی ئیسلامی –پشتیوان بە خوا– بەردەوام دەبێت لە

کــارکردن و توێژینــەوەی زانســتی، لــەپێناو گەشــەپێدانی هەوڵــە پەروەردەییــە پێشــەنگەکان و پەرەپێـدانیان و پێشخسـتنی کتێبــە مەنهەجییــە پێویسـتییەکان و کارکردن لەسەر بونیادنانی زنجیرەیەك لـە قوتابخانـەی ئیسـلامی جیهـانی و دەزگـای پێویسـتی پــەروەردەیی بـۆ سەرپەرشـتی کردنـی گشـتی لەسـەریان و دانـانی پلانـی ڕێکخستنی پێویست بۆ سەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی بەویستی خوای گەورە.

با تەواوکردنی پـڕۆژەی ئیسـلامبوونی مەعریفـە و چاکسـازیکردن لـە بەرنامـەکانی فیکری ئیسـلامی لـە خزمـەتکردنی پـڕۆژەی چاکسـازیی ئیسـلامی ژیارییـدا تەوامەنـد ببێت، گرنگە کە پەیمانگای جیهانی فیکری ئیسلامی و دەزگای قوتابخانە ئیسـلامییە جیهانییــەکان لــەژێر ســایەی یــەکێتی گشــتی دامــەزراوەکانی فیکــری شارســتانی ئیســلامییدا کاربکــەنو هاوکــار بــن لەگــەڵ ئــەو مەڵبەنــدە فیکرییــە شارســتانییە جیاوازەکاندا کە بۆ هەمان ئامانج کار دەکەن.

هەروەها ئەوە گرنگە بۆ پڕۆژە مەزنەکەی ئیسلامبوونی مەعریفە –لەڕێی ئەوانـەی تێـڕوانین و بەرنامـەکانی لـە هـەر شـوێنێکی جیهانـدا پـەیڕەو دەکـەن– کـە هەوڵـە زانسـتییەکانی بـۆ قۆنـاغی دووەم لەقۆناغــەکانی پەرەپێـدانی فیکـری شارسـتانی درێژبێتەوە، بەوەی تەوزیفیی چاکسازییە فیکرییە فەرهەنگییـە مەنهەجییەکـە بکـەن بەشێوەیەکی کارا، ئەوەش لە لێکۆڵینەوە و کتێبی مەنهەجیدا گەلاڵە ببێت و لەڕێگای وەرزنامەی زانستی لە بواری لێکۆڵینەوەی کۆمەلایەتی و مرۆیی و ئابوری و ستراتیژیدا لــە ڕوانگــەی ئیســلامەوە بخرێتــە ڕوو، هــەروەك پێویســتە کــە چــالاکی دامــەزراوە زانسـتیەکانی بەشـێوەیەکی تایبـەت بـواری فەلسـەفەی زانسـتەکان و چـاودێریکردنی چـالاکی زانسـتی و تەکنـەلۆجی و ئاڕاسـتە شارسـتانیەکان و پێشکەشـکردنی دیـدی ئیســلامیی تێیانــدا بگرێتــەوە، هــەروەها پێویســتە توێــژەران لێکۆڵینــەوە لەســەر بابەتەکانی مافەکانی مرۆڤی موسوڵمان بکەنو گرنگی پێبدەن، لێکۆڵینەوە و زانیاری دروستیش لەبارەیانەوە بخەنە ڕوو، بەوپەڕی ڕاستگۆی و ئەمانەتەوە بیخەنە بـەردەم ئوممەت و سەرکردەکان و هۆکارەکانی ڕاگەیاندن.

**پێویستی ڕاگەیاندنی پرنسیپی مەنهەجی و فیکری:**

بۆ قۆناغەی کە فیکری ئیسلامی پێی گەیشتووە، بۆ ئەو دۆخەی حاڵی گەلانی ئیسلام و دامەزراوە کۆمەلآیەتی و فێرکارییەکانی لەسەریەتی، من پێموایە کاتی ئەوە هاتووە کە دەستەبژێرێك لە بیریار و زانا و ڕووناکبیران لە کۆنگرەیەکی ڕێکخراودا کۆببنەوەو بنەما گشتیەکان کەبوارە بنەڕتیەکانی ژیانی ئوممەن بگرێتەوەوبناغەکانی تێدا بچەسپێنێتو ئامانجەکان لەبەردەمیدا ئاسان بکاتو هەکیو بنەماو جێگرەکانو ئەلەویاتو تەحەداکان بەئوممەت رابگەیەنن، ئەو بەیاننامەیە وەك ڕێبەری کارکردنە کە ڕێسا مەنهەجییەکان دادەنێت و چوارچێوە دیاری دەکات و بەوپەڕی قەناعەتەوە ڕێگاکانی گۆڕانکاری و جووڵە و چاکسازیی لە بواری مەعریفە و کەلتوور و رۆشنبیری و فێرکردن ڕۆشن دەکاتەوەو ڕێگا دەگرێت لەبەردەم بەدحاڵیبوون و گومڕایی و سەرلێشێواندندا.

لەراستیدا بەردەوامی نائامادەیی ئەمجۆرە ڕێبەرە لەکاروانی دواکەوتن و بێبەرنامەیی و گومڕاییەی کە ئوممەت گیرۆدەیانە و فیکر و ڕێبەری جووڵەی –تا ئەمرۆ– گیرۆدەیە بەدەستیانەوە، هەڵەیەکی گەورە و کەموکورتییەکە کەجێی لێبووردن نییە.

لەخوای گەورە دواکارین کەعاقڵمەندانی ئوممەتو دانایانی بەهرەدار بکات لەخێراکردن بەرەو پڕکردنەوەی کەلێنو ڕێنوێنی کاروانەکە بۆ خزمەتکردنی ئوومەتو خزمەتکردنی مرۆڤو بەجێگەیاندنو گەیاندنی پەیامەکە، هەر (الله) یە کەتوانای هەیە بەسەر هەموو شتێکدا.

# کۆتایی

تا بزانین و کاربکەین:

جێگای خۆیەتی –لەئاکامدا– پوختەی دیدی ڕیشەیی کتێبەکە بخەینە ڕوو، لەگەڵ ئەو هێڵە گشتییانەی کە ئامانجی دانانیان بووە لەبەردەم خوێنەراندا و لە جەوهەری خۆیاندا وێناکردنی قەیرانی موسوڵمانان بەرجەستە دەکەن، هەروەها ئەو فاکتەرە بنەڕەتییانەش دیاری دەکات کە کاریگەرن تێیدا و ڕەگەزە ونەکانی پرۆژەکانی چاکسازیی ویستراوی ئیسلامیش بخرێتە روو.

ئوممەتی ئیسلامی هەڵگری پەیامی هیدایەت و نوورە بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی، لە ڕابردووی خۆیدا هەستاوە بە ڕاستکردنەوەی ڕەوتی ژیاری و مرۆی و بەرزکردنەوەی بۆ ئاسۆی بالاتر لە ئەخلاقییەت و زانستیبوون و جیهانیبوون و ئەو سەرچاوانەی پێداون کە لە پشت هەموو دەستکەوتێکی ژیاریی مرۆیی هاوچەرخدا دەوەستن.

سەرەڕای ئەو وزە ئیمانییە ژیارییە بالایە مەزنەی ئیسلام تەقاندوویەتییەوە، خلتەی نەریت و کەلتوور و فەلسەفەکان و گۆڕانی ڕێسای سیاسی بۆ خێڵەکیبوون و شعووبییەت، کاریان کردۆتە سەر شێواندنی جیهاندنی جیهانبینی ئیسلامی و وێرانکردنی مەنهەجیەتی فیکر و مەعریفەی ئیسلامی و خەوشدار کردنی ڕۆشنبیری ئیسلامی، بەجۆرێك کەئوممەت ڕەهەندە گشتییەکەی ونکردووە و وایکردووە عەقڵیەتی جادوبازی و خورافە و ڕەگەزپەرستیی زاڵ ببن بەسەریدا.

ئەو لێڵییە عەقیدەی و فیکری شێواندنە فەرهەنگییە گەیشتووە بە دۆگمایی و دواکەوتن و لاوازیی و دەستەوەستانیی کردووە بەمیرات بۆ سەرکردەکانی ئوممەت، ئەوەش دواکەوتن و تیرۆی سیاسی و ئایینی لێ بەرهەم هاتووە، [1] هەروەها (سایکۆلۆژیای کۆیلەیەتی)ی کردۆتە بۆماوە بۆ موسوڵمانان، کە بە تاکگەرایی و ترس و نەبوونی دەستپێشکەری جیادەکرێتەوە. ئوممەتیشی کردووە بە جەستەیەکی خاووخلیچك و خاڵیی لەگیانی یەکبوون و دەستبازبۆیەکگرتن و گیانی ئازایەتی و وزەکانی توانا و داهێنان و دەستپێخەری، ئوممەت بۆتە نێچیری هەموو دوژمن و چاوچنۆکێك.

هەوڵەکانی چاکسازی –سەرەڕای دڵسۆزی و قوربانییەکانیان– بەشێوەیەکی بەشەکی سیاسییانە هاتن، گەرچی هەمیشە لەهەوڵی بەرزکردنەوەی هیممەت و بەرهەڵستی دوژمنکاری و دوورخستنەوەیان لەئوممەت بوو، بەڵام ئەم هەوڵانە خاوەنی هۆشیارییەکی تەواو نەبوون بە حەقیقەتی نەخۆشییە مەعریفییە رۆشنبیری و دەروونی و ویژدانییەکانی ئوممەت.

سروشتی گوتاری سیاسیش بە چەشنێکە کە کار لەسەر یەکخستنی ڕیزەکان و زیندووکردنەوەی هیواکان دەکات، بەڵام بوار بە گوتاری فیکری ڕەخنەگرانە نادات، ئوممەتیش لەو کاتەدا توانای نوێکردنەوەی وزەی بەرەنگاریکردنی تەحەدداکان و گەشەپێدانیانی نابێت و چارەنووسی خۆی و چارەنووسی هەوڵەکانی و بزووتنەوە چاکسازیخوازەکانیشی بەرەو لاوازیی زیاتر دەچێت.

تێنەگەیشتن لە ئیشکالیەتی مەعریفی، لەوێشەوە درکنەکردن بە پەیوەندی لایەنی مەعریفیی بە دەروونی ویژدانییەوە، دوو هۆکارن لە هۆکارەکانی دووکەرتبوونی مەعریفەی ئیسلامیی بۆ مەعریفەیەکی ئایینی و ئەوی دیکەی مەدەنیی، ڕووبەڕووی یەکتر و دژ و ناکۆك، کارەکەی گەیاندە نووسینی (تهافت الفلاسفة)، مردنی (علوم

---

[1]. أبو سليمان، عبدالحميد: (اشكالية الاستبداد و الفساد في التأريخ السياسي الاسلامي)، مجلة المسلم المعاصر، ژمارە ٢٢، سنة ٣١، ٢٠٠٦ز.

الدین)، واتە دۆگمابوونی و هەمەکییانەی بەهایی و لاوازی ڕۆڵیو نەزۆکیی (سننی) مرۆیی و دۆگمابوونی و دۆگمابوونی ئەوەی بەدوایدا دێت لە زانست و مەعریفە مرۆییەکان. ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی بایەخی چەندێتییانە بە زانیارییە نەزۆکەکان بدەین و درك بە پەیوەندییەکانیان بەلایەنی عەمەلی و ویژدانیی و شوێنەوارە دەروونییەکانیانەوە نەکەین، لەبەر ئەوە زانستە مرۆییەکانمان فەرامۆشکرد و منداڵێتیی و پەروەردەمان خستنەلاوە کە بواری گۆڕانکاری و کایەی گەشەپێدانی وزەو وەبەرهێنانی تواناکان و دەوڵەمەندکردنی ئوممەتن بە کانگای سوتەمەنی وزەی نەوعیی گەشەکردووی پێویست بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی گۆڕانکارییەکان و بەرهەڵستیکردنی ڕووبەڕووبوونەوەی تەحەدداکان.

بۆ ئەوەی ڕەوڕەوەی ڕێنیسانس و پێشکەوتن بخەینە جووڵە و بونیادی وزەی دەروونی و ویژدانیی بزوێنەر بۆ ئیرادەی مرۆیی بگەڕێنەوە و بۆ بونیادنانی توانا مرۆییەکان و مەعریفەی زانستی و هەوڵە خودییە پێویستەکانی هەستانەوەی ئوممەت، پێویستە بیریاران و زانایان و مامۆستایانی زانکۆ و ڕووناکبیران و سەرکردەکانی ئوممەت بە ڕۆڵی خۆیان هەڵبستن، لە چاکسازی بنەماکانی کەموکووڕیی و ئامادەکردنی کەرەستەی مەعریفی و نەفسی بۆ بەهێزکردنی ڕۆڵەکانی ئوممەت، لەپێناو بەئامانجگەیاندنی پرۆژەی ئاوەدانکردنەوە و چاکسازیی شارستانی ئیسلامی.

پێویستە دیدی ئیسلامی یەکتاپەرستی جێنشینگەرانەی ئاوەدانکاری شارستانی چاکەویست بگەڕێنینەوە. دەبێت چاکسازیی لە بەرنامەی مەعریفەدا بکرێت و هەردوو باڵە بەهاییە ئایینییەکە و (سننی)یە مرۆییەکە بدرێتە پاڵ یەکتر و فەرهەنگی مرۆیی ئیسلامیی پاکبکرێتەوە لە هەموو ئەوەی تووشی بووە، لە نەزۆکیی و پیسبوون.

دوای ئەوە ڕۆڵی کارلێکی مەعریفی و دەروونی و ویژدانی پەروەردەیی لە پێکهێنانی مرۆڤی موسوڵماندا دێت، تا بەردەوام بڕوادار و چاکەکارێکی داهێنەری بەتوانا بێت لەسەر دەستەبەرکردنی وزە و کارامەیی پێویست بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەڵنگارییەکان.

فیکرو بیریار و ڕووناکبیرەکان سەرچاوەی مەعریفین بۆ چاکسازی، پەروەردە و پەروەردەکارانیش سەرچاوەی چاکسازیی دەروونی و ویژدانین، بەوەش مامۆستایانی زانکۆ و خوێندنی باڵا دەبنە هۆکاری گرنگ لە پرۆسەی چاکسازیی فیکرییدا و پەروەردە و فێرکردنی گشتی دەبنە ئامرازیی پشتیوانی خێزان لە بواری چاکسازیی دەروونی و ویژدانییدا.

دەزگاکان بە شێوە جیاوازەکانیەوە بە جددی کار لەپێناوی پارێزگاریکردن لەو دۆخەی کەهەیە و هێشتنەوە و بەردەوامیپێدانی و سووربوون لەسەر ئەوەی کە هەر گۆڕانکارییەك لە چوارچێوەی ئەو بارودۆخەدا دەبێت کەهەیە، لەبەر ئەوە پێویستە خوێندکارانی چاکسازی و گۆڕانکاری ئاشنای کلیلی خستنەگەڕی جوولەی پرۆسەی گۆڕانکاری ببن. بەبێ ئاشنابوونی ئەم کلیلەش و زانینی سروشتی پرۆسەی گۆڕانکاریی و پێویستیەکانی جووڵاندنی، ناکرێت گۆڕانکاری پێویست ڕووبدات و چاکسازیخوازان وەك ئەو کەسانەیان لێ دێت کەهەوڵدەدەن ڕەوڕەوەی گالیسکەی گۆڕانکارییان بەدەستی خۆیان بجولێنن.

کلیلی خستنەگەڕی گۆڕانکاریی ئاشتیخوازانە لەکۆمەڵگادا بەرەو باشتر، بەشێوەیەکی خۆوەکییانە لە پاڵنەری خۆڕسکی ناخی باوکاندا پەنهانە و لە سووربوونیشیاندا لەسەر ئەوەی بەرژەوەندی ڕۆڵەکانیانی تێدایە، ئەوەش پاڵنەرێکە خودا خستویەتییە دڵەکانەوە، خاوەنی گەورەترین توانا و کاریگەرییە لە دروستبوونی عەقڵیەتی تاك و سایکۆلۆژیای لە قۆناغی منداڵیدا. لێرەوە هاوکاری بیریار و پەروەرشیاران، لە ئەنجامدانی ڕۆڵی خۆیان بۆ تێگەیشتن لە باوکایەتی و منداڵێتی و هەستان بە توێژینەوە زانستییە پەروەردەییەکان لەمیانی سۆنگەو کێشەکانی فیکر و ڕۆشنبیری ئیسلامییەوە، کارێکی پێویستە بۆ بەئەنجامگەیاندنی ڕۆڵی خۆیان لە پێشکەشکردنی ئەدەبیاتی زانستی کاریگەر بۆ باوکانی موسوڵمان و گەیاندنیان بە هۆشیاریی و دەستکەوتنی ئەوەی خوازراوە لێیان. لەبەر ئەوە زانکۆی ئیسلامی جیهانی لە مالیزیا، لە ڕوانگەی ئیسلامیبوونی مەعریفەوە، سێ پرۆگرامی

خوێنــدنی بــۆ قوتابیــانی گەشــە پێــداوە و، بڕیــاری (دبلــۆم)ی خوێنــدنی داوە بــۆ دەرچـوواندنی مامۆسـتایانی پێویسـت بـۆی، ئـەم بابەتانـەش کـە مەبەسـتیانە ببێتـە بابـەتی خـوازراوی زانکـۆیی بـۆ سـەرجەم قوتابییـەکانی، ئـەویش: بابـەتی (خێـزان و باوکایــەتی)، بابــەتی (فیکــری داهێنەرانــە و چارەســەری کێشــەکان) و بابــەتی (درووستبوونی ژیارەکان و داڕمانیان).

ڕۆڵی مەعریفییانەی قوتابخانە و مامۆستا وەك پاشکۆ و تەواوکەری ڕۆڵی ویژدانیی پەروەردەیی باوکان و دایکان دێـن، گـەر هۆشـیاریی ڕەخساوبێت ڕۆڵـی مامۆسـتایان لەگەڵ ڕۆڵی باوکاندا تەواوکار دەبێت، لەبەر ئەوەی مامۆستا –وەك هەمیشە– حەزی لـە چـاودێری قوتابییـە، بـۆ ئـەوەی بیکاتـە کەسـێك توانـای هێنانـەدی سـەرکەوتنی لەژیانیدا هەبێت و وزەکانی لە ڕووبەڕووبوونەوەی تەحەدداکان و زاڵبـوون بەسـەریاندا بخاتە گەڕ.

بـەم شـێوەیە لەکۆتاییـدا بۆمـان ئاشـکرا دەبێـت کـە لـە گـرنگترین هۆکارەکـانی کەموکووڕیی بزاڤە چاکسازییەکان لە مێژووی ئوممەتـدا لـە هێنانـەدی ئامانجـەکانیان بریتییە لە درکنەکردنی بایەخی لایەنی ویژدانیی لە چاکسازیی ئەو کێشە دەروونییەی تووشی ئوممەت بووە و درکنەکردنی بایەخی ڕۆڵی منداڵی لە دروستکردنی چاکسـازی دەروونی و ویژدانی و دەربازکردنی ئوممەت لە قەیرانی (سـایکۆلۆژیای کۆیلەیـەتی) و گواسـتنەوەی بـۆ ڕۆڵـی توانـا و داهێنـان و دەستپێشـخەری، وەك موسـای ڕابـەرمان (سەلامی خوای لەسەربێت) بەرامبەر بەنی ئیسرائیل لە (سینا)دا کردی.

هــەروەها لەکۆتاییــدا بەرپرســیارێتی بیریــاران و پەروەرشــیاران و ڕوونــاکبیران و مامۆســتایانمان لــە دەســتگرتن بــە جڵــەوی دەستپێشــخەری و جووڵانــدنی کلیلــی خستنەگەڕی گۆڕانکاری ئاشتیخوازانە و چاکسازی ڕیشەییمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە هەمان ئەو ڕۆڵەیە کـە شـۆفێری ئۆتۆمبێـل پێـی هەڵدەسـتێت لـە بزوانـدنی پڕۆسـەی جووڵانی ئۆتۆمبێلەکە و دەرچوونی بەرەو ئامانجەکەی، ئەوەش لێـرەدا خسـتنەگەڕی ڕەگـەزی منــداڵێتیی ون و پێویسـتە بـۆ کـاراکردنی ویـژدانی ئوممـەت و تـەواوکردنی

ئامرازەکانی چاکسازی و دەربازکردنی و گەشەپێدان بە وزە و تواناکانی لەوەی کە بەرژەوەندی ڕۆڵەکانی تێیدایە، پێویستە ئەو گوتارە زانستی قەناعەتپێکەر بێت و سەنتەری توێژینەوەی زانستی بۆ بونیادبنرێت، لەپێناو پێشکەشکردنی ئەدەبیات و بەرنامەی پەروەردەیی زانستی لە هەوڵێکی زانستییانەی زیندوودا، گوتارێکی کارا کە لە بونیادنان و خستنە روویدا دڵسۆزان بەگشتی لە ڕووناکبیران و بەتواناکان و لە پیاوانی بزاڤەکانی چاکسازی و سەرکردەکانی کۆمەڵگا و دەزگا مەدەنییەکانی کۆمەڵگا هاریکار بن، ئەوە تاکە ڕێگەیە کە موسوڵمان بتوانێت جڵەوی دەستپێشخەریی بونیادنان و دەربازکردن تێیدا بگرێتەدەست، تەنیا لەو کاتەدا دەزگا فەرمییەکان بەدەم چالاکییەکانی و ئاڕاستەکردنی جووڵەکەیەوە دێن و لەو کاتەشدا — وەك پێویست— دەبێتە پشتیوانێك بۆی لە هێنانەدی ئامانجەکەیدا "ئێوە هەرچۆنێك بن بەوشێوەیە فەرمانڕەوایی دەکرێن" ((فکما تکونون یولی علیکم)).

پێویستە باوکان درك بەوە بکەن کە ئەوان —لەم قۆناغەدا— کلیل و بناغەن بۆ دەربازکردنی ئوممەت و بونیادنانی وزەکانی و ئایندەی نەوەکانی و بەبێ هەوڵدانیان لە ئاڕاستەی دروستدا هیچ ڕێگایەك بۆ توانا و سەربەرزی و ڕزگاری بوون نابێت.

دوا وشەم بۆ بیریاران و ڕووناکبیران و چاکسازایخوازان سەبارەت بە جۆری هەوڵ و ڕۆڵیان، بریتیە لەوەی کە گرنگە بۆ سەرکەوتنی هەوڵەکانیان کارکردنی جددی لە بەجێهێنانی ڕۆڵی پێشەنگی خۆیان لە بزواندنی کلیلی خستنەگەڕی جووڵەی گۆڕانکاریی لەئوممەتدا، ئەمەش بە خستنەڕووی دیدی شارستانی ئیسلامی و پاڵفتەکردنی رۆشنبیری ئوممەت و بەرچاوڕوونی لەبارەی نەخۆشییە ویژدانییەکانی و ڕێگاکانی چارەسەر و زاڵبوون بەسەریاندا.

ژیانی پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێت) باشترین نموونەیە بۆ بەرهەمی بەردەوامی و خۆڕاگری، خۆی و هاوەڵەکانی لە مەککەدا بۆ سیانزە ساڵ لە کارکردن و خۆڕاگری و بەردەوامیداندا خۆیان گرت، لەپێناو بونیادنانی ڕێساکان و دامەزراندنی بنەماکان و ئامادەکردنی (کادرەکان)، تا دوای ئەوە وزەی چاکسازی لە دە ساڵدا

بکەوێتەگەڕ بۆ گۆڕینی ڕووخساری دونیا و مێژوو و بۆ ئەوەی هەموو خڵتەیەك ڕابماڵێت و سەرجەم ئاستەنگەکان لابدات لەبەردەم ئوممەت و ژیار و بەرەبەیانێکی نوێدا، ئەمەشە نەریتی هەموو بزاڤێکی گۆڕانکاری گەورەیە لەمێژوودا.

بەبێ پشتبەستن بە خود و دەستەبەرداربوون لە هەموو خەونەکانی (ئەوی دیکەی ڕزگارکەر) و چارەسەری ئاسانی بەپەلە، چەندین دەیەو سەدە بەسەر ئوممەتدا گوزەر دەکات تا شارەزای وەهمی ئەوی دیکە بین و تێکی دەشکێنین، تا شارەزای لانەدان لە ڕێگای دەستەوەستانی و سەرکزی و زەلیلی و ڕیسواییمان دەبین. بۆشمان نییە لە ئایندەدا چاوەڕێ هیچ بکەین –وەك چۆن لە ڕابردووشدا وابووە– جگە لە قەیران و کارەساتی زیاتر، کە لە هەموو ڕۆژەکانمان و لە هەموو نەوەیەکدا ڕوودەدات، هەموو ئەوە بەهەدەر دەدەن کە بە قەوارەی ئوممەتدا دەگەڕێت، لە وزە و توانای کەم و بێهێز کە ئێمە زۆر پێویستمان پێیەتی، تا چاکسازی لە خودی خۆماندا بکەین و وزەکانمانی پێ گەشە پێبکەین، مەگەر خودا ویستی ئەوەی هەبێت و بێدار ببینەوەو بیریاران و ڕووناکبیران و چاکسازان ڕابن تا ڕۆڵی خۆیان ئەدا بکەن و بزاڤی چاکسازی سەر ڕێ بخەن لە چاکسازیی خوددا لە ڕووی مەعریفی و ویژدانی و دامەزراندنی بناغە بۆ بونیادنانی نەوەگەلێکی بەهرەمەند بە عەقڵ و ویژدانێکی ئازادی ڕاستی دروست، خوا ڕاستی فەمووە: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ﴾ [الرعد:١١]. هەروەها کاتێك دەفەرموێت: ﴿وَالْعَصْرِ (١) إِنَّ الْإِنْسَانَ لَفِي خُسْرٍ (٢) إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ (٣)﴾ [العصر:١–٣].

لە خوای پاك و باڵادەست دەخوازین هاوکاریمان بکات و ڕێگەی ڕاست و سەرکەوتنمان پێ ببەخشێت.

(و أخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين).

***

# سەرچاوەكان

## المراجع العربية:

- البخاري، محمد بن إسماعيل. **صحيح البخاري**، تحقيق: مصطفى ديب البغا، بيروت: دار ابن كثير، ١٤٠٧ هـ/ ١٩٨٧م.

- البزاز، سعيد بن منصور. **سنن سعيد بن منصور**، تحقيق: حبيب الرحمن الأعظمي، بيروت: دار الكتب العلمية، ط. ١، ١٩٨٥م.

- أبو حيّان، محمد بن يوسف. **البحر المحيط**، بيروت: دار الفكر، ١٩٩٢م.

- الترمذي، محمد بن عيسى. **الجامع الصحيح «سنن الترمذي»**، تحقيق: أحمد محمد شاكر، بيروت: دار إحياء التراث العربي، (د. ت.).

- الدارمي، عبد الله بن عبد الرحمن. **سنن الدارمي**، تحقيق: فواز زمرلي وخالد السبع، بيروت: دار الكتاب العربي، ط ١٠، ١٤٠٧ هـ.

- السجستاني، سليمان بن الأشعث. **سنن أبي داود**، تحقيق: محمد محيي الدين عبد الحميد، بيروت: دار الفكر، (د. ت.)

- أبو سليمان، عبد الحميد أحمد. **أزمة العقل المسلم**، هرندن والرياض: المعهد العالمي للفكر الإسلامي والدار العالمية للكتاب الإسلامي، ١٩٩٤م.

- أبو سليمان، عبد الحميد أحمد. "إشكالية الاستبداد والفساد في الفكر والتاريخ السياسي الإسلامي"، **مجلة المسلم المعاصر**، العدد ٢٢، السنة ٣١، ٢٠٠٦م.

- أبو سليمان، عبد الحميد أحمد. **الإصلاح الإسلامي المعاصر**، القاهرة: دار السلام، ١٤٢٧هـ/ ٢٠٠٦م.

- أبو سليمان، عبد الحميد أحمد. "الأمن والسلام الاجتماعي هدف نظام العقوبات الإسلامي: تأملات في نتائج دراسة اجتماعية لسكن الطلاب الجامعيين"، **مجلة إسلامية المعرفة**، العدد ١٤، خريف ١٩٩٨م.
- أبو سليمان، عبد الحميد أحمد. "الأمة بين شريعتين"، **مجلة إسلامية المعرفة**، العدد ٢٨، ٢٠٠٢م.
- أبو سليمان، عبد الحميد أحمد. **دليل مكتبة الأسرة المسلمة**، هرندن والقاهرة: المعهد العالمي للفكر الإسلامي ودار السلام، ط٣، ٢٠٠٨م.
- أبو سليمان، عبد الحميد أحمد. **العنف وإدارة الصراع السياسي في الفكر السياسي الإسلامي بين المبدأ والخيار: رؤية إسلامية**. دمشق وهرندن: دار الفكر والمعهد العالمي للفكر الإسلامي، ٢٠٠٢م.
- أبو سليمان، عبد الحميد أحمد. **نظرية الإسلام الاقتصادية: الفلسفة والوسائل المعاصرة**، القاهرة: مكتبة الخانجي، ١٩٦٠م.
- أبو سليمان، عبد الحميد أحمد. **النظرية الإسلامية للعلاقات الدولية: اتجاهات جديدة للفكر والمنهجية الإسلامية**. ترجمة: ناصر أحمد المرشد البريك، الرياض: مطابع الفرزدق التجارية، (د. ت.).
- الشيباني، أحمد بن حنبل. **مسند الإمام أحمد بن حنبل**، تحقيق: شعيب الأرناؤوط، بيروت: مؤسسة الرسالة، ط٢٠، ١٤٢٠هـ/ ١٩٩٩م.
- الصالح، صبحي. **منهل الواردين شرح رياض الصالحين**، إستانبول: (د. ن.)، (د. ت.)، ص٩١٣.
- القزويني، محمد بن يزيد. **سنن ابن ماجة**، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي، بيروت: دار الفكر، (د. ت.).

- القشيري، مسلم بن الحجاج. **صحيح مسلم**، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي، بيروت: دار إحياء التراث العربي، (د. ت).

- مخلوف، حسنين. **صفوة البيان لمعاني القرآن**، الكويت: وزارة الأوقاف والشؤون الإسلامية الكويتية، ط٣، ١٤٠٧هـ/ ١٩٨٦م.

- النسائي، أحمد بن شعيب. **المجتبى من السنن**، تحقيق: عبد الفتاح أبو غدة، حلب: مكتب المطبوعات الإسلامية، ١٤٠٦هـ/ ١٩٨٦م.

## المراجع الأجنبية:

- Habibul, Sayed. "Al-Iqta: A Historical Survey of Land Tenure and Land Revenue Administration in Some Muslims Countries, with Special Reference to Persia", in *the Contemporary Aspects of Economic and Social Thinking in Islam*. Plainfield, ind.: the Muslim Students Association of USA and Canada, 1970.

- Abu Sulayman, AbdulHamid Ahmad. "The Theory of the Economics of Islam," *Journal of* Economics *and Management*, 6, no. 1 & 2, Kuala Lumpur: International Islamic University, 1998.